# هەڵبژاردن و دەنگدان

## لە دیدگای قورئان و فەرموودە

ئامادەکردنی

مامۆستا ئیسماعیل سوسەیی



# ناوەڕۆک

## پێشەکی:

ئاینی ئیسلام ئاینێکی گشتگیر و هەمەلایەنە بۆ هەموو کەس و بابەتەکان، کە مرۆڤەکان پێویستیانە بۆ دوارۆژ و ژیانی دونیا یان، بەوپەڕی تەواوی هەموو کار و شتەکانی باسکردووە و چارەسەرەکانی داناوە بۆ گرفتەکان و یەکێکە لە ناز و نیعمەتە مەزنەکانی الله تعالی ی خاوەن بەزەیی فراوان و گەیەنەر بۆ بەزەیەکەی، کە ئەو ڕێبازەی بۆ کۆتا پێغەمبەران محمد المصطفى (ﷺ) هێناوە و ناردوە کە دەفەرمووێ: ﴿**الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا**﴾ **(المائدة : ٣)** واتە: ئەمڕۆ ئاینەکەتانم بۆتان تەواو کرد و ناز و نیعمەتەکەم بە سەرتانەوە تەواو کرد ڕازیبوم کە ئیسلام ئاینبێت بۆتان.

لە پاشان الله تعالی تەنها و تەنها بەو ڕێبازە ڕازییە و ڕازیبووە، وە ڕازی نییە پەیڕەوی بکرێت لە هیچ ڕێباز و بەرنامەیەکی تر بۆ ژیان مرۆڤەکان لەسەری برۆن و موسڵمانان پێوەی پابەندبن کە دەفەرمووێ: ﴿**وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ**﴾ **(ال عمران : ٨٥)** واتە: ئەوەی جگە لە ئیسلام بە ئاین و ڕێباز بگرێت لێی وەرناگیرێت و ئەو لە دوارۆژدا لە زەرەر بارانە.

بەڕێزان و خۆشەویستان ماوەیەکی زۆر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) تاوەکو ڕووخاندنی دەســەڵاتی ئیســلامی لەلایەن دوژمنانی الله و پەیڕەوی لێکراوانیان موســڵمانان پەیڕەوی تەواویان کرد لە قورئان و لە فەرمووده و لە ڕێبازەکەی پێغەمبەری پێشـــەوا (ﷺ)، وە بە عیزەتەوە لە ژێر سێبەر و پەرچەمی (لا إله إلا الله محمد رسول الله) ژیانیان بەسەربرد، کە بووە مایەی حەســانەوەیان لە دونیا و، لە دواڕۆژ یشــدا پاداشــت پێیووە بە دەســت بێنن ئەوەی لەسەری مردبێ، نەک هەر تەنها موسڵمانان لە ژیانی دونیا پێیووە حەسانەوە بەڵکو کافر و بێبڕوا یانیش ئەوانەی ئەهلی زیمە بوون لە چوار چێوەی وڵاتی موســڵمانان‌دا کە ژیانیان بەسەر دەبرد، خۆشییان بینی و حەسانەوە و مافیان پارێزراو بوو.

لە دوای نەمانی دەسەڵاتی موسڵمانان و ڕووخاندنی خەلافەتی ئیسلامی لەلایەن دوژمنانی ئیســلامەوە، بە دڵنیاییەوە ئەو کاتە بۆ نەگەڕاندنەوەی شــکۆی موســڵمانان و جێبەجێکردنی جارێکی تر حوکمی قورئان لە زەویدا، ماســۆنیەتی جیهانی هەموو پیر و شــوێنکەوتوانیان هەستان هێدی هێدی کار و شتەکانیان هێنایە ناو ئەو وڵاتانەی کە کاتێک هەبوو حوکمیان دەکرد بە قورئان و شـــتەکانیان لە بیر بردنەوە و ئاینی ئیســـلامیان لەناو کز کردن و وایان لێکردن چیتر پابەند نەبن بە دروشـــم و خاڵەکانی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)،

تاوەکو نەتوانن جارێکی تر دەســەڵات بگرنەوە دەســت لەســەر ڕووی زەوی و پەیڕەوی بکەن لە قورئان و لە سوننەت.

یەکێک لەو فێڵ و چەواشــەکاریانەی کەوا کردیان و هێنایانە ناو خەڵکی موســڵمان و وڵاتەکان، کە کاتێک هەبوو حوکمیان دەکرد بە قورئان و ڕێژەی زۆریان موســڵمان بوون، پڕۆســەی دیموکراســی و هەڵبژاردن و پەڕلەمانە، توێژەرەوانی ئەو باس و بابەتانە لەناو موسڵمانانیش هەستان بە توێژینەوەی ئەو باس و بابەتە و لق و پۆپەکانیان، جا ڕا جیاوازی لێکەوتەوە (دەمە دەمی لێ درو ست بوو) خەڵکێکی زۆریش تیایدا داماو و سەر لێ شێواو مانەوە و ڕاســتیەکانیان لێ ونبوو، لەلایەن هەندێک لە توێژەرەوان و زانایان ڕاســتە زۆر بە ڕاشــکاوانە و بە بەڵگەوە توێژینەوەی بۆ کراوە و ڕای تەواوی شــەرعی دەربارەی خراوەتە ڕوو، بەڵام هەموو لایەنەکان بە ڕاســتیەکان ڕازی نەبوون ئەوانەی لە پێناو بەرژەوەندی خۆیان ئەو باس و بابەتانەیان هەڵبژارد و دەستیان پێوە گرت و کار و تەماحی دونیای هاتە ناو، ئەوەبوو شــێواندیان و نەیان هێشــت بگاتە مەنزڵگای خۆی و هەموو خەڵکەکە بە تەواوەتی لێی حاڵی بێ، جا تاوەکو ئێستاش بە زمانی کوردی و لە ناو خەڵکی کوردستاندا ئەو باس و بابەتانە هەر ماوەتەوە و مشتومڕی زۆری لەسەرە و ڕاستیەکان تەواو دیار نییە، جا لە پێناو ئەوەی ڕاســتیەکان تەواو ڕوون ببێتەوە و بە تەواوەتی خەڵکەکە حاڵیبێ و تێی

بگات، لە ژێر ناونیشانی (هەڵبژاردن و دەنگدان لە دیدگای قورئان و فەرموودە) ئەو باس و بابەتەمان دانا باسی لێوە بکەین بە ڕاشکاوانە.

## لە پێناو ئەو خاڵانەدا ئەو باس و بابەتەمان هەڵبژارد:

١-بابەتەکە بوەتە باس و بابەتێکی سەردەم، وە تەواو حوکمە شەرعیەکەی بۆ خەڵکی ڕوون نەکراوەتەوە، هەر کەس و لایەنێک هاتووە بە گوێرەی بەرژەوەندی خۆی بە ناکامڵی باسی کردووە و تەنها چەند توێژینەوەیەکی کەمی زانستیانەی دەربارە کراوە، کە لە ناو خەڵکی وڵاتەکەماندا دیارنییە، بۆ ئەوەی باسەکە زانستیانە بخرێتە ڕوو ئەو کارەمان کرد و پێی هەڵساوین.

٢-زۆرێک لەو برا و خۆشکانەی الله بەیەکگرن تامەزرۆی ڕوونکردنەوەی شەرعین، لە باس و بابەتە هەنووکەییەکان، تاوەکو بەرچاویان ڕوون بێتوو تووشی گوناح و هەڵە نەبن و بەڵگە بە دەستبن لە وەڵامدانەوەیان بۆ خەڵکانێک کە ناحاڵین و تێ ناگەن، کاتێک بانگەوازییان لەگەڵدا دەکەن، داوایان کردووە لە ئێمە ئەم باس و بابەتانە ڕا شکاوانە بۆیان باسبکەین و زانستیانە بیخەینە ڕوو و بەڵگەکانیان بدەینە دەست، جا بە پشتیوانی الله تعالی بۆ هێنانەدی داوا کاریەکەی ئەوان و شکاندنی تامەزرۆییەکەیان ئەو باس و بابەتەمان هەڵبژارد إن شاء الله وا دەردەچێ.

٣-گومانی زۆر خراواتە ناو ئەو باس و بابەتە، لەلایەن خەڵكێكی بەرژەوەندچی و سوود وەرگر لە هەل و مەرجەكان و گومڕاكەری خەڵكی، كە پێغەمبەری الله (ﷺ) ئومەتەكەی لێیان ئاگادار كردووەتەوە و فەرموویەتی: (**وَإِنَّمَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي مِنَ الأَئِمَّةِ الْمُضِلِّينَ**)[1] واتە: ئەوەی لێی دەترسم بەسەر ئومەتم تەنها پێشەوایانی گومڕاكەرن، (**الْمُضِلِّينَ**) لە زمانی عەرەبییەوە زانایان فەرموویانە دوو مانا دەگەیەنێ لە یەک كاتدا، ئەویش لە خودی خۆیان گومڕان و خەڵكیش گومڕادەكەن و بانگەواز بۆ گومڕایی دەكەن، تاوەكو گومانەكان ئاشكرا بكەین و بڕەوێنینەوە ئەو باس و بابەتەمان هەڵبژارد، بۆ ئەوەی خەڵكی چیتر گومڕا نەبێ بە قسەی گومڕای گومڕاكەرەكان.

٤-تاوەكو ببێتە بیانوو بڕینی خەڵكی و حوجە لەسەر كردنیان، هەرچەندە بیانووشیان نەمابێتوو حوجەشیان لەسەر كرابێ، چونكە دروستە حوجە لە دوای حوجە لە سەریان بكرێت، تاوەكو هیچ قسەیەكیان نەمینێ.

---

[1] ئەبو داود لە سونەنەكەی هیناوێتی (ژ: ٤٢٥٢) فەرموودەیەكی سەحیحە.

## سەرباسی بابەتەکان و خاڵە سەرەکیەکان و تەوەرەکان:

١-سـەرەتا دەچین پێناسـەی چەند چەمک و زاراوەیەکی پەیوەندی دار بە باسـەکەوە دەکەین، یەکەم؛ عەلمانیەت، دووەم؛ دیموکراسی، سێیەم؛ هەڵبژاردن.

٢-دێین حوکمی شـەرعی هەڵبژاردن لە دوو بڕگە باس دەکەین بە پشـتیوانی الله، بڕگەی یەکەم؛ بەشـداریکردنی هەڵبژاردن لە لایەن عەلمانیەکان، چ وەکو بەربژێر و پاڵێوراو و کاندید (المنتخب والمرشـح) یان وەکو دەنگدەر (المنتخب والناخب)، وە بڕگەی دووەم؛ بەشـداریکردنی هەڵبژاردن لەلایەن ئەو لایەنانەی کە پاشـگری ئیسـلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە، وەکو بەربژێر و پاڵێوراو و دەنگدەر، جا هینانەوەی بەڵگەکانی هەردوو لایەنەکان و ڕاو بۆچوونەکانیش دەخەینە ڕوو هەر چەندێک هەبێ، وە هەڵوە شانەوەی بەڵگەکانیش ئەوانەی کەوا بەڵگە نییە وەکو بەڵگە هیناویانەتەوە و خەڵکیان تێگەیاندووە.

٣-باسی خلیسکان و خراپیەکانی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن دەکەین، کە چەندین خراپە و خلیسکانی پێوەیە.

٤-چەندین گومان دروستبووە و دروستکراوە، تاوەکو گومانەکان بڕەوێنینەوە و ئاشکرایان بکەین.

٥-ڕێگا چارە بۆ موسڵمانان ئەگەر بێو ئەو ڕێگایە نەگرنەبەر چییە؟ ئەوانەی کەوا تامەزرۆی ئەوەن جارێکیتر حوکمی ئیسلام و شەریعەتی ئیسلام بگەڕێتەوە ناویان چی بکەن و چ هەڵسوکەوتێک بکەن و چ ڕێگایەک بگرنەبەر؟ ڕای پەسەندی دروست لە هەردوو ڕایەکان کە دوو ڕایە و دێتە پێشمان بە پشتیوانی الله تعالى دیاری دەکەین، وە بەدیارخستنی ئەو ڕێگا و چارەسەریانە بۆ واقیعی ئەمڕۆ و ئەرکی موسڵمان لەمڕۆدا.

٦-لە کۆتاییەکەیشدا ئەنجامی توێژینەوەکە و وتارەکان لە چەند خاڵێکدا و بە چەند ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانە دەخەینە ڕوو بە پشتیوانی الله.

## پێناسەی چەند چەمک و زاراوەیەکی پەیوەندیدار بە باسەکەوە:

**١-(العلمانية) عەلمانیەت:** وەرگێڕانی درو ست بۆ ئەو و شەیە وەکو توێژەرەوان دەڵێن لەوانە سەفەر حەوالی دەڵێ: (**الادينية**) واتە: بێدینی نەک لە عیلم و زانست وەرگیرابێت یان (**الدنيوية**) واتە: دونیایی و دژ بە ئاین و ژیان، دائیرەی مەعاریفی بەریتانی پێناسەی چەمکی (العلمانية) دە کات و دەڵێ: (**هي حركة إجتماعية تهديف إلى صرف الناس وتوجيهِ من الإهتمام بالأخرة إلى الاهتمام بهذه الدنيا وحدها**)[1] واتە: عەلمانیەت بریتییە لەو جوڵانەوە کۆمەڵایەتیەی ئامانجی دەبێت بۆ لادانی خەڵکی و ئاراستە کردنیان لە بایەخدان بۆ دوارۆژ بۆ بایەخدان تەنها بە دونیا، وە دروشمە سەرەکیەکانی عەلمانیەت و بنەمایەکەی لەسەری دەڕۆن (**فصل الدين عن الحياة**)ە نەک (**عن الدولة**) بە تەنها ئەوەیان هەڵەیە، مەبەست پێی ئەوەیە جیاکردنەوەی ئاین لە ژیان، لە گشتی ژیاندا و لە کایەکانی ژیان جیابکرێتەوە نەک بە تەنها لە دەوڵەت و دەسەڵات، لە پاشان یەکێکی تر لە خاڵەکانیان (**إقامة الحياة على غير الدين**) واتە: وەستاندنی ژیان لەسەر جگە لە ئاین.

---

[1] لە دائیرەی مەعاریفی بەریتانیدا ئەو باس و پێناسە و چەمکە ڕونکراوەتەوە وەکو سەفەر حەوالی لە کتێبەکەی خۆی - العلمانية نشأتها وتطورها واثارها في الحياة الإسلامية معاصرة- (ل: ٢١-٢٢) بە جوانی هەموو ڕاو بۆ چوونەکانی کۆکردوەتەوە لەسەریان دەدوێ و ئێمەش لەوێیان وەرگرتووە.

**عەلمانیەت کراوەتە دوو جۆر:**

**١-(العلمانیة المتطرفة) عەلمانیەتی توندڕەو؛** ماکسزمیەکان و کۆمۆنیستەکان و شوعیەکانن، کە بڕوایان بە الله و بە دواڕۆژ و بە قیامەت و باقی شتەکانی تری ئاینی الله نییە و دەڵێن ئاین تلیاکی گەلانە.

**٢-(العلمانیة المعتدلة) عەلمانیەتی میانڕەو؛** کە دژایەتی ئاین ناکا ڕاستەوخۆ، تەنها لە ژیان جیای دەکاتەوە، لە ناو ئەو کۆمەڵگایانەدا کەوا ئاینیشـــیان هەیە و دەژیت دەڵێ نابێ ئاین کاربکاتە سەر کایەکانی ژیان و لە دەسەڵاتدا بەکار بهێنرێ.

بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەی ئیســـلام ســـەرنجی بدەین، بە دڵنیاییەوە هەردوو جۆرە کانی عەلمانیەت سەبارەت بە حوکمی ئیسلام هەر یەکن، لە ڕووی ئەوەی کەوا شیرک و کوفرە و لە ئیســـلامدا جێگای نابێتەوە، هەندێک لە زانایان دەفەرموون ئەگەر بە پێوەری قورئان باس و بابەت و لایەنەکانی سەردەم پۆلێن بکەین، لە قورئاندا الله تعالی گشت مرۆڤایەتی پێناسە کردووە و پۆلێنی کردن بۆ سێ بەش:

١-کافرو موشریکە ئاشکراکان.

٢-مونافق و دەغەڵ و دووڕووەکان.

٣-موسڵمانان و بڕواداران.

**١-کافر و موشریکە ئاشـــکراکان؛** ئەوانەی بە ئاشـــکرا کوفر و شـــیرک دەکەن وە مولحیدن و فڕیان بەسەر ئیسلامەوە نییە، ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە، واتە جۆری یەکەمی عەلمانیەت کە (العلمانية المتطرفة)یە ئەوان دەگرێتەوە، لە پۆلی ئەوەدان لە ناو قورئاندا کەوا کافر و موشریکن و فڕیان بەسەر ئیسلامەوە نییە.

**٢-مونافق و دەغەڵ و دووڕووەکان؛** نیفاق لە ڕوانگەی ئەهلی ســـوننە و جەماعە دەبێتە دوو جۆر:

**جۆری یەکەمیان؛** نیفاقی گەورە و ئیعتیقادیشی پێدەگووترێت (بیروبڕوایی).

**جۆری دووەمیشیان؛** نیفاقی بچوک و عەمەلیشی پێدەگووترێت (کرداری).

کە جۆری دووەمیان ئەوانەی سیفەتەکانی نیفاقیان لێ دێتەجێ لە ئیسلام دەرناچن، بەڵام جۆری یەکەمیان نیفاقی گەورە و ئیعتیقادیی بریتییە لەو نیفاقەی کە خاوەنەکانی و ئەوەی لەو بە شەدایە فڕی بە سەر ئیسلامەوە نییە و لە کافر و موشریکەکان حیسابە، جا جۆری دووەمی عەلمانیەتیش زانایان دەفەرموون ئەگەر ناوی لێنرابێ موعتەدیلیش هەر کوفر و شیرکە، بەڵام کوفر و شیرکێکی نیفاقی ئیعتیقادی و گەورەیە هەر لە ئیسلامدا بوونیان نییە و دەردەچن.

**٢-(الـديمقراطـية) ديموكراتيەت:** وشـــەيەكى لاتينيە لە دوو برگە پێكهـاتووە، لە **(DEMOS)** كە بە ماناى گەل دێت، لەگەڵ **(KRATOS)** كە بە ماناى حوكم و دەســەڵات دێت، بە لێك دراوى بە ماناى دەســەڵات و حوكمى گەل دێ يان حوكم و دەســەڵات بۆ گەلە، يەكلاكردنەوەى بڕيار بە زۆرينەيە لە لايەن ديموكراســيەت، وە ئازادى بيروبڕوا و ڕەوشــت و يەكســانى تاكەكان و ڕەگەزەكان دروشــمى ســەرەكييانە و كارى پێدەكەن، كە ئەوانە هەمووى لە ئيســـلامدا بريتييە لە ئاين و ڕێبازێكى جگە لە ئاين و ڕێبازى الله و موسڵمانان، وە بڕوا هەبوون پێى كارێكى ترسناكە و كەسێك لەسەرى بڕوا و پێيوە پابەندبێ يان بڕواى پێ بێنێ لە ئيسلام دەردەچێ.

**٣-(الانتخاب) هەڵبژاردن؛** بريتييە لە دەنگدان بۆ كەس و لايەنێك لە چوار چێوەى سيستەم و ياساى ديموكراسى كە بۆى دياريكراوە بۆ ماوەيەكى دياريكراو بۆ ئەندامێتى لە ئەنجومەنەكانى ياسا دانان يان سەرۆكايەتى يان هەر سەنديگا و ئەنجومەنێكى تر.

## کۆڵەگەکانی هەڵبژاردن چوارن:

١-بەربژێر، پاڵێوراو، کاندید (المرشح، والمنتخب).

٢-دەنگدەر، هەڵبژێرەر (المصود، الناخب، المنتخب).

٣-دەنگدان عەمەلییە و کرداری دانگدان (التصود، الإقتراع، الإنتخاب) پێدەگووترێت.

٤-ئەو دەزگا و شتەی هەڵبژاردنەکەی بۆ دەکرێت و خەڵکەکەی بەرەو دەبردرێت و دەچنە ناوی کۆتاییەکەی و نەتیجەکەی ئەویش پەڕلەمان و سـەرۆکایەتی یان هەر ئەنجومەن و سەندیکایەکی ترە.

## حوكمی شەرعی هەڵبژاردن لە دیدگای قورئان و فەرموودە:

سەرەتا دێین و دەڵێین هەڵبژاردن لە بنەڕەتدا بۆ ئەو سەردەمەی ئێمە مەبەست لێی ئەو هەڵبژاردنەیە كە هەڵقوڵاوی عەلمانیەت و دیموكراسیەتە، نەک هەڵبژاردنی ئیسلامی یان بەگشتی هەڵبژاردن، زیاتر لەو توێژینەوەی ئێمە مەبەست لێی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی یاسا دانانە (پەرلەمان)، كەواتە پێویستە سەرەتا پێناسەی ئەو ئەنجومەنە بكەین و بیناسین، ئینجا بڕیاری شەرعی و بەشدار بوون تیایدا و هەڵبژاردن بۆ ئەندامێتی لەسەری بدەین.

**پێناسەی ئەنجومەنی یاسا دانان:** بریتییە لەو ئەنجومەنەی كە كۆمەڵێک لە ئەندام لە خۆ دەگرێت، كە لە ڕێگای هەڵبژاردن بەو سیستەم و یاسایانە كە بۆی دانراوە كەسەكە یان لایەنەكە دەبێتە ئەندام بۆ ماوەیەكی دیاریكراو، كاری بنەڕەتی ئەو ئەنجومەنە بریتییە لە دانانی یاساكان، كە كاروباری كۆمەڵگا لەخۆ دەگرێت و پێی بەڕێوە دەچێت، وە چاودێری دەسەڵاتی جێبەجێكردن (دەسەڵاتی قەزائی) دەكات، پەیوەستی دەكات بە دەستور و یاساكان، ئەوەش لە ڕێگای ئامراز و ئالیەتە جۆراو جۆرەكان بە گوێرەی هەموو سیستەمەكان.

ئەو ئەنجومەنە بەم چەند ناوە ناسراوە (ئەنجومەنی نوێنەران، ئەنجومەنی یاسادانان، ئەنجومەنی گەل، پەڕلەمان، ئەنجومەنی نیشتیمانی) لە هەر وڵات و شوێنێک ناوێک لەو ناوانەی لێنراوە، بەڵام کۆی کۆکەرەوەی هەر هەموویان ئەوانە ئەو ئەنجومەنەن کە یاسا دادەڕێژن و دادەنێن، بە زۆرینەی دەنگ یەکلایی دەکەنەوە.

## کار و ڕۆڵی سەرەکی ئەو ئەنجومەنە دوو خاڵە:

١-داڕشتنی یا ساکان کە نیشانەی سیاسەتی دەوڵەت و حکومەتە، لە ناوەوە و لە دەرەوە دیاری دەکات و دایدەڕێژێ.

٢-چاودێری و پێداگری لەسەر جێبەجێکردنی یاساکان، لەلایەن جێبەجێ کاران و دادوەری ئەوانەی تەنفیزی و قەزائی پێدەگوترێ، وە لێپرسینەوە لە کاتی جێبەجێنەکردن یان کەمتەر خەمی لێیان.

کەواتە هەم یاسا دادەنێن و تەشریع دەکەن و ئەنجام دەدەن، هەم بە دوای جێبەجێکردنیەوە دەبن و پێداگیری لەسەر جێبەجێکردنی دەکەن.

## ئەو باس و بابەتانەی باس دەکرێن و دەدرێنە دەنگدان ئەوانەن:

١-هەموو باس و بابەتێک چەند پیرۆز و بەرز و بڵند و شـــکۆداریش بێت، ئاســـاییە بە لایانەوە بدرێتە دەنگدان و دەنگی زۆرینە یەکلای دەکاتەوە، ئەگەر کار و شـــتەکە بڕیاری یەکلاکەرەوەی شەرعیشی لەسەر هەبێت و ئاینی الله بێت، هەر ئەوەی بۆ هەیە و دەدرێتە دەنگدان و زۆرینە یەکلایی دەکاتەوە.

٢-ئەندامەکان ئازادن لە هەر قســە و تانە و تەشــەرێک لە هەر بیروبڕوا و کەسێک بدەن، ئەگەر ئەو بیروبڕوایە هی الله و ئیسلامیش بێت، وە کەسایەتیەکە پێغەمبەری الله (ﷺ) و هاوەڵانیش بن (رضي الله عنهم).

پێش هەموو شتێک ئەوەی خۆی هەڵدەبژێرێت لە سەرەتاوە دەبێت دان بنێت بە یاساکانی کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن و ڕازی بێت بە دیموکراسیەت، ئەگەر ببێتە ئەندامیش بڕوای وابێت کە دەبێ دانبنێت بە شەرعیەتی ئەنجومەنەکە و ئەو مافەی یا سا دانانیشی دان پێدابنێت، وە ســوێند لەســەر پابەندبوون و پاراســتنی یاســاکان بخوات، لە ئەگەری دۆڕاندن و دەرنەچوونیشی دەبێت دان بنێت بە سەرکەوتنی بەرامبەرەکەی ئەگەر هەر بیرو بۆچونێکی هەبێت تەنانەت مولحید و بێ بڕوا و کۆمەنیســتیش بێت، هەر دەبێ ئەو دانی پێدابنێت

ئەگەر دژ بە الله و پێغەمبەر (ﷺ) و ئاینی ئیسلامیش بێت پیرۆزبایی بردنەوەی لێبکات و گۆڕەپانەکەی بۆ چۆڵ بکات و پێی ڕازی بێت.

## ئەو لایەن و کەسانەی بەشداری هەڵبژاردن دەکەن دوو جۆرن:

١-لایەن و کەسی عەلمانی.

٢-لایەن و کەسی کە پاشگری ئیسلامیان بەخۆیانەوە لکاندوە.

## پێناسەی هەردوو لایەنەکە و بڕیاری شەرعی بۆ دەنگدان پێیان

### بڕگەی یەکەم؛ بەشداریکردنی هەڵبژاردن لە لایەن عەلمانیەکان:

**پێناسەی لایەن و کەسی عەلمانی:** مەبەست لێی ئەو لایەن و کەسانەیە بە گوێرەی عەلمانیەت بیر دەکەنەوە و پەیڕەوی لەو بیروبڕوایەدا دەکەن، کە ئاین کارێکی کەسییە و نابێت لەگەڵ دەوڵەت و حکومەت و کایەکانی تری ژیانی دونیا تێکەڵ بکرێت و یاساکان سەروەرن، کە نوێنەرایەتی گەل دایدەڕێژێت و بە زۆرینەی دەنگ یەکلا دەبێتەوە، ئەگەر پێچەوانەی فەرمانەکانی الله و پێغەمبەریش بێ (ﷺ)، وە دژ بە ئاینی ئیسلامیش بێت.

### ئەوانە وەک گووتمان دوو جۆرن:

١-(العلمانية المتطرفة) عەلمانیەتی توندڕەو.

٢-(العلمانية المعتدلة) عەلمانیەتی میانەڕەو.

لە ڕوانگەی ئیسلام هەردوو جۆرەکان لە ڕابردودا ڕوونمان کردەوە بێ بڕوان، کە بە گوێرەی پۆلێنی کردنی قورئان گووتمان جۆری یەکەمیان؛ لە کافر و موشریکە سەریح و ئاشکراکانن، وە جۆری دووەمیشیان؛ لە مونافقە دەغەڵ و دووڕووەکانی نیفاقی گەورە و ئیعتیقادی و بیروبڕوایین.

لە پاشـــان ئەوانە کاتێ ئەو بیروبڕوایەیان هەیە و خۆیان هەڵدەبژێرن و بەربژێر دەکەن و دەنگیان پێ دەدرێ و دەبنە نوێنەری خەڵکەکە لە پەڕلەماندا، حوکمی شەرعییان چییە؟

**لایەنە عەلمانییەکان:** گووتمان ئەوانە کافر و موشریکی ئاشـــکران یان مونافق و دەغەڵ و دوو ڕوون، دەنگدان پێیان لەلایەن کەسێک کە خۆی پێ موسڵمان بێ، بەدڵنیاییەوە بەیەکـدەنگی موســـڵمانـانی جێگـای متمانە قەدەغە و حەرامە، هەموو ئەو ئـایەت و فەرموودانەی کە باس لە قەدەغەی دۆستایەتی و خۆشویستن و نزیکبوونەوە و سەرخستنی کافر و موشریک و مونافقە ئیعتیقادی و گەورەکان دەکەن بەڵگەن لەســـەر ئەوەی کە قەدەغەیە و حەرامە.

لێرەدا کۆتایی بە ئەم باس و بابەتە دەهێنین، وە پێویست ناکات زۆری لەسەر بڕۆین چونکە لە شتێکی حاشا هەڵنەگرە و ئەوە بڕیارە شەرعییە یەکلابوونەوەکەیە، نەمانزانیووە کەسێک ئەگەر ئەدنا عیلم و زانستی شەرعی هەبێ ڕازی بێ و پێی دورستبێ پاڵپشتی ئەو کەسانە بکرێ و لە گەڵیاندابی و ســـەریانبخەی لەو پرۆســـە و باس و بابەتانە، بەڵگە قورئانییەکان زۆرن بەڵام ئێمە تەنها ئەو سێ ئایەتە دەهێنینەوە و کۆتایی بە باس و بابەتەکە دەهێنین:

١-الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ ۚ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ**﴾ **(ال عمران : ٦٤)**

واتە: ئەی محمد (ﷺ) بە خاوەن پەرتووکەکان بڵێ (بە جولەکە و نەسرانیەکان بڵێ) بابێن بۆ وشەیەک کە یەکسانە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا ئەویش بریتییە لەوەی تەنها الله بپەرستین شەریک و هاوبەشی بە هیچ کەس و شتێک بۆ پەیدا نەکەین وە کەسێک لە ئێمە هەندێکمان نەکەین بە پەروەردگار و پەرستراو و بیپەرستین بێجگە لە الله تعالی جا ئەگەر ئەوان پشتیان کرد و نەهاتن تۆ پێیان بڵێ ئێمە لە موسڵمانانین (ئەوانەی کەوا ملمان داوە بۆ فەرمانەکانی الله تعالی).

کەواتە لێرەدا ئەوە دەگەیەنێ ئەوەی ئەو کەس و لایەن و شتانە هەڵدەبژێرێ بە دڵنیاییەوە پەرستراوێکی بۆخۆی داناوە کە یاسای بۆ دابڕێژی و دابنێت و حەڵاڵی بۆ حەرامکا و حەرامی بۆ حەڵاڵکا، وەکو الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ**﴾ **(التوبة : ٣١)** واتە: جولەکە و دیانەکان زانایەکانیان یان ڕەبەنەکانی کەوا لە کەنیسەکان بە حیسابی خۆیان الله پەرستییان دەکرد و وازیان لە دونیا هێنابوو ئەوانیان

کردبووە پەرســـتراو بێجگە لە الله تعالی کەوا حەڵاڵیان بۆ حەرام دەکردن و حەرامیان بۆ

حەڵاڵ دەکردن.

٢-الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ**﴾ **(المائدة : ٥١)**

واتە: ئەی گەلی بڕواداران جولەکە و نەسرانیەکان مەکەنە دۆستی خۆتان و خۆشتان بووێن

چونکە ئەوان هەندێکیان دۆســـتی هەندێکیان و پاڵپشـــتی هەندێکیان دەکەن و لەگەڵ

یەکتردان هەریەک لە ئێوە دۆستایەتییان بکات یان ئەوانی خۆشبوێ یان سەریانبخا بەسەر

موسڵمانانەوە ئەوە لەوانە (جا بە دڵنیاییەوە لەوانە) بەڕاستی الله تعالی هیدایەتی و ڕێنمویی

گەلان و کەسانی ستەمکار ناکات.

٣-الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ**﴾ **(هود : ١١٣)**

واتە: ئێوە مەیل مەکەن و خۆتان مەدەن بەلای ئەوانەی ســـتەمکارن و ســـتەم دەکەن ئاگر

دەتانگرێتەوە چونکە پشـــتیوانی الله تان نامینێت و الله ســـەرتان ناخات لە پاشـــان

سەرکەوتوو نابن.

**زانایانی توێژەروانی قورئان دەفەرموون ڕکون مەیلێکی کەمی دڵە یان خۆ بە لاوە دادان و پشتگیری کردنە، ئەویش دوو بەشە:**

١-بۆ زاڵم و ســتەمکارەکان کەوا نەگەیشــتوونەتە پلەی ئەوەی لە ئیســلام دەربچن و کافر بووبن پشتگیری کردنیان و لەگەڵدا بوونیان و مەیل بوون بۆیان، ئەوە ستەمە و تاوانە و لە ئیسلام ناتباتە دەر.

٢-ئەو زاڵمانەی کەوا شــیرکیان کردووە ﴿**إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ**﴾ **(لقمان : ١٣)** واتە: چونکە بەڕاســتی شــیرک و هاوبەشــی ســتەمێکی گەورەیە (الله زوڵمی بە شــیرکیش ناو بردووە لە قورئان).

کەواتە ئەو کەســـانەی کەوا موشریکن کافرن ئەگەر مەیلت هەبێ بەلایانەوە و پشـــتیان بگری و لەگەڵیاندابی ئاگر دەتگرێتەوە و پێی لە ئیســـلام دەردەچی و ئەو کات پێی کافر دەبی و پشتگیری الله ت نامینێ.

## بڕگەی دووەم؛ بەشـــداریکردنی هەڵبژاردن لەلایەن ئەو لایەنـانەی کە پاشگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە:

### پێنا سەی لایەن و کە سی کە پا شگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە:

ئەو لایەن و کەسانەن کەپاشگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە و پێیان وایە کار و ئیش دەکەن بۆ بانگەوازی بۆلای الله تعالی و گەڕاندنەوەی حوکمی الله و خەڵکی بانگ دەکەن بۆ ڕەوشـــتی جوان و ڕێبازەکەی پێغەمبەری پێشـــەوا (ﷺ)، بە چەندین پاســـاو و بیانووی جۆراو جۆر بەشداری دەکەن لە پڕۆسەی هەڵبژاردن و سیستەمی دیموکراسیەت لەو وڵات و جێگایانەی کە کاتێک هەبووە حوکمی ئیســـلام و قورئانی تێدا پەیڕەو کراوە و زۆرینەی جەماوەرەکەی موسڵمان بوون.

### هەندێک لەو بیانوانەی کە دەیگرن و دەیڵێن:

١-دەڵێن با دانەبڕێین لە واقیع و گۆڕەپانەکە چۆڵ ببێت بۆ دوژمنانی ئیسلام.

٢-دەڵێن هێدی هێدی و قۆناغ بە قۆناغ بە ڕێگای پلە پلەیی و تەدەروج حوکمی الله دەگەڕێنینەوە، چونکە بە دیل و ڕێگای لەوە باشترمان بە دەستەوە نییە.

٣-دەڵێن زەروراتێکی هەنووکەییە و ڕێگایەکی شـــەرعییە، کە بەرژەوەندی موســـڵمانان و بانگخوازانی تێدا دابین دەبێ و هەیە.

هەندێکی تریش بە بیانوو دەگرن و دەیڵێن.

**لای هەمووان ڕوون و ئاشـــکرایە لە ســیســـتەمی عەلمانیەت کە ئەمڕۆ بەهۆی جیهانگیریەوە دونیای داگرتووە بە چەند مەرجێک لایەن و کەســەکان قبوڵ دەکرێن و ڕێگایان پێدەدرێت بەشـــداری هەڵبژاردن و حکومڕانی بکەن:**

١-دەبێت بڕوابێنن بە سیستەمی عەلمانی و دیموکراتی.

٢-دەبێت یاسا ســەروەری پەیڕەو بکەن لە یاساکان، کە زۆربەی یاساکانیش مەعلومی بەڕێزتانە پێچەوانەی شەرعی ئیسلامن و گوناحبارین.

٣-دەبێت پێکەوە ژیانی ئاشـــتیانە و دوور لە تەنگەژەیی لەگەڵ هەموو ئاین و ئایدۆلۆجیاکانی جگە لە ئیسلام بکەن و ڕێزیان لێ بگرن.

٤-دەبێت وازبهێنن لە بە کافر دانانی کافر و هاوبەش بڕیار دەران و وەلائی شـــەرعی بگۆڕنەوە بە وەلائی نیشـــتیامانی و گەلی و نەتەوەیی، وە بەڕائی شـــەرعیش بگۆڕنەوە بە بەرائەت بوون لە موسڵمانانی ڕاستەقینە، یان ئەوانەی دەیانەوێ حوکمی ئیسلام بگەڕێننەوە.

٥-دەبێت وازبێنن لە باس و خواسـی جەنگ و جیهاد و دژایەتی کردنی کافران و بە دوژمن زانینیان و خۆ ئامادەکردن و ئیعداد کردن بۆ جەنگ و جیهاد و بۆ شـەڕ و جەنگ لە دژی کافر و بێ بڕوایان.

لە توێژینەوە و نوسراوەکان دەربارەی خۆ هەڵبژاردنی ئەو لایەن و کەسانەی کە پاشگری ئیسـلامییان بەخۆیانەوە لکاندووە دەتوانین بڵێین دوو ڕاو بۆچوون هەیە و پەیدابووە، کە هەردووکیان بە پشـتیوانی الله تعالی دەخەینە بەر چاوتان لەگەڵ بەڵگەکانیشـیان و هەڵوەشانەوەی بەڵگەکان و لە کۆتایشدا وەکو لە پێشەکیەکەدا باسمان کرد ڕای پەسەندتان پێ دەڵێین.

## ڕای یەکەم بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردن

## ڕای یەکەم؛ دەڵێن دروستە بەشداریکردن بە چەند مەرجێک:

- **مەرجی یەکەم؛** لایەن و کەسەکان دەبێ پابەندبن بە بیروبڕوا و دامەزراوبن لەسەری.
- **مەرجی دووەم؛** بەرژەوەندی و چاکە ڕەچاو بکرێت بە ڕێژەی زۆر و گومانی زاڵ لە بەشداریکردنەکە بۆ ئیسلام و موسڵمانان.
- **مەرجی سێیەم؛** فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە ئەنجام بدرێت لە ئەنجومەنەکەدا.
- **مەرجی چوارەم؛** تەواو هەوڵی چەسپاندنی بڕیارە شەرعیەکانی ئیسلام بدرێت و کەمتەرخەم نەبن لێی.

وە هەندێکیش لەو توێژەر و موفتی و ئەوانەی پرسیاریان لێکراوە گوتوویانە بەڵکو پێویست و واجبە بەشداریکردن لەو پرۆسەیە و لەو مەشروعە، ئەوە ڕاو بۆچوونی کۆمەڵێکە لە موفتی و توێژەرەوانی سەردەم، کە هەندێکیان توێژینەوەی سەربەخۆیان لە سەر کردووە و هەندێکیشیان پرسیاریان لێکراوە و وەڵامیان داوەتەوە.

ئەوانەی پرســیاریان لێکراوە بۆ نموونە؛ (شــیخ أحمد شــاکر مصرــی، عبد العزیز بن باز (موفتی پێشووتری سعودیا)، محمد بن صالح العثیمین، عبد الله بن جبرین، محمد ناصر الدین الألباني، دکتور عبد الکریم زیدان، دکتور عبد الله عزام، ...هتد).

ئەوانەی توێژینەوەیان کردووە لەســەری بۆ نموونە؛ (دکتور عمر ســلیمان الأشــقر، عبد الرحمن عبد الخالق کویتي، دکتور مشیر المصري، ...هتد).

زۆربەی بزوتنەوەکان و لایەنەکانی پاشــگری ئیســلامییان هەیە و بە میانەڕەو ناوی خۆیان بردووە و دەرکردووە، ئەوان ئەوە بۆچوونیانە و لەگەڵ ئەو ڕاو بۆچوونەدان، بەڵام پێویســتە چەند ڕوونکردنەوەیەک بدەین بۆ ئەوەی ڕاســتێتی ڕاو بۆچوونەکان تەواو دەربکەوێت، پێش ئەوەی بەڵگەکانیان بێنینەوە و هەڵوەشێنینەوە و قسەی لەسەر بکەین.

## ڕوونکردنەوەکان:

١-ئەو مەرجانەی بە خاڵ دیاریمان کرد و بۆمان باســکردن بە خاڵ دیارییان نەکردووە توێژەرەوەکان و موفتیەکان و ئەوانەی پرسیاریان لێکراوە، بەڵام لە ئەنجامی وردبوونەوە لە قسە و گووتنەکانیان و توێژینەوەکانیان ئەوە دەردەکەوێت.

٢-زۆربەیـان لە توێژەرەوەکـان و موفتیەکـان و ئەوانەی خـاوەن ئەو ڕایەن بە بنەمـای بەرژەوەندی و مەسـڵەحەت ئەوە یان بەسـتوەتەوە بەڵگەی قورئانی و فەرموودەیەکی ئەوتۆیان لە دەستدا نەبووە.

٣-هەندێکیان بەخۆ هەڵبژاردن و چوونە ناو پرۆژەکە ڕازی نین، بەڵام دەڵێن هەرکاتێک ئەگەر بوو ڕوویدا ئەو کاتە با دەنگ بدرێت بەوانەی پاشـگری ئیسـلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە و بەشـداریيان کردووە، بە مەرج دروسـتی دەکەن و دەڵێن دەنگ پێدانەکەیان ڕەنگە چاکترە زەرەرەکەشـی کەمترە لەوانە محمد ناصر الدين الألباني یە، کە لە دواتریش بۆتان دەسەلمێنین بە بەڵگەی حاشا هەڵنەگر و یەک دەنگی قوتابیەکانی لەو ڕاو بۆچوونەی پەشیمان بوەتەوە.

٤-بە دڵنیاییەوە زۆربەیان ماهییەت و خاڵ و ئەرک و کارەکانی ئەنجومەنی یاسـا دانانیان نەزانیوە و تەواو شـارەزا نەبوون، لە قسـەکانیان ئەوە دەر دەکەوێت، ئەگەرنا بە گوێرەی فتوای تریان کە هەیانە هەندێکیان کە لە ئەنجومەن تێدەگەیەنرێن یان خاڵ و بڕگەیەکی سەرەکی ئەنجومەن کە کوفر و شیرکە وەکو؛ سوێند خواردن لەسەر یاسا دەستکردەکان و پارێزکاریکردن لێیان و پاراستنیان پەشیمان بوونەتەوە یان ئەگەر پەشیمانیش نەبووبن فتوای یەکلاکەرەویان هەیە، بۆ نموونە؛ عبد العزيز بن باز کاتێ تێدەگەیەنرێن لە فتوای تری هیچ

ڕێگا نادا و دەڵێ نابێ سوێند بخورێت لەسەر ئەو یاسایانەی پێچەوانەی شەرعی ئیسلامن و بڵێن دەیان پارێزین، کە لە داهاتوودا بە پشتیوانی الله تعالى هەموویان بە بەڵگە و بەوەی کەوا نوختە لەسەر پیت دابنێین دەخەینە بەر چاوتان.

هەندێکیشـــیان وا دەر دەبڕن بۆ نموونە؛ أبو إســـحاق الحويني کە لە گرتەیەکی ڤیدیۆیی پرسیاری لێ دەکرێ تێدەگەیەنرێت، دەڵێ ئەوە درۆیە و بوختانە بە من هەڵبەستراوە کەوا گوتوویانە من لەگەڵ ئەوەدام الإخوان المســـلمون یان هەر لایەنێکی تر بچنە دەنگدان و دەنگیان پێ بدرێ، دەڵێ چونکە دەنگدانم پێ شـــتێکی حەرام و قەدەغەیە وە داننانە بە شیرک و کوفر وە چوونە ناو ئەو شوێنانە زۆر خەتەرناک و ترسناکە.

## هەندێک لە بەڵگەکانی ڕای یەکەم لە ژێر چەند سەرباسێکدا:

**ســـەرباســـی یەکەم؛** بانگەوازی بۆ لای الله و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە واجب و پێویستی شەرعیین:

١-الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ۖ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ**﴾ **(النحل : ١٢٥)**

واتە: خەڵکی بانگ بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە لێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین وە لە گەڵیان بدوێ (موجادەلە بکە) بەچاکترین شێوە بێگومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانێ بەوانەی گومڕابوون و لایاندا لە ڕێگاکە وە هەر خۆشـــی زانایە بەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن.

٢-الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ**﴾ **(فصلت : ٣٣)**

واتە: کێ وتەی چاکتر و بەجێ ترە لەو کەســـەی (خەڵك) بۆلای الله بانگ دەکات وە کاری چاکە دەکات و دەڵێ بێگومان من لە پێڕی موسوڵمانانم.

واتە باشـــترین قســـە و گووتن بانگەوازییە بۆلای اللە تعالی و بۆلای تەوحید و اللە بەیەکگرتن و کار و کردەوەی چاک.

٣- اللـە تعـالی فەرموویەتی: **﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّـةٌ يَـدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَـأْمُرُونَ بِـالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ ۚ وَأُولَٰئِـكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (ال عمران : ١٠٤)**

واتە: با لە ئێوە تاقم و کۆمەڵێک هەبن خەڵکی بانگ بکەن بەرەو خێر و چاکە و فەرمان بکەن بە چاکە و ڕێ بگرن لە خراپە بەڕاستی ئەوانن سەرفراز.

جا دەڵێین ئەو پەڕلەمان و ئەنجومەنە کە ئەندامەکان دەبنە ئەندام لێی، باشـترین شـوێنە بۆ ئەوەی ئەو بانگەوازیەی لێ ئەنجام بدرێ و ئەو قســـە چاکانەی تێدا بکرێ و ڕێگری لە خراپەکان بکرێ.

٤-پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(مَنْ رَای مِنْكُمْ مُنْكَراً فَلْيُغَيرْهُ بِيَـدِهِ فَـإِنْ لَمْ يَسْتَطِيعْ فَبلِسانِهِ، فَإِن لَمْ يَسْتَطِيعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمانْ)**[١]

[١] پێشەوا موسلیم لە سەحیحەکەی لە -کتاب الإیمان- (ژ: ٤٩) هێناویەتیەوە.

واتە: هەریەکێک لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بە دەســت بیگۆڕێت ئەگەر نەیتوانی بە زمانی، ئەگەر نەیتوانی بە دڵی، ئەوەیان لاوازترین بڕوایە.

جا دەڵێین لە ناو پەڕلەمان خراپەکان زۆرن ڕا ستە وە یا ساکانی دژ بە ئیـسلام زۆرن، دەڵێین ئێمە لەوێوە بانگەوازی دەکەین بۆ بیروبڕوا و ڕێگری دەکەین لە بیروبڕوا خراپە کان و ئایدۆلۆجیەکانی تر و یاسا دەستکردەکان کە پەڕلەمان شوێنی دروستکردنی یاساکانە.

٥-گوایە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(ســـيكونُ أمراءٌ تعرِفونَ و تُنكِرونَ ، فمَنْ نابَذَهمْ نَجَا ، ومَنْ اعتزَلَهم سلَّمَ ، ومَنْ خالَطَهم هَلَكَ)**[1]

واتە فەرمان ڕەوایانێک دەبن باشــە و خراپە دەکەن و لێیان دەبینن، ئەوەی بەرهەڵســتییان بکا و بەگژ یا ندا بچێتەوە ڕزگاری بووە، ئەوەی لێیان دوور بکەوێتەوە ســـەلامەت بووە، ئەوەی لە گەڵیان تێکەڵ بووبێت لە ناو چووە و بە هیلاک چووە.

[1] هەرچەندە ئەو فەرموودەیان لە سەنەدی زوعف هەیە وەکو هیاجی کوڕی بیـستام کە زەعیفە وەکو خاوەنی -مجمع الزوائد- پێشـــەوا هەیســـەمی فەرموویەتی (٥/ ٢٧٥)، وە تەبەڕانی ئەو فەرموودەی گێڕاوەتەوە (ژ: ١٠٩٧٣) (١١/ ٣٩) تۆمار بووە، وە ئیبن ئەبی شەیبە بە هەمان شێوە (ژ: ٣٧٧٤٣) هاتووە لێی.

٦-پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(إِنَهُ يُسْــتَعْمَلُ عَلَيكُمْ أُمَراءُ فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُوْنْ فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِىءَ وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَــلِمَ وَلَكِن مَّنْ رَّضِيَ وَتابَع) قالوا: يا رسول الله ﷺ أفلا نقاتلهم قال (لا ما صَلَوا)**[١]

واتە: پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) بەســەرتانەوە فەرمانڕەوایانێک دەبن خراپە و باشــەیان لێ دەبینن ئەوەی پێی ناخۆشــبێت خراپەکانیان ئەوا بەری بووە لێیان و ئەوەی ڕێگری بکات لێیان ئەوە ســەلامەت بووە بەڵام ئەوەی ڕازیبێ و شــوێنیان بکەوێت خراپە و بە هیلاک چووە و لەگەڵ ئەوانە، گووتیان: ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) کوشــتار و جەنگیان لە دژ نەکەین فەرمووی (نەخێر مادەم نوێژ دەکەن).

جا ئەوانەی پاشــگری ئیســلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە دەڵێن بە بەڵگەی ئەو فەرموودانە ئێمە دەچینە ناو ئەو پەڕلەمانە تاوەکو ڕێگری بکەین لە خراپەکان، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگای هەڵوێســت وەرگرتنی موســڵمانانی بەرامبەر بە کار بەدەســتانی خراپەکار ڕوون کردوەتەوە، کە یەکێک لە ڕێگاکان بەرهەڵســتیکردنە لە ناو پەڕلەمان و لەوێوە ئەوە دەکرێ و دەستەبەر دەبێ و بەهێزتر دەتوانین ڕووبەڕویان ببینەو و مونابەزە[٢] یان بکەین.

[١] پێشەوا موسلیم لە -کتاب الإمارة- (ژ؛ ١٨٥٤) هێناوێتی.

[٢] مونابەزە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای ئەوە دێت هەم ڕازی نەبی بە شتەکە و هەم بیگۆڕی بە باشتر.

جا بابێین ئەو چەند بەڵگەیەی کە هینایانەوە جاریٚ هەڵوێستەی لەسەر بکەین و بزانین ئایە چۆن هەڵدەوەشێتەوە، بەڵگەکانیان لەجێیە یان هەڵیان بوەشێنینەوە.

## هەڵوەشاندنەوەی بەڵگەکان لە چەند خاڵێکدا:

١-باشترین پێشەنگ و ئەوانەی پەیڕەوییان لیٚ بکرێت پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)، هیچیان لێیان نەگێردراوەتەوە کە بووبنە ئەندام لە کۆڕ و پەڕلەمانەکانی دە سەڵاتدارانی سەردەمی خۆیان و دانیان نابێت بە سیستەم و یا ساکانیان و دابەزیبن لە بیروبڕوا یان و ڕێز یان لە کوفر و کافرەکان نابێت، ئینجا بانگەوازییان کردبێت، ئەوەی یوسف پێغەمبەریش (ﷺ) کە بە بەڵگە بۆ خۆیان دەیهێیننەوە لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن بووە، کاریشی بە فەرمانی الله کردووە، نەک دابەزیبێت بۆ فەرمان و کوفرەکانی دەسەڵاتدارانی سەردەمی خۆی، ئەوە لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ناوەشێتەوە و پارێزراو بوون لە شیرک و کوفر و گوناحە گەورەکان و مەعسوم بوون، ئەوەی گومانی ئەو باس و بابەتانەش بە پێغەمبەران ببات کە مەعسوم نەبوون لە شیرک و کوفر و گوناحە گەورەکان بە دڵنیاییەوە بیٚ بڕوا دەبێت.

٢-پڕۆگرامی بانگەوازی بۆ لای الله لەلایەن الله تعالی وە بڕاوەتەوە و کەس بۆی نییە قسەی تێدا بکات، کە بۆ هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتووە، کە دەستپێکی

بانگەوازیەکەیان بریتی بووە لە دوورکەوتنەوە لە هاوبەشی و کوفرکردن بە طاغوت و تەنها الله بپەرستن، ئەوەتا الله تعالى دەفەرمووێ: ﴿**وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ**﴾ **(النحل : ٣٦)** واتە: بێگومان و بەڕاستی بۆ هەر گەل و نەتەوەیەک ڕەوانەکراو و پێغەمبەرێکمان ناردوە پێیان گوتوون تەنها الله بپەرستن و لە طاغوتان دوورکەونەوە.

٣-ئەوەی ئەوان دەیڵێن پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە دەرەوەی پەڕلەمانەکان بە چاکتر کردوویانە، بەبێ هیچ دابەزینێک لە بیروبڕوا و ئاین، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) سەرمەشقن دەبێ چاویان لێ بکرێت و پەیڕەوی لە هەنگاو و ڕێبازەکانیان بکرێت، جا ئەوەی ئێوە دەیڵێن لە ناو پەڕلەمان دەیکەین لە دوای دابەزینتان لە عەقیدە و بیروبڕوا و چەند خاڵێکی سەرەکی ئیسلام، ئینجا ئێوە دەتوانن بە حیسابی خۆتان هەندێک قسە بکەن، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە دەرەوەی پەڕلەمانەکانی سەردەمی دەسەڵاتدارانی خۆیان کردویانە، زۆر بە باشتر بەبێ ئەوەی ئەو دابەزینەشیان تووش بوبێت.

٤-ئەو بەرهەڵستیەی لە توانایانە بیکەن سنورداره و بە بەرهەڵستی دانانرێت لە ڕوانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە، چونکە پەڕلەمان یاسا و سیستەمی هەیە، نابێت ئەندامەکە لێی

لابداد و دەربچێت، تەنها ڕێگای ئەوەی پێدەدرێت ڕای خۆی بڵێت، هەروەکو ئەندامەکانی تری دژ بە ئیســـلامیش ئەو ڕێگایانەیان پێدەدرێت، چونکە ئەوە یاســـای پەڕلەمانە و نابێ پێشـێلبکرێ، ئەوان کە کوفر بکەن و قسـە بە ئیسـلامیش بڵێن دەبێ گوێیان بۆ ڕابگری، لە کۆتایشـــدا بڕیارەکە زۆرینە یەکلایی دەکاتەوە و دەبێ بە ناڕاســـتەوخۆ پێی ڕازیبێت و جێبەجێشی بکات لە ژیانی ڕۆژانەیدا، ئەگەر پێچەوانەی شەرعیش بێت.

کەواتە ئەی ئەندام پەڕلەمان تۆ تەنها دەبیتە بەهاراتی خۆ شکردنی خواردن و شیوەکەیان، وە هیچی ترت پێ ناکرێت و ناتوانی لەوێ بەرهەڵســـتیەکی شـــەرعیانە بکەی، تەنها ڕای خۆت دەتوانی بڵێیت بە ســـنورداری لە ماوەیەکی کەم و کورت کە پێتدەدرێ لە چوار چێوەی یاسای پەڕلەمانەکەیانەوە.

٥-یەک دەنگی زانایان لەســـەر ئەوەیە کە ڕێگری کردن لە خراپە نابێت خراپەیەکی تری گەورەتری لێ بەدی بێت و گومانی زاڵ بەوە ببردرێت، هەرکاتێک گومانی زاڵ وابوو کە خراپەی مەزنتری لێ دێتەدی، دەبێ وازی لێ بێنی، بە دڵ ڕقت لێ بێتەوە و پێی ڕازی نەبیت، جا چوونە ناو پەڕلەمان چەندین خراپەی وەکو دابەزین لە بیروبڕوا و توشـبوون بە شیرک و هاوبەشی و کوفر و دابەزین لە خاڵە سەرەکیەکانی ئیسلامی لێ دەکەوێتەوە، بە

حیسابی ئەو خاوەن بۆچوونانە مەگەر خراپەیەکی بچووکتر لەوانەی لێ بکەوێتەوە قسەی لێ بکەن و لە دژی بوەستنەوە یان بیگۆڕن یان ڕای خۆیانی لەسەر بدەن.

٦-ئەو فەرموودانەی باسکران مەبەست لێیان فەرمانڕەوایە گوناحکارە موسڵمانەکانن، کە خراپە و ستەمیان دەکرد بەرامبەر بە گەل و نەتەوەکەیان، نەک کافر و بێبڕوایەکان.

## جا لێرەوە دوو بۆ چوون دەبێت باس بکرێت:

ئایە ئەوانەی پا شگری ئیسلامییان بە دوای خۆیانەوە لکاندوە فەرمانڕەواکانی پەڕلەمانیان پێ موسڵمان و شەرعییە؟

ئەگەر لە وەڵامدا گووتیان بەڵێ، ئەوان موسڵمان و شەرعین، کەواتە دەبێ ملکەچیانبن ئەوان وەلی ئەمرتانن و فەرمان ڕەواتانن، وە کارەکانتان بێ شەرعییە ئەگەر لە فەرمانیان دەربچن و ئەو کات دەبێ بە ڕێگای نهێنی گونجاو بە گوێرەی عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعە ئامۆژگاری بکرێن.

ئەگەر لە وەڵامیشدا گووتیان نەخێر، ئەوانمان پێ مو سڵمان نییە و ئەوان شەرعی نین ئەوە وەکو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەبێ بەرەنگاریان ببنەوە و پەیڕەوی سیرە و ژیاننامەی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) بکەن، وە بانگەوازیەکەی چۆن دەستپێکرد و چیکرد ئێوەش بەو شێوەیە دەست پێ بکەن و لەسەری بڕۆن.

ئەوەتا پێشــەوا نەوەویش -رحمە اللە- دەربارەی ئەو فەرموودەی کۆتایی کە لە ســەحیحی موســـلیم دا هاتبوو فەرموویەتی: **(أ نه لا يجوز الخروج على الخلفاء بمجرد الظلم أو الفسـق، ما لم يغيروا شـيئاً من قواعد الإسـلام)**واتە: دروســت نییە دەرچوون بەســەر خەلیفەکان تەنها لەبەر ســتەم لە فەرمانیان دەرچن، مادام هیچیان نەگۆڕیبێت لە بنەماکانی ئیسلام.

٧-ئەو فەرموودانە ڕێگا و شوێنی بەرهەڵستی دە سەڵاتی جێبەجێکردن زیاتر دەگرێتەوە لە (پا شا و سەرۆک و حکومەت و وەزیرەکان و دە سەڵاتدران)، نەوەک ئەوانەی کەوا یا سا دادەنێن و پەڕلە مان بگرێتەوە، بە تایبەتی ئەوانیش کە دەگرێتەوە لە وڵا تانێک کە حوکم بکەن بە ئیسلام و قورئان.

**سەرباسی دووەم؛** پێگەی جەماوەری بە چوونە ناو پەڕلەمان دابین دەکەین و حەسانەمان دەبێت:

١-الله تعالى فەرموویەتی: **﴿قَالُوا يَا شُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَاكَ فِينَا ضَعِيفًا ۖ وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَاكَ ۖ وَمَا أَنْتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ﴾ (هود : ٩١)**

واتە: گەلی شوعەیب بە پێغەمبەر شوعەیبیان گووت (ﷺ) ئەی شوعەیب زۆر تێناگەین لەوەی دەیڵێیت ئێمە تۆ لەناو خۆمان بە لاواز دەبینین ئەگەر هۆزەکەت نەبوایە بەرد بارانمان دەکردیت (چونکە) تۆ خۆت هیچ دەسەڵاتێکت نییە لە بەرامبەر ئێمەدا.

دەڵێن کەواتە شوعەیب (ﷺ) پێگەی بانگەوازیەکەی بەهێزتر کردبوو، هۆزەکەی نەیانتوانی دەریبکەن و بیکوژن، ئێمەش لە پەڕلەماندا پێگەمان بەهێز دەبێ و حەسانە بەدەس دەهێنین و بانگەوازی دەکەین.

٢-الله تعالى فەرموویەتی: **﴿قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾ (هود : ٨٠)**

واتە: لوت پێغەمبەر (ﷺ) بە گەلەکەی خۆی گووت کە دەورەیماڵیان دابوو لەو کاتەدا کە فریشتەکان چوبوونە ماڵی پێی گووتن خۆزگە لە بەرانبەر ئێوەدا هێزێکم ببوایە یان پەنایەکی قایم ببوایە پەنام پێ ببردایە (ڕێگریم) دەکردن.

دەڵێن لوت پێغەمبەر (ﷺ) باسی پاڵپشتی و پێگەی بەهێز دەکات بۆ بەرەنگار بوونەوەیان، ئێمەش دەمانەوێت ئەو پاڵپشـــتییە و پێگەیە بە دەســـتبێنین و بچینە ناو پەڕلەمان تاوەکو بانگەوازی بکەین.

٣-پە نادانی پێغەمبەری الله (ﷺ) لەلایەن مامی ئەبو تاڵیب بۆ بانگەوازیەکەی، وە پەنادانی زەیدی کوڕی دە سەنە بۆ ئەبو بەکری سدیق (رضي الله عنه) کاتێک مو سڵمانان هیجرەتی حەبەشـــەیان کردبوو ئەویش ویســـتی بڕوا و لە ڕیگا گەڕاندیەوە و پەنایدا، وە پەنادانی نەجاشی لە حەبەشە، لە کاتی کۆچکردنی موسڵمانان بۆ حەبەشە.

جا دەڵێن ئێمەش بەو چوونە ناو پەڕلەمانە خۆمان پەنا دەدەین بە عەلمانیەکان و بانگەوازی دەکەین، جا بابێین ئایە ئەو بەڵگانەش چۆن هەڵدەوەشـــێنینەوە و ڕاســـتن بەڵگەیان پێوە بهینرێتەوە یان نا.

**ئەو خاڵانەی خوارەوە بەڵگە هێنانەوەکانیان بۆ دروستبوونی ئەندام بوونیان لە پەڕلەمان و بەشداریکردنیان لە هەڵبژاردن هەڵدەوەشێنێتەوە:**

١-پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) پێکەگانیان و هێزەکەیان لە دەرەوەی داموودەزگا و پرۆسەکانی دەسەڵاتەکانی سەردەمەکانیانەوە بووە، بە هیچ شێوازێک دانەبەزیوون لە بیروبڕوا و بانگەوازیەکەیان لە بەرامبەر پەنادانیان.

٢-پێغەمبەری الله محمد (ﷺ) و هاوەڵەکانی (رضي الله عنهم) بە تەواوی بیروبڕوا و بڕیارە شەرعیەکانیان دەرخستووە و لێی دوو دڵ نەبوون لە بەرامبەر دەسەڵاتدارانی سەردەمیان و تەنانەت لە بەرامبەر ئەوانەی پەناشیان داون، هیچ مەرجێکیان قبوڵ نەکردووە کار بکاتە سەر بیروبڕوا و دینداریەکەیان، چوونە ناو پرۆسەی هەڵبژاردن لەسەرەتاکەیەوە هەر لە کۆمیسیۆنەوە دەست پێدەکات تاوەکو ڕێگایان پێ بدرێت کە بەشداری بکەن لە هەڵبژاردنەکە، دەبێ واژوو لە سەر ئەو خاڵانە بکەن و پێیان ڕازیبن کە بۆ کۆمیسیۆن هاتووە و بە یاسا دانراوە، کە هەڵقوڵاوی عەلمانیەت و دیموکراسیەتە و یاساکانی هەڵبژاردنی پێدەڵێن.

لە پاشان ئەگەر یەکێک لە ڕووداوەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) باس بکەین، ئەوەمان چاک بۆ بەدیار دەکەوێ کە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لە دوای مردنی مامی ئەبو تاڵیب و

وە فاتکردنی دایە خەدیجە (رضي الله عنها)، پێغەمبەر (ﷺ) چوەوە ماڵ دانیشـــت و قورەیـ شیەکان پاڵەپە ستۆی زیاتریان خـ ستە سەری و نەیدەتوانی تەواو لە ماڵەکە شی بێتە دەرەوە، ئەبو لەهەبی مامی ســۆزی خزمایەتی جوڵا و چووە ماڵێ و بە پێغەمبەری (ﷺ) گووت ئەی محمدی برازام برۆ ئەوەی لە کاتی زیندوێتی ئەبو تاڵیبی برام ئەنجامت دەدا بیکە، (بەرگری لە پێغەمبەری الله (ﷺ) کرد)، جا لە دوای ماوەیەک کە ئەبو جەهل و عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت پێیان زانیەوە چوونە لای ئەبو لەهەب و پێیان گووت برۆ بە محمدی برازات بڵێ و پرســیاری لێبکە بزانە شــوێنی عەبدولموتەڵیبی بابت لە کوێیە (بۆ ئەوەی هانی بدەن تاوەکو ئەو پاڵپشــتیەی ئەبو لەهەب لە پێغەمبەر (ﷺ) ببڕن)، ئەبو لەهەبیش بە قســەی ئەوانی کرد و چووە لای پێغەمبەری الله (ﷺ) گووتی ئەی محمدی برازام عەبدولموتەڵیبی باپیرەت لە کوێیە و لەگەڵ کێیە؟ پێغەمبەریش لە وەڵامیدا بەبێ دوو دڵی فەرمووی لەگەڵ گەلەکەیەتی، ئەبو لەهەب وەڵامەکەی بۆ ئەبو جەهـل و عوقبەی کوڕی ئەبی موعیـت بردەوە، ئەوانیش گووتیـان بـاشــە ئەبو لەهەب ئەوە وای دانـاوە عە بدولموتەڵ یب لە ناو ئاگرە، ئەبو لەهەبیش وا تێنەگەیشــتبوو، گووت یان ئەم جارە برۆ ڕاشکاوانە لێی بپرسە بڵێ ئایە عەبدولموتەڵیب لەناو ئاگرە؟ ئەویش هاتەوە لای پێغەمبەرمان محمد (ﷺ)، گووتی وەرە برازایەکەم، مەبەســتت پێ چییە عە بدولموتەڵیب لە ناو ئاگرە؟

پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ دوو دڵی فەرمووی نەوەک عەبدولموتەڵیب ئەوەی مردووشە لەسەر ئەوەی عەبدولموتەڵیب لە سەری مردووە بۆناو ئاگرن و لەناو ئاگرن، جا ئەبو لەهەب لەوێوە ڕقی هەستا و تووڕە بوو لە پێغەمبەری (ﷺ) سوێندی خوارد کە هەر دوژمن کاری بکات و بەردەوامبێت لەسەری.

جا بزانن پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لەو پەنادانەدا هیچ دابەزینێکی نەکرد لە سەرەتا و کۆتاییەکەیدا لە کافرکردنی عەبدولموتەڵیبی باپیری و شوێنی لە قیامەتدا دیاریکرد، ئەگەر هاتوو پەنادانەکەی خۆشی خستە مەترسی بەوەی ئەبو لەهەب چیتر پەنای نەدات، نەیفەرموو با وازبێنم بەرژەوەندی پەنادانەکەم نەخەمە مەترسییەوە، ئەو ڕاستییە ڕوون نەکەمەوە نەڵێم باپیرم کافرە و بە کوفر مردووە و لەناو ئاگرە، بەڵام ئەو لایەن و کەسانەی بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردن دەکەن و دەبنە ئەندام پەرلەمان زۆر بە ئاسانی دادەبەزن لە بیروبڕوایان و داندەنێن بە عەلمانیەت و دیموکراسی و واز دەهێنن لە خاڵە سەرەکییەکانی ئیسلام بە ئاسان، بە پاساوی (دابینکردنی بەرژەوەندی پێگەی بانگەوازی خۆ پەنادان) واز دەهێنن لە دروشمەکانی شەریعەتی ئیسلام، ئەلبانی لە یەک لە قسەکانی جوان دەڵێ دەڵێ: ئەوانە بە ڕیشەوە دەچنە ناو پەرلەمان بەڵام بەبێ ڕیش لێی دەردەچن، بە شمەک و جل و بەرگی موسڵمانانە و پابەندبوون بە شەعائیرەکانی ئیسلام دەچنە ناوی بەڵام بە شمەکی

کافر و بێ بڕوایان لە پانتۆڵ و چاکەت و بۆین باخ و وازهێنان لە دروشمەکانی ئیسلام لێی دێنە دەرەوە و کەمتەرخەم دەبن.

وە ئەبو بەکری سـدیق یش (رضي الله عنه) هیچ دابەزینێکی نەکرد لە بەرامبەر ئەوەی کە زەیدی کوڕی دە سەنە پەنایدا، بەڵکو کاتێ کە زەید ئامۆژگاری دەکات و دەڵێ وازبێنە لەو قورئان خوێندنە کە بە دەنگەوە دەیخوێنیت لەو ژوورەی ماڵەکەی خۆتدا و دەنگت دەچێتە دەر و قوڕەیشیەکان پێی رازی نین، من تۆم پەنا داوە، لە وەڵامیدا ئەبو بەکری سدیق دەڵێ من پەناکەی تۆم ناوێ و الله منی پەنا داوە منیش واز ناهێنم لە ڕێبازەکەم و بانگەوازەکەم.

وە ئەوانەی کۆچیـان کردبوو بۆ حەبەشـــەش نەک هیچ دابەزینێکیـان نەکردووە بەڵکو ڕاشـکاوانە بانگەوازەکەیان بە پاشـای حەبەشـەش گەیاند و لە ئەنجامدا نەجاشـی بووە موسڵمان.

**کەواتە بە کورتی و پووختی زانایانی ئیسلام دەفەرموون هەموو پەنادانێک دەبێ دوو مەرجی لێ بێتەجێ، ئینجا قبوڵ بکرێ، بۆ ئەوانەی کەوا دەڵێن ئێمە بانگەوازی دەکەین و کافر و موشریکێک یان هۆز و تیرەیەک یان لایەن و کەسێک بیەوێ پەنامانبدا:**

- **مەرجی یەکەم؛** دەبێ پێداگری لەسەر بیروبڕوا و واز نەهێنان لە پایە و دروشمەکانی ئیسلام بێنێتەجێ کەسەکە.
- **مەرجی دووەم؛** ئەنجام و ئاکامی پەنادانەکە دیاریکراو و ئاشکرابێت بەبێ بەرامبەربێت.

ئەوە لە پەرلەمان بە هیچ نەوع و شێوازێک نایەتەجێ و سەرەتا دادەبەزن لە بیروبڕوا و دروشمەکانی ئاین و ئیسلام، وە ئەنجامەکەشی لە دورروو نزیکەوە نادیارە و هیچ دیار نییە.

**سەرباسی سێیەم؛** هاوپەیمانی بۆ پشتگیری چەوساوان و ستەم لێکراوانی لێدەکەوێتەوە:

دەڵێن پێغەمبەری الله (ﷺ) لە پێش هاتنی ئیسلام و پێغەمبەرایەتی بەشداری کردووە لە (حلف الفضول)، کە لە ماڵی عەبدوڵای کوڕی جەدعان دا هەندێک لە قورەیشیەکان کۆبونەوە و ڕێکەوتن لە سەر پشتگیری کردنی ستەم لێکراوان و وەرگرتنەوەی مافەکانیان،

دەڵێن پێغەمبەریش (ﷺ) (لە دوای ئەوەی بووە پێغەمبەر) فەرمووی: ئەگەر لە ئیسلامدا بۆی بانگ بکرێم بەشداری دەکەم[1].

## هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەڵگە هێنانەوەشیان بەم شێوەیە دەبێت:

ئەو پشتگیرییە دەبێ بە گوێرەی یاساکانی شەریعەتی ئیسلام بێت و دیاریکردنی ئەوبێ، ئایە کێ ستەم لێکراوە و کێ ستەمکارە؟ ئەوانەی لە پەڕلەماندا بەشداری دەکەن لایەنەکانی دژ بە ئیسلام و عەلمانیەکان بە گوێرەی بیروبڕوای خۆیان پێناسەی ستەم لێکراو و ستەمکار دەکەن، بە جیاواز لە بیرکردنەوەی موسڵمانان، هەندێک جار لە لای ئەوان ئیسلام ستەمکارە و مافەکانی خەڵکی خواردووە، ئەو جۆرە هاوپەیمانێتییە بە سەربەخۆیی و لە دەرەوەی پەڕلەمان باشتر و چاکتر ئەنجام دەدرێت، زانایان دەفەرموون مانای ئەوە نەبووە پێغەمبەر (ﷺ) بەشداری کردبێت و بکات لە کار و ئیشێکدا کە دابەزین لە عەقیدە و بیروبڕوا و خاڵە سەرەکییەکانی ئیسلام و ئاینی ئیسلامی تێدا بووبێت، حاشا لە پێغەمبەر (ﷺ) کە کاری ئەوهای بیرلێکردبێتەوە یان بۆی چووبێ یان وای گووتبێت.

---

[1] پێشەوا بەیهەقی لە -السنن الكبري- (٦/ ٣٦٧) هێناویەتی.

**سەرباسی چوارەم؛** دەڵێن پەیڕەویکردن لە هەندێک بنەمای شەرعی ڕێگا دەدات بەشداربین لە هەڵبژاردن و دەنگدان و چوونە ناو پەڕلەمان:

**بنەمای یەکەم؛ (الأصل في الأشياء الإباحە).**

هە ندێکیان دەڵێن ئێمە پێمان وایە هیچ بەڵگەیەکی سـەد لە سـەدی بڕاوە نە هاتووە کە قەدەغەی ئەو کارە بکات، جا دە شڵێن بنەڕەت لە شتەکان ڕێگا پێدانە، دەڵێن لەبەر ئەوەیە کە ئێمە بەشداری دەکەین کەواتە ڕێگا پێدراراوە و لەسەر ئەسڵی خۆی ماوەتەوە.

**هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەڵگە هێنانەوەشیان بەم شێوەیە دەبێت:**

چە ندین بەڵگە هێندراوەتەوە لەسـەر قەدەغەبوونی بەشـداریکردن لە هەڵبژاردن، کە لە داهاتوو بە پشتیوانی الله تعالی لە بۆچوون و ڕای دووەم کە قەدەغەی دەکەن و بە حەرامی دادەنێن دەیخەینە بەر چاوتان و دەیخەینە ڕوو، کە بەڵگەکان ئەگەر بڕاوە و قەدعیش نەبن هەر هەموویان خۆ هەموو جار مەرج نییە بەڵگە فقهیەکان هەندێک جار زەنیشـن هەر بە بەڵگە دەهێندرێنەوە و ئەوە ناگرێتەوە کە بڵێین ئەسڵ و بنەڕەت تێیدا ڕێگا پێدانە.

**بنەمای دووەم؛ (مصالح المرسلە).**

ئەوانەی کە وا دەڵێن د یارە پێیان وایە کەوا بەڵگەی قورئان و فەرموودە و ئیجماع و کۆ دەنگییان لە دەست نییە، وە لە قیاسیان پێنەکراوە و ناکرێ لەبەر ئەوە هانا دەهیننە بەر ئەو بنەما فقهیە، کە دەڵێن بەڵگەی **(مصالح المرسلە)** بەکار دەهێنین، ئەو کات دەڵێن **(جلب المصالح ودرء المفاسد)** بەکاردەهێنین واتە هێنانی بەرژەوەندیەکان و ڕەتکردنەوەی خراپیەکان، دەڵێن بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و چوونە ناو پەڕلەمان چەند چاکە و بەرژەوەندیەکی پێدابین دەبێت و دابینی دەکات بۆ بانگەوازی گشت موسڵمانان.

**هەندێک لەو بەرژەوەندیانەی ئەوان دەیڵێن و پێی لەسەر دادەگرن ئەوانەن:**

١-دەڵێن ڕاگەیاندنی حوکمی ئیسلام لە باس و بابەتەکان و ڕەتکردنەوە و ڕەخنەگرتن لە یاساکانی پێچەوانەی ئیسلام و بیانوو بڕینی ئەندامەکانی و حوجە لەسەر کردنیان لە ڕێگای پەڕلەمانەوە دەبێت.

٢-دەڵێن پێشکەشکردنی پڕۆژە یاساکان کە دەبنە مایەی گۆڕینی یاساکانی دژ بە ئیسلام و شەریعەتی الله کە ئەوە فەرمان بە چاکەیە و ڕێگرییە لە خراپە.

٣-دەڵێن بەرژەوەندی دەستە بەربوونی حەسانە و پاراستنی ئەندامەکانی پەڕلەمان بۆ بانگەوازی پێدابین دەبێ.

٤-دەڵێن بانگکردنی دەسەڵاتداران و وەزیرەکان کە پێچەوانەی ئیسلام و موسڵمانان دەکەن بۆ ناو پەڕلەمان و متمانە لێسەندنەوە و لێپرسینەوەیان.

## هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەڵگە هێنانەوەش بەو خاڵانە دەبێ:

١-سەرەتا پێناسەیەکی کورت و پووخت و بەڵگایەتی مەسڵەحە دەبێ بکەین.

٢-لە پاشان هێنانەوەی هەندێک لەوتەی زانایان.

٣-هەڵوەشاندنەوەی خاڵ بە خاڵی ئەو بەرژەوەندییانەی هێندراوەتەوە.

### ▪ پێناسەیەکی کورت و پووخت و بەڵگایەتی مەسڵەحە:

**پێناسەی مەسڵەحە لە زمانەوانیدا:** مەسڵەحە لە زمانەوانیدا تاکی مەساڵیحە و لە سەلاحەوە هاتووە، کە پێچەوانەی فەساد و خراپەیە واتە چاکەیەتی، دژە و پێچەوانەیە لەگەڵ خراپە.

**پێناسەی مەسڵەحە لە زاراوەدا:** واتە بەرژەوەندی و چاکەکانی ڕەها نە ڕەچاوکراوە و نە پوچەڵیش کراوەتەوە و ڕەتکراوەتەوە.

## ئەمەش دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:

١-ئەوەی شەرع شاهێدی بە چەسپاندن و ڕەچاوکردنی داوە.

٢-ئەوەی شەرع شاهێدی پوچەڵکردنەوە و ڕەتکردنەوەی داوە.

٣-ئەوەی شـــەرع نە ڕەچاوی کردووە و نە پووچەڵی کردوەتەوە کە زانایان ناوی دەبەن بە (مصالیح المرسلة) هەندێک ناوی تریشیان بۆ هێناوە.

## ئایە بەڵگەیە (مصالیح المرسلة) و حوجەیە یان نا؟

زانایان ڕا جیاوازن لەو بارەیەوە:

- هە ندێکیان دەڵێن بەڵگەیە بە ڕە هایی، ئەوە ڕای پێشـــەوا یان ( ما لك و هە ند ێک لە شافیعیە کان)یشە.
- هەندێکیان دەڵێن بەڵگە نییە و بە بەڵگە دانانرێت، ئەوە ڕای پێشـەوا (الباقلاني و ابن الحاجب و امودي و ابن قدامة)یە.
- هە ندێکیش دەڵێن بە مەرج مەســـڵەحە بەڵێ بەڵگەیە ئەگەر مەرجە کانی لێ بێتەجی، ئەویش کە بگونجێ لەگەڵ بنەڕەتێکی کولی و ئەســـڵێکی کولی وە لەگەڵ بنەڕەتە شەرعیەکانی تردا تێک نەگیرێت بۆ بنەڕەتێکی بە شێتی و جوزئیش، ئەوە ڕای پێشەوا

(شـــافیعی) و هەڵبژاردەی پێشـــەوا (ابن برهان البغدادي)ە کە بە ســـێ مەرج دەڵێن (مصالیح المرسلة) بەڵگەیە:

١-زەروری بێت لە پێنج زەرورەتەکان.

٢-مەســڵەحەکە گشــتیبێت و هەموویی و کولیبێت تاوەکو ســوودەکەی هەموو موســڵمانان بگرێتەوە.

٣-(مصالیح المرسلة)کە دەبێ بڕاوە و قەدعیبێت، ئەوە ڕای زۆربەی زانایانی أصول الفقه.

جا لێرەدا هەندێک لە وتەی زانایان دەهێنینەوە، ئایە مەسڵەحە و مەفسەدە چ کاتێک کاری پێدەکرێ و ڕەچاو دەکرێ و تێدەڕواندرێ و لە چ کاتێکدا بەڵگەی پێوە دەهێنرێتەوە.

## ▪ هێنانەوەی هەندێک لەوتەی زانایان:

١-پێشـــەوا شـــاتیبی -رحمه الله- ئەو زانایە لێزانە دەربارەی (أصـــول الفقه) فەرموویەتی:

**(المصالح المجتلبة شرعا والمفاسد المستدفعة إنما تعتبر من حيث تقام الحياة الدنيا للحياة الأخرى، لا من حيث أهواء النفوس في جلب مصالحها العادية، أو درء مفاسدها العادية)**[1]

---

[1] -كتاب الموافقات- (٢/ ٣٧).

واتە: بەرژەوەندی و چاکەکانی بە شـــەرع هێندراون و خراپەکانی ڕەتکراونەتەوە و پاڵ نراون تەنها لە ڕووی ئەوەوە ڕەچاو دەکرێن کە ژیانی دونیا هەڵدەوەشێننەوە لە پێناو ژیانی دوایی، نەک لە ڕووی هەوا و هەوەس و نەریتەکان و ئەو شتە چاکە، یان ئەو شتە خراپە ئەوانە حیسابی بۆ ناکرێت.

کەواتە نابێ بە گوێرەی هەوا و هەوەس و مەســـڵەحەتی خۆت لێکی بدەیتەوە، دەبێ بە گوێرەی ئەوەی دونیا لە پێناو قیامەت دابندرێ بەرژەوەندیەکان بەو شـــێوەیە بهێنرێتەوە و خراپەکان بەو شێوەیە ڕەت بکرێتەوە.

٢-ئیبن تەیمیە -رحمه الله- فەرموویەتی: **(فأقوام قد ينظرون إلى الحســـنات فيرجحون هذا الجانب وإن تضمن سيئات عظيمة)**[1]

واتە: خەڵکانێک کە جێگای ئەوە نین قسە و شتیان لێوەربگیرێ لایەنە باشەکانیان پەسەند کردووە بەســـەر لایەنەکەی تردا ئەگەر خراپەی گەورەتریشـــی لێکەوتبێتەوە ئەوە لە شەریعەت ڕەتکراوەیە.

[1] -مجمع الفتاوى- (٢٠/ ٥٨).

هەر لە مجمع الفتاوى فەرموویەتی: **(فإن الشرك والقول على الله بلا علم، والفواحش ما ظهر منها وما بطن والظلم، لايكون فيها شىء من المصلحة)**[1]

واتە: بێگومان و بەڕاستی شیرک و هاوبەشی و قسەکردن لەسەر الله بەبێ عیلم و زانستی، گوناح و تاوانەکان و بەدڕەوشتی بە ئاشکرا و پەنهان وە زوڵم و ستەم، هیچێک لەوانە هیچ مەصڵەحەت و بەرژەوەندیەکی تێدا نییە و نابێ بکرێن.

لە پا شان لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی: **(أن المحرمات أحدهما مايقطع بأن الشرع لم يبح منه شيئاً لا لضرورة ولا لغير ضرورة : كالشرك، والفواحش، والقولي على الله بغير علم. والضلم المحض، وهي الأربعة المذ كورة في قوله تعالى: ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ فهذه الأشياء محرمة في جميع الشرائع، وبتحريمها بعث الله جميع ار سل، ولم يبح منها شيئاً قط، ولا فى حال من الأحوال، ولهذا أنزلت في السورة المكية)**[2]

واتە: بەڕاستی ئەو حەرامکراوانەی کە لە شەرعی ئیسلامدا بە بڕاوەیی حەرامکراون و هیچ ڕێگایان پێنەدراوە نە بۆ زەرورات وە نە بۆ غەیری زەرورات وەکو: (شیرک و هاوبەشی، گوناح و داوێن پیسی، قسەکردن لەسەر الله بەبێ عیلم و زانستی، زوڵم و

[1] -مجمع الفتاوى- (١٤/ ٤٧٦).

[2]-مجمع الفتاوى- (١٤/ ٤٧٠).

ستەمی ڕووتی سەد لە سەد) کە ئەو چوارە هەر چواریان لەو ئایەتەدا باسکراوە الله تعالی حەرامی کردووە، ﴿بڵێ بێگومان پەروەردگارم تەنها ئەو کردەوانەی حەرام کردووە کە زۆر بەد و خراپن ئەوانەی کە ئاشـــکران و ئەوانەش نهێنین وە گوناحی(حەرام کردووە) وە دەست درێژی بە ناهەق وە (حەرامی کردووە) شتێك بکەنە هاوبەش بۆ الله کە بەڵگەی بۆ نەهاتووە وە (حەرامی کردووە) کە بەدەم الله وە شـــتانێك بڵێن کە نایزانن﴾، بەڕاســـتی و ســـەد لە ســـەد ئەو شـــتانەی کە الله حەرامی کردووە لە هەموو شـــەریعەتەکان حەرامی کردووە، الله پێغەمبەرانی لەو پێناوەدا ناردووە (علیهم الصلاة والسلام)، حەڵاڵ نەکراوە و ڕێگا نەدراوە هیچیان لە هیچێک لە حاڵ و باڵەکان، وە ئەوەش لە ســـوڕەتە مەکییەکان دابەزێندراوە.

کەواتە ئەو شـــتانە حەرامکراون لە هەموو یاســـا و شـــەریعەتەکانی الله و حەرامکردنیان بڕاوەتەوە و هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) یەک دەنگ بوون لە سەریان، جا بە حاڵێک لە حاڵەکان بە هیچ نەوعێک لە جۆرەکان ڕێگا پێدراو نەبووە، چۆن دەکرێ ئەوە ببێتە پاساو بۆ توشبوون بە شیرک و هاوبەشی و دانان بە یاسای دژ بە ئیسلام و دابەزین لە عەقیدە و بیروبڕوا و گوناح و تاوانەکان لە خراپیەکانی هەڵبژاردن تێکەڵ بوونی نێر و مێ و فەساد و پارە سەرفکردنێکی بە ڕەهایی و زۆر و تەعەسوب و دەمارگیری و... ئەوانە

هەر هەمووی لە سەری تا بنی دیارە بە بەرژەوەندی و قازانج حیساب ناکرێن لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، تا ئەو بنەمایە شەرعیەی بۆ جێبەجێ بکرێ وەکو زانایان ڕونیان کردەوە.

لەپاشـــان دەبێ ئاگاداری ئەو بنەمایەشـــبین **(درء المفاســـد أولى من جلب مصـــالح)** کە لادانی خراپیەکان لە پێشترە لە هێنانی سوود و باشیەکان، ئەوەشیان دەبێ ڕەچاو بکرێ کە زانایان فەرموویانە، مەفســـەدەی شـــیرک و هاوبەشـــی و دابەزین لە عەقیدە و بیروبڕوا و گوناحی تێکەڵی نێر و مێ و مۆســـیقا ژەندن و پارە زۆر ســـەرفکردن و تەعەســـوبکردن و خەڵک ئازار و ئەزیەتدان و تانە و تەشـــەرە لە خەڵک گرتن و... ئا ئەوانە هەر هەموویان مەفا سید و خراپەی سەد لە سەد و ڕوونکراوەن لە شەریعەتی ئیسلامدا، جا لادانی ئەو مەفســـەدانە ئەولاترە لەوەی ئەگەر بەرژەوەندییەکی کەم یان زۆر دابینببێت بە چوونە ناو پەڕلەمـان و خۆ هەڵبژاردن، چونکە خۆ هەموو کـارێکی حەرامکراویش هەنـدێـک لە بەرژەوەندی و سوودی جاریوا هەیە تێدا دەبێ، مەگەر شیرک و کوفربێ ئەگەرنا ئارەق کە حەرامکراوە الله باســـی مەنفەعەت و ســـوودی کەمی دە کات، بەس دەڵێ گو ناح و تاوانەکەی (ئارەق و قومار) زیاترە لەبەر ئەوەی گوناحەکانی و خراپەکانی گەورەترە لە بەرژەوەندیەکان حەرام کراوە و نابێ توخنی کەون.

٣-ئیبن نەجار -رحمه الله- فەرموویەتی: **(الأمر إذا دار بين درء مفسدة، وجلبِ مصلحة، كانَ درءُ المفسدةِ أولى من جلبِ المصلحة)**[١]

واتە: ئەگەر کار و ئیشـــێک کەوتە نێوان لادانی خراپە و، هێنانی چاکە و باشـــە، لادانی خراپەکە ئەولاتر و لە پێشترە لە هێنانی چاکی و مەصڵەحەتیەکە.

٤-عیزی کوڕی عەبدوسـەلام -رحمه الله- فەرموویەتی: **(إذ اجتمعت مصـالح ومفاسـد، فإنأ أمكن تحصيل المصالح ودرء المفاسد فعلنا ذلك، أمتثالا لأمر الله فيهما، لقوله سبحانه: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾. و إن تعذر درء والتحصيلُ، فإن كانت المفسدةُ أعضـمَ من المصـلحة درأنا المفسـدة، ولا نبالي بفوت المصـلحة، قال الله تعالى: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا﴾ حرمهما لأن مفسـدتهما أكبر من منفعتهما. أما منفعة الخمر فبالتجارة ونحوها، وأما منفعةُ الميسير فبما يأخذه القامر من المقمور)**[٢]

واتە: ئەگەر بەرژەوەندیەکان و خراپە و مەفســـدەکان پێکەوە هاتن و کۆبوونەوە، ئەگەر توانیمان چاکەکان بە دەســـت بێنین و خراپەکانیش لابدەین، ئەوە ئەوەدەکەین، بە گوێرەی فەرمانی الله تعالی کە دەفەرمووێ: ﴿بەپێی تواناتان الله پەرســـتی بکەن﴾، خۆ ئەگەر

---

[١] پەرتووکی -شرح الكوكب المنير- (٤/ ٤٤٧).

[٢] پەرتووکی -قواعد الأحكام في إصلاح الأنام- (١/ ٨٣).

نە مانتوانی مەفســـەدەکە ڕەتکەینەوە و بەرژەوە ندیەکەش بێنین و دابینی بکەین، ئەگەر مەفســـەدە و (خراپە)کە گەورەتر بوو لە مەســـڵەحە (چاکە)کە، ئەوکاتە دەبێ مەفســـەدە (خراپە)کە وەلابنێین و گوێ بەوە نەدەین کە مەسـڵەحەت و بەرژەوەندیەکەمان لە دەست دەچێ، چونکە الله تعالی لەو ئایەتە فەرموویەتی: ﴿پرسیارت لێ دەکەن ئەی محمد (ﷺ) دەربارەی ئارەق و قومار پێیان بڵێ گوناح و تاوانی مەزنی تێدایە وە ســـوود و کەڵکیشـــی هەیە بۆ خەڵکی بەڵام گوناە و تاوانەکەی و خراپەکەی مەزنترە لە ســـوود و کەڵکەکەیان﴾ کەواتە لەبەر ئەوە الله تعالی هەردووکیانی حەرامکرد (ئارەق و قومار) چونکە خراپەکەیان گەورەتر بوو لە سوود و کەڵکەکە، قازانجی ئارەق تەنها تیجارەت و پارە پێ پەیداکردنەکەی قازانجە بەڵام هە موو شـــتەکانی تری خراپییە، وە قازانجی قوماریش ئەوەی بە قومار دە ســـتی دە کەوێ لەو کە ســـەی کە لێی دەباتەوە لە قومارەکە ئەوە قازانجی پارە و دونیا دەکات بەس ماڵی کە سێکی ویران کردووە وە حەرامیکی گەورەی کردووە.

کەواتە زور بەجوانی و ڕێکوپێکی لە وتەی زانایان بۆمان دەرکەوت ئەو بەرژەوەندیەی لە ئیســـلامدا ئیسـلام بە بەرژەوەندی دادەنێت دەبێ تەماشـا بکرێ و ڕەچاو بکرێ، بەڵام بەو مەرجەی مەفســـەدەیەکی گەورەی لێنەکەوێتەوە، ئەگەر مەفســـەدە و خراپەیەک لەگەڵ مەســـڵەحە و بەرژەوەندیەک کەوتنە بەرامبەر یەک دەبێ ئێمە خراپەکە ڕەتکەینەوە هەتا لە

تواناماندا دەبێ، ئینجا مەسڵەحەتەکەمان نەوێ و گوێی پێنەدەین، وە ئەگەر هەردووکیانمان پێ دابین بوو خراپەمان پێ ڕەتبویەوە و مەســـڵەحەتمان پێ دابین بوو ئەوە چاکە، ئەگەرنا دەبێ خراپەکە ڕەتکەینەوە لە پێشـــترە لەوەی چاکەکەی پێوە دابین بکەین، وە ڕاســـتە لە هەموو حەرام و تاوانێکیش جگە لە شیرک و هاوبەشی و کوفر، ئەوانی تر هەر هەموویان ڕێژەیەک لە بەرژەوەندی و قازانجی هەندێک کەس و لایەن و شتی تێدایە وەکو هی ئارەق و قومارەکە کە باســـمان کرد، بەڵێ چوونە ناو هەڵبژاردن و دەنگدان و چوونە پەڕلەمانیش ڕەنگە هەندێک بەرژەوەندی و قازانجی کەمی جوزئی لێدەکەوێتەوە بەڵام مەفســـەدەیەکی گەورەت تووش دەبێ کە شـیرک و کوفر و گوناحە گەورەکانە، نابێ تۆ بیکەی بەڵکو دەبێ مەفسەدەکە ڕەتکەیتەوە، وەکو زانایان فەرموویان و بنەماکان بەو شێوەیە جێبەجێ دەبن و دەهێندرێنەوە، جا خلیسـکانەکان و زیانەکانی بەشـداریکردن لە هەڵبژاردن ئەگەر تەنها بە نموونە هەندێکیان بێنینەوە بۆ بەر چاوی ئێوەی بەڕێز ئەوە چاک چاک دەیزانن کەوا ڕێگا دراو نییە لەبەر ئەوەی شیرک و کوفری لێدەکەوێتەوە، کە نابێ بە هیچ نەوع و شێوازێک هیچ شـــتێک بکرێ لە ڕێگای شـــیرک و کوفرەوە، ئەگەر بەرژەوەندی و قازانجێکیشـــی هەبێت والله أعلم.

## ▪ هەڵوەشاندنەوەی خاڵ بە خاڵی ئەو بەرژەوەندیانەی هێندراوەتەوە:

• بەرژەوەندی و چاکەی ڕاگەیاندنی حوکمی شەرعی کاتێک ئەوانە دەیڵێن (ئەندام پەڕلەمانەکان).

بەڵێ ڕاستە، ڕەنگە هەندێک شتی کەمیان لەوێوە پێکراوە و دەکرێ (یەعنی کە گووتراوە لە دانیشتنەکان)، بەڵام هیچیان ناگاتە ئەو شیرک و کوفرەی کە تووشیان دەبێ، داننان بە دیموکراسیەت و عەلمانیەت و یاسا دەستکردەکانی دژ بە ئیسلام و یاساکانی الله تعالی و واز هێنان لە حوکم و یاساکانی الله تعالی و سوێند خواردن بۆ پاراستنی ئەو یاسایانەی دژ بە ئیسلام و الله تعالی و.. ئەوانە دەبێ وازی لێبهێندرێ، چونکە ئەو شیرک و کوفر و گوناحە گەورانەی پێ دابین دەبێ، هەتا ئێستاش نەبیستراوە هەر کەس و لایەنێک بەو حاڵ و ڕێگایانە چووەتە ناو پەڕلەمانەکانیش نەیتوانیوە شیرک و کوفرەکان بنبڕ بکات و نەیهێڵێ و ڕەتی بکاتەوە بە تەواوەتی، تەنانەت نەیانتوانیوە ڕیبا و سووەکانیش ڕەتبکەنەوە بەڵکو تەنها توانیویانە جاروبار قسە لە هەندێک باس و بابەت و شتەکان بکەن، نەیان توانیوە ڕەشیکەنەوە و نەیهێڵن و بیگۆڕن.

کەواتە چوونە نــاو ئەو پڕۆســـەیەوە بە دڵنیــاییەوە ئەوەی لێنــاکەوێتەوە، ئەو بنەمــا شـــەرعییانەی بۆ جێبەجێ ببێ و ڕێگا بدرێت، وە خەون و خەیاڵە لەو ڕێگایە موســـڵمان بتوانێت حوکمی الله بچەسپێنێتەوە و حوکمی شەیتان و پێڕەکانی نەهێڵێت و ڕەشکاتەوە.

- بەرژەوەندی چاکەی پێشکەشکردنی پڕۆژە یاساکان کە ببنە مایەی گۆڕینی یاساکانی پێچەوانە و دژ بە شەرعی الله.

ئا ئەوانەش نەکراوە و ناکرێت ئاسان، چونکە ئەو کارەش تەنها خەیاڵ پڵاوییە و تاوەکو ئێســتا لە هیچ وڵات و شــوێنێک نەتواندراوە کارێکی بەرچاو و دیار لە یاســا دیارەکان بکرێت و ڕووبدات و یاسای دژ بە ئیسلام نەمێنێ و یاسایەکی ئیسلامی شەرعی لەجێ جێگیر بکرێ.

## لە ئەگەری هاتنەجێی ئەو کارەش ئەندامەکان تووشی ئەو خراپیانە دەبن پێش ئەوەی ئەو کارە ئەنجام بدەن:

١-دەبێت دەنگ کۆبکەنەوە بۆ پڕۆژە یاســاکان کەوا پێشــکەشــی دەکەن، بەدوایدا بگەڕێن لەلای عەلمانی و کەسەکانی تر کە لەناو پەڕلەمانن، ئینجا ئەو دەنگە کۆبکەنەوە و بیانهێننە سەر خەت و ڕێگا پشتگیرییان لێ بکرێ.

٢-دەبێ دانبنێن بەو کار و یاسایانەی تەحامول و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیان، کە ئەوەشیان خراپەیەکی ترە و بە گوێرەی یاسای ئیسلام سنوردارە تەحامول کردن لەگەڵ کافر و بێ بڕوا و ئەوانەی دژ بە دینن، دەبێ بە گوێرەی شەرع بێ.

٣-لە ئەگەری گۆڕینی یاساکەش، ئەو سیستەمە ماف دەداتە ئەوانەی دەنگەکەی پێ دەدەن لەگەڵیدابن، ئەوانی تریش خەڵکێک لە عەلمانی و خەڵکەکانی تر لە دژی بوەستنەوە، ئەوانیش ئەو مافە یان پێ دەدرێ کەوا بێشەرعی و کوفریەکانیان بڵێنەوە و لێنگەڕێن کوفری و بێشەرعیەکانیش بگۆڕدرێ.

لە پاشان لەو وڵاتانەی کە سیستەمی عەلمانیەتی لێ بەر قەرارە و دان بە یاساکانی دەنرێت و تۆ دان دەنێیت بە عەلمانیەتیەکەی ئەوان و چەسپاندنی ئەو یاسایە، لە پاش ئەوکاتەوە تەنها بە دەست پەرلەمانەکەش نییە دیارە سەرۆک هەیە لە وڵاتەکان ئەوانیش یاسایەکن دەبێ ئەو بچێ واژووی بکات، ئینجا ئایا ڕەتیدەکاتەوە یان واژووی دەکات یان هەندێک بڕیاری نا شەرعی و بێ شەرعی و کوفری و شیرکی هەیە هەر ئەو دەتوانێ بڕیاری لە سەر بدا و جێبەجێشی بکات لەسەر خەڵکەکە.

کەواتە ئەو بەرژەوەندیەش مسۆگەر نییە و تەنها خەیاڵ و ئومێدە زۆرجاران نەهاتوەتەجێ و ناشـــهێتەجێ، تەنها قســـەیەکە خاوەن ئەو بۆچوونانە دەیکەن و بە بیانوو دەیهێننەوە بۆ ئەوەی خەڵکەکە دڵ ڕازی بێ و دەنگیان پێبدا.

- بەرژەوەندی و بە دەســـتهێنانی حەســـانەی ئەندامێتی پەڕلەمانەکەی لێدەکەوێتەوە و ئەویش بۆ بانگەوازی بەکاری دەهێنێ.

لە پێشتر تیشکمان خستەسەر بەس ئێستاش بە کورتی دەڵێین ئەو حەسانەیە بەو ڕەهاییە نییە بەڵکو ســـنوردارە، زۆرجاریش بینراوە کە ئەندامەکە نەپارێزراوە و قســـەی پێ گووتراوە و ڕاگیراوە و لێیدراوە.

**لە زۆربەی دەســـتورەکان و وڵاتەکانی عەلمانی ئەو حەســـانەیە تەنها لە بـازنە و ســـنوری تەســـکی نـاو پەڕلەمـانەکەدایە، لە بـاس و بـابەتە دیاریکراوەکاندا بەو مەرجانە ڕێگای پێ دەدرێ:**

١-تەنها بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی ناو پەڕلەمانە بە سنورداری، نەک بۆ بانگەوای ڕەهایی لە هەر شوێن و جێگایەک بیەوێ.

٢-دەبێ ئەوەش کە کرا باس و بابەتێکی دیاریکراوبێ لە شـــوێنی دیاریکراو کە ناو پەڕلەمانە.

کەواتە کەســـی بـانگەوازکـار بۆی نییە لە هەر شـــوێنێکبێـت ئەوە بەکـاربهێنێ بۆ بانگەوازیەکەی و خۆی پێوە پاپەند بکات و ســـەرەڕای ئەوەش کە ئەو هەموو دابەزینەی لە بیروبڕوا و عەقیدە و ئیســـلامەتی کردووە، هەرکاتێکیش دڵیان بیەوێ ئەندامیەتیەکەی دەتوانن بخەنە مەترســـی و لێشـــی بســـتێننەوە بە بیانووی جیا جیا، وە نموونەی زۆری واقیعیشمان هەیە کە ئەندام پەڕلەمانەکان تەنانەت سەرۆک و هەر پلەدارێک لابدەن کە بە دڵیان نەبێ و حەسـانەکەی لێ بسـتێننەوە، وە سـەیر و سـەمەرەیی لەوەدایە کە بڕوا بکەی ئەبو جەهل پەنای پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی بدات تاوەکو باسـی شـیرک و کوفرەکانیان بکەن و هەوڵی شـــکاندنیان بدەن و بتەکانیان لەناو ببەن، بگرە ئەوە بە فیلمی خەیاڵیش ئاســـان دەرناهێندرێ، نەوەک بە واقیعی ڕووبدا و بێتەجێ، وە زۆربەی جاران ئەندامەکان بانگەوازییان لەبیر دەچێتەوە لەبەر ســـیاســـەت و تێکەڵی نێر و مێ و گوناحەکانی تر خۆچواندنیان بە عەلمانیەکانەوە لە جل و بەرگ و هەڵسـوکەوت و شـێوە و دیمەن و...هتد ئاگایان لە بانگەوازی و لای الله و عیبادەت و تەقوا و دینداری نامێنێت، لە سەر ڕای ئەو کەسانەی کە ئەوانە هەر بە موسڵمانیش دەمێننەوە والله اعلم.

- بەرژەوەندی لێپرســـینەوەی دەســـەڵاتدار و وەزیرەکانی حکومەت و لێســـەندنەوەی متمانەیان پێوە دابین دەبێ، هەریەک لەو وەزیر و دەسەڵاتدارانە ئەگەر کار و شتێکی

بێشـــەرعی و دژ بە ئیســـلام یان کرد ئێمە بانگیان دەکەین بۆ پەڕلە مان و لەوێوە لێپرســـینەوەیان لەگەڵ دەکەین و دوایە متمانەیان لێدەســـتێنینەوە، ئاوها بە ســـووک و سانایی بەبەر گوێچکەی خەڵکیدا دەدەن.

ئێمە دەڵێین ناتوا ندرێ وەزیر یان هەر بەرپرســـێکی حکومی لەبەر پێچەوانەکردنی شـــەرعی الله یان کوفر و شـــیرک کردنی بانگ بکرێت و لێپرســـینەوەی لەگەڵ بکرێت، بەڵکو تەنها لەکاتی پێشـێلکردنی یاسـا و دەسـتوری عەلمانی ئەو یاسـایەی کە پەڕلەمانە عەلمانیەکە دەریکردووە دەتواندرێ ئەو ڕێگایە بگردرێتەبەر، وە چەند ڕێگا و شـــوێن و ســـیســـتەمێک و چوارچێوەیەکی دیموکراســـیانەی بۆ دانراوە کە بانگهێشـــتی پەڕلەمان دەکرێت و لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەنجام دەدرێت.

**جا ئەو خراپیـانەی خوارەوەی لێـدەکەوێتەوە ئەو کـار و ئیشــە تـا بڵێین بەرژەوەندیەکی وا بچووکی پێ دابین دەبێ:**

١-دانپێدانانی یاسا و دەستورە عەلمانی و دیموکراسیەکە و کارپێکردنێتی، کە دەبێ لە چوار چێوەی ئەوەوە بانگهێشت بکرێت.

٢-وەک ئەوە وایە بە وەزیرەکە یان دەســـەڵاتدارەکە بگووترێ ئەوە بۆ پابەند نابیت بە گوناحەکانت و پێشـــێلی خراپەکانت کردووە، چونکە ئەو یاســـا و بڕیارانەی هەن جگە لە

ئیسلام هەمووی نەفامیەتە و خراپییە و تۆش پێی دەڵێیت بۆ پێیوە پابەندنیت بۆ لێی کەمتەر خەمیت بۆ جێبەجێی ناکەی خاڵەکانی دژ بە الله و بە پێغەمبەر (ﷺ) و بە شـــەریعەتی ئیســلام، لە واقیعی حاڵدا ئەوە ڕوودەدات و مەبەســت لێی ئەوەیە و لێپرسـینەوەکە لەسـەر ئەوە دەبێ.

کەواتە هیچ بەرژەوەندیەکی تێدا نییە و نابینرێت خۆ ئەگەر یاســاکە هیچ پێچەوانەییەکی شـەرعی ئیسـلامیشـی تێدا نەبێت و موافیق بێت لەگەڵی هەر وەکو یاسـایەکی دەرچوو لە پەڕلەمان و سـیسـتەمی دیموکراسـی و عەلمانی کاری پێدەکرێت نەک وەکو شـەرعی الله، ســەرەڕای ئەوەی کە دابەزین لە بیروبڕوا و ئاین و دانان بە یاســای دەســتکردی لێدەکەوێتەوە بۆ ئەندامەکە.

ئەگەر تەنها ڕووداوێکی واقیعی چەند ســاڵێک بەر لە ئێســتا بخەینە بەر چاوتان ئەو ڕاستیەمان بۆ ڕووندەبێتەوە.

لە ڕووداوێکی واقیعیدا لە کاتی ســلفەی عەقاردا لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە، یەکێتی زانایانی کوردســتان دوو مامۆســتایان ڕەوانەی لای وەزیری دارایی ئەو کات کرد کە لە پشــکی یەکێتی بوو، پێیان گوتبوو ئەو زیادە و فائیزە هەڵبگرە لەســەر ســلفەی عەقارات تاوەکو زۆرینەی خەڵکی سوودی لێوەربگرن، ئەو زیادەیە لە شەریعەتی ئیسلام حەرامە و

بە ڕیبا دادەنرێت، وەزیرەکەش ڕاشــــکاوانە و بوێر بوو بوو لە بیروبڕوایە عەلمانیەکەیدا، لە وەڵامیا ندا گوتبووی ئێمە عە لمانین لەلای ئێمە زیادە حەرام نییە و هیچی لەســـەر نییە، ئەگەر هەر ناوێکی تریشی لێبێنین، تەنها سیا سەتکردنە و فێڵکردنە لە خەڵکی، هەرکاتێک سیســـتەمەکە بووە ئیســـلامی و کار بە شـــەریعەت کرا، ئەوە بۆتان هەیە ئەو داوایە بکەن، ئەوکات منیش لێرە نابم چونکە عەلمانیم.

یەکێک لە مامۆستایە بەڕێزەکان بۆ خۆی بۆ منی گێڕایەوە، کە لەو ڕووداوەدا بەشدار بوو بوو، ئەو ڕاشـــکاوانەیەتیەی ئەو وەزیرە عەلمانیەی پێگەیاندین، بەڵێ ڕاســـتی گوتووە، ئێ باشە لەوە ڕاشکاوانەتر چییە؟ بۆچی بۆیان پینە بکەین و ڕاستیەکان لە جەماوەر بشارینەوە؟ کە دوو جار گوناحبار دەبین.

هەر لێپر سینەوەیەکیشی لێبکرێت لە کۆتایدا هەر پابەند کردنێتی بە یا سایەکی دەرچوو لە پەڕلەمانێکی بێشەرعی و عەلمانیەتدا.

**بنەمای ســـێیەم؛ (ما لا يتم الواجب إلا به فهو واجب)** واتە: کارێک کە واجبەکەت بۆ ئەنجام نادرێت بە ئەنجامدانی ئەو کارە نەبێت ئەو کارەشت لەسەر واجب دەبێ (وەکو واجبەکە).

جا ئەوە دەبێ لە سەرەتا بزاندرێ زانایان بە ڕەهایی ئەوەیان نەگوتووە، بەڵکو لە کاتی هەڵوەشاندنەوەکە ڕوونی دەکەینەوە ئەوەیان چۆنە و چۆن جێبەجێ دەبێ، هەندێکیان دەڵێن گەڕاندنەوەی حوکمی شەرعی و چەسپاندنی واجبێکی شەرعییە (کەس دوو دڵ نییە لەو قسەیە و ڕاستە) دەڵێن لە بار و زروفەکانی ئەمڕۆدا تەنها ڕێگا بریتییە لە خۆهەڵبژاردن و ئەندامێتی پەڕلەمان، کەواتە گەڕاندنەوەی حوکمی شەرعی تەنها لەو ڕێگایە دەکرێ کە خۆ هەڵبژاردن و پەڕلەمانە، کەواتە هەڵبژاردن و چوونە ناو پەڕلەمان واجبێکی شەرعییە و پێویستییە.

## ئەو بەڵگە هێنانەوەش بەو شێوازە دەتوانین هەڵبوەشێنینەوە:

دەڵێین ڕاست نییە، یەکەم جار **(ما لا يتم الواجب إلا به فهو واجب)** ئەوە زانایان فەرموویانە **(تكون هذِهِ في المباحات لا فى المحضورات)** ئەو بنەمایە لەو کار و ئیشانەی کە ڕێگا پێدراون (حەڵاڵن) جێبەجێدەبێ نەوەک لە کارە حەرام و قەدەغەکراوەکان.

جا گومانیشی تێدا نییە بەرپاکردنی حوکمی الله و چەسپاندنیشی واجبێکی شەرعییە، بەڵام ناکرێت لە پێناو دابینکردنی ئەو واجبە شەرعییە ڕێگای بێشەرعی بگرینەبەر، هەروەکو لە باسی مەسلەحەدا باسمانکرد بە دوور و درێژی هەندێک لە وتەی زانایەکانمان هێنایەوە، بەڵکو دەبێ لەسەر ڕێباز و ڕێگای پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) کۆتای

هەر هەمووشیان محمد المصطفی (ﷺ) بڕۆین و بکرێ، ئەویش حوکمی الله بچەسپێنین و بەر پای بکەین، ئەوەی ئەمڕۆ دەکرێت بە باجی کەمتر ئەبو جەهل و سەرانی کوفری قورەیشی بۆ پێغەمبەری الله یان (ﷺ) دەکرد و ڕێگایان پێدەدا، بەڵام پێغەمبەری الله (ﷺ) ڕێگای پێگەیاندنی موسڵمانان لە بواری بیروبڕوا و پەیداکردنی پێگەیەکی دروستی پۆلاینی پتەو لە ناو جەماوەردا بە تێگەیاندن لە الله بە یەکگرتن و دوورکەوتنەوە لە شیرک و کوفر و کوفرکردن بە طاغوت و پێگەیاندنیان لە بواری جەستەیی و بانگەوازیکردن و کۆچکردن لەپێناو الله تعالی و بیروبڕوایەکەی و بەرەنگاربوونەوە و جەنگ و جیهاد و کوشتار کردنی هەڵبژارد، بۆ چەسپاندنی حوکمی الله و ڕەتکردنەوەی حوکمی نەفامیەت و شیرک و کوفر.

جا بۆ جارێکیش نەبووە پێغەمبەری الله (ﷺ) حاشاکی ئەو دابەزیبێت لە بیروبڕوا و ئاینەوە، وە بووبێتە ئەندامی دارونندوە و پەرلەمانەکەی قورەیش لە پێناو چەسپاندنی حوکمی الله.

لە واقیعدا سەلمێنراوە کە چەسپاندنی حوکمی الله ی پێناکرێت، بەڵکو دۆڕاندنی حوکمی الله ی پێبەدیدێت و بە هیچ شێوازێک ئەو بنەمایە ئەوە ناگرێتەوە و نابێتە بەڵگە.

**ســـەر باســـی چوارەم؛** بەڵگە هێنانەوە بە وتەی هە ندێک لە موفتی و توێژەراوانی

سەردەم:

دەڵێن ئەوە تا فتوای موفتی و زا نا یا نمان بە دەســـتەوەیە کە ڕێگا دەدەن بە هەڵبژاردن و دەنگدان و چوونە ناو پەڕلەمان، وەکو؛ (الشـیخ أحمد شـاکر المحدث مصـري، عبد العزیز بن باز (موفتی پێشـوتری سـعودیا)، محمد بن صـالح العثیمین (زانای سـعودی)، محمد نـاصر الـدین الألبـاني (شـــارەزا لە فەرموودە)، دکتور عبـد االله عزام، ...هتـد).

**هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەڵگە هێنانەوەیەش بەم شێوەیە دەبێت:**

سـەرەتا دەڵێین ئەگەر لە پەرتووکەکانی (أصـول الفقه) وردبینەوە بە هیچ شـێوازێک یەک زا ناش نییە بڵێ قســـە و وتەی زا نا یان و موفتیە کان بەڵگەیە، بەڵکو ئەو کات لێیـان وەردەگیر ێت کە متمانەی زانســـتیـیان هەبێت کە لەو بوارەدا زا نان و بەڵگەشـــیان بە دەســـتەوەبێت بەڵگەکانی شـەرعی؛ قورئان و سـوننە و ئیجماع و قیاس، لە کاتی نەبوونیان بنەماکانی تری وەکو؛ **(مصالح المرسلة)** کە بەلای هەندێکیانەوە بەڵگەیە، ئەگەر وتە و فتوا هی ئەوانە هێنراونەتەوە و خاوەن ئەو ڕایە دڵیان پێ خۆشـــدەبێ و کاری پێدەکەن و دەڵێن ئەوە تا ڕێگا مان هەیە و ئەو زا نا یانە فتوا یان بۆ مان داوە، لێیان ورد ببیتەوە ئەوە دەردەکەو ێت کە تەواو شـــارەزای هەڵبژاردن و دەنگدان و ســیســـتەمی عە لمانیەت و

دیموکراسی نەبوون و بەو مەرجانەی داشیان ناوە نە دێتەجێ و نە تاوەکو ئێستاش لە هیچ ولآت و شوێنێکی دونیا هاتوەتەجێ.

**با بە کورتی سەرنجی وتەی ئەو ناو براوانە بدەین و هەندێکیان بێنینەوە و ئینجا ڕوونکردنەوەی لەسەر بدەین:**

١-الشيخ أحمد شاكر مصري گوتوویەتی: **(وإذ ذاك سيكون السبيل إلى ما ينبغي من نصر الشريعة ، السبيل الدستوري السلمي : أن بث في الأمة دعوتنا ، وتجاهد فيها ونجاهر بها ، ثم نصا ولكم عليها في الانتخاب ، ونحتكم فيها إلى الأمة ، ولئن فشلنا مرة فنستنفوز مرارة ، بل سنجعل من إخفاقنا ، إن أخفقنا في أول أمرنا ، مقدمة لنجاحنا ، ما سيحفز من الهمم ، ويوقظ من العزم ، وبأنه سيكون مبصراً لنا مواقع خطونا ، ومواضع خطئنا ، وبان عملنا سيكون خالصة لله وفي سبيل الله فإذا وثقت الأمة بنا ، ورضيت عن دعوتنا ، واختارت أن تحكم بشريعتها ، طاعة لربها ، وأرسلت منا ثوابها إلى البرلمان ، فسيكون سبيلنا وإياكم أن نرضى وأن ترضوا بما يقضي به الدستور ، فتلقوا إلينا مقاليد الحكم ، كما تفعل كل الأحزاب ، إذا فاز أحدها في الانتخاب ، ثم نفي لقومنا إن شاء الله ما وعدنا ، من جعل القوانين كلها مستمدة من الكتاب والسنة . ومن بشائر الفوز وأمارات النجاح ، بإذن الله ، أن رأينا كثيرة من ذوي الرأي يقولون بقولنا ، ويتمنون أن تستجاب دعوتنا ، ويرجون أن تعود الأمة إلى**

**دینها وشریعتها ، وأن بعض الجمعيات القوية جعلت هذا المقصد من أهم مقاصدها)[1]**

واتە: ئەو کاتە ڕێگەی سەرخستنی شەریعەت دەستەبەر دەبێت لە ڕێگەی دەستووری ئاشتیانە : بانگەوازەکەمان بەناو ئوممەتدا بڵاو بکەینەوە و، لە پێناویدا تێ بکۆشین و، ئاشکراشی بکەین، ئینجا ململانێشی لەسەر بکەین لە هەڵبژاردنەکاندا ئوممەت بکەینە دادەوەر، وە ئەگەر جارێکیان فەشەل بێنین بە دڵنیاییەوە چەندین جاری تر دەیبەینەوە، بەڵکو لە دۆڕاندنەکانمان سەرکەوتن دروست دەکەین بەوەی هیممەتمان پێی بەرز دەکەینەوە و جۆش و خرۆشمان بە ئاگا دێنینەوە و، دەیکەینە مایەی دۆزینەوەی شوێنی هەڵەکانمان و، بەوەی کارەکانمان بۆ الله پاك دەکەینەوە.

جا گەر ئوممەت متمانەی پێکردین و بە بانگەوازەکەمان ڕازی بوو، بە شەریعەتەکەی ڕازی بوو حوکم بکات وەك گوێڕایەڵییەك بۆ پەروەردگاری، نوێنەرانی ئێمەیان ڕەوانەی پەرلەمان کرد، ئەو کاتە ڕێبازمان بریتی دەبێت لەوەی هەموو لایەکمان بە دەستور ڕازی بین و، جڵەوی دەسەڵاتمان تەسلیم بکەن، وەکو هەموو حیزبێك لە کاتی سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکاندا وادەکات، ئینجا وەفادار دەبین بەرامبەر نەتەوەکەمان – ان شاء الله – لە

[1] لە پەرتووکەکەی دکتور عمر سليمان الاشقر (ل: ١٣٦) -حكم المشاركة في الوزارة والمجالس النيابية دار النفائس- تەبعەی دووەم ساڵی (١٤٢٩) کۆچی و (٢٠٠٩) ی زاینی هاتووە.

هەر بەڵێنێك كە پێمان دابن، لەوەی یاسـایەكان سـەرجەمی وا لێ دەكەین لە قورئان و سوننەتەوە سەرچاوە بگرن.

وە لە موژدەكانی سـەركەوتن و نیشـانەكانی بردنەوەمان بە ئیزنی الله، ئەوەیە كە زۆرێكمان لە خاوەن ڕا بینیوە هەمان قسـەی ئێمە دەكات و ئاواتە خوازن نزاكانمان قەبووڵ بێت، ئومێدەوارن ئوممەت بگەڕێتەوە بەرەو ئایین و شەریعەتەكەی، هەندێك لە دەزگا بەهێزەكان ئەم مەبەستەیان كردۆتە گرنگترین مەبەستەكانی.

**جا ئەگەر ئەو قسـەی الشـیخ أحمد شـاكر كە بۆمان هێنانەوە سـەرنجی بدەین ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت:**

١-ئەو كات و شوێنەی كە فتوای بۆ داوە زۆر جیاوازە لەگەڵ هی ئێستا.

٢-كۆمەڵێـك قەیـد و مەرجی دانـاون، كە تـاوەكو ئێسـتـا لە هیچ كەس و لایەنێـك نەهاتووەتەجێ و ئاسانیش نییە هاتنەدیی ئەگەر نەڵێین مەحاڵە و هەر نابێت.

٣-مەبەسـتی سـەرەتا و كۆتایی دەردەكەوێت كە چەسـپاندنی حوكمی الله بووە و گەڕاندنەوەی شكۆی موسڵمانان بووە.

هەرچەندە نەپێكاوە، چونكە ئەو كارە تاقیكراوەتەوە نە لایەنەكان توانیویانە ئەو مەرجانە بێننەجێ و نە ڕێگاشـیان پێدراوە، بەڵكو شـكۆ و ڕێزیان شـكێندراوە و ناموسـیان براوە و

خوێنیان ڕژاوە و دەســەڵاتیان لێوەرگیراوەتەوە، لەگەڵ ئەوەدا چارەکێکی ئەوەی أحمد شـاکر گوتوویەتی نەیانکردووە و داوایان نەبووە، جا ئەوەی أحمد شـاکر گووتی لە سـاڵی پەنجایەکان بووە، بە دڵنیاییەوە ئێســتا ئەوەی لە میسرــ ڕوودەدا و ڕوو یدا لە دوای هەڵبژاردن، وە مورسی و ئەو پرۆسەیەی هەڵبژاردن کە چوونە ناوی و هاتنەوەی سی سی و کوشتنی ئەو هەموو خەڵکە و ناموس بردنیان و ئەزیەتدرانیان و لەگەڵ دابەزینی مورسی و الإخوان المسلمون و لایەنەکانی تر لە عەقیدە و بیروبڕوا و زۆربەی پابەندیەکانی ئیسلام، ئینجا نەشـیان هێشــت لەســەر حوکمبن، ئابڕویان بردن ناموســیان بردن زەلیلیان کردن وە نەیانهێشــت بمێننەوە و هەڵیان وەشـاندنەوە و خوێنیان ڕشــتن، بە دڵنیاییەوە ئێســتا أحمد شــاکر پەشــیمان دەبوویەوە لەو قســەی و بۆی دەردەکەوت ســەد لە ســەد ئەوە فتوایەکی هەڵەیە.

**بە کورتی دەتوانین بڵێین ئەوە مەرجەکانیەتی:**

١-ڕاشکاوانە بانگەوازی بۆ گەڕاندنەوەی حوکمی الله و پەیڕەوی لێکردنی بکرێت.

٢-بە ئیخلاصەوە تەنها لەبەر خاتری الله ئەو کارە بکەن.

٣-پێگەیەکی بەهێزی جەماوەریی ئیسلامی دروستبکەن کە تامەزرۆی چەسپاندنی حوکمی الله بن ئینجا بچنە ناو هەڵبژاردن.

٤-دەستاو دەستی حوکم لە بەرامبەرەکان مسۆگەر بکەن.

٥-وەفادار و بە ئەمەکبن لەگەڵ بەڵێنەکانیان، بە تایبەتی گەڕاندنەوەی حوکمی الله و چەسپاندنی.

ئەگەر خۆمان لە گێلی نەدەین و بەچاوی سەر تەماشا بکەین لە میسر و وڵاتەکانی تر و هی خۆشمان لە پێشتر و ئێستاش ئەو مەرج و قەیدانە هیچیان نەهاتووەتەجێ و کاریان پێنەکراوە، بە دڵنیاییەوە نەخێر، کەوابێ فتواکەی الشیخ أحمد شاکر بۆ ئەوانە نابێت و ئەوە لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە مەرج و قەیدەکانی باش و جوانن، بەڵام ڕێگاکە و سیستەمی عەلمانی و واقیعەکە لەگەڵی ناگونجێت، چونکە بەدەرە لە ڕێباز و ڕێگای پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) وە لەگەڵی تێک ناکاتەوە.

٢-عبد العزیز بن عبد الله بن باز موفتی پێشوتری سعودیا لە وەڵامی پرسیارێک کە لێی دەپرسن دەربارەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و دەنگدان دەڵێت: **(و إن النبي قال : ( إنما الأعمال بالنيات ، وإنما لكل امرئ ما نوى ) لذا فلا حرج في الالتحاق بمجلس الشعب إذا كان المقصود من ذلك تأييد الحق ، وعدم الموافقة على الباطل ، لما في ذلك من نصر الحق ، والانضمام إلى الدعاة إلى الله . كما إنه لا حرج كذلك في**

**استخراج البطاقة التي يستعان بها على انتخاب الدعاة الصالحين ، وتأييد الحق وأهله ، والله الموفق)**[1]

واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم فەرمویەتی: **(إنما الأعمال بالنيات ، وإنما لكل امرئ ما نوى)** بۆیە هیچ گوناحێکی تێدا نییە چوون بۆ ئەنجوومەنی گەل ئەگەر مەبەست لێی پشتگیری کردنی هەق بێت و، پشتیوانی باتڵ نەکات، چونکە ئەمە سەرخستنی هەقی تێدایە و، چوونیشە بۆ پاڵ بانگخوازانی لەپێناو الله دا، هەروەك چۆن هیچ گوناحێك لە دەرهێنانی ئەم هەویەش نییە کە پشتی پێ دەبەسترێت بۆ هەڵبژاردنی بانگخوازە چاکەکان، ئاواش پاڵپشتی کردنی هە ق و هەقویستانە والله الموفق.

ئێستا دێینە سەر پرسیارێکی تریش کە لێیدەکرێ و وەڵامدەداتەوە چەند خاڵێکمان دەستدەکەوێ ئەگەر سەرنجی بدەین، کە لەو کەس و لایەنانەی پاشگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە نایەتەجێ ئەگەر بەو فتوایەش بیکەن.

هەرچەندە فتوایەکان خۆ لە کەس و خەڵکەکانیش وەرناگیرێن، لەوانە مقبل الوادعي یەمەنی کاتێک کە لێیدەپرسن دەڵێن ئیبن باز ئەو فتوایەی داوە وە ئیبن العثيمين وای

---

[1] سەرچاوەکە دیسان لەو پەرتووکەی دکتور عمر سليمان الا شقر -حكم المشاركة في الوزارة والمجالس النيابية- (ل: ١٣٦) وەرمانگرتووە.

گوتووە ئەلبانی وای گوتووە، دەڵێ فتوایەکەی بن باز ئەو شـەخس و ئینسـانێکە باتڵ و پوچەڵە بە ئایەتەکانی قورئان و بە حەدیسەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش ئینسانە و هەڵەی کردووە، وە دەڵێ هی ئیبن العثیمین یش هەر وایە، لە پاشـان دەڵێ هی ئەلبانی ش هەر وایە، بەس دەڵێ ئەلبـانی خۆم پەیوەنـدیم پێیوە کردووە و پەشـیمان بووەتەوە، دەریش دەکەوێ بەڵگە دەهێنینەوە لە ڕوونکردنەوەی قسەکەی ئەلبانی، کە ڕا ستە لە کۆتاییەکەیدا پەشیمان بووەتەوە لە قسەکەی پێشتری کە کردوویەتی.

ئیبن باز پرسـیارێکی تری لێدەکرێ دەربارەی ئەوەی کە بانگخوازان و زانایان بچنە ناو ئەنجومەنەکانی نوێنەرایەتی و پەڕلەمان و بەشـداری بکەن لە هەڵبژاردن لە وەڵامدا دەڵێ:

**(هذا الدخول خَطير يعني برلمانات ومجالس نيابية ونحوها، الدخول فيها خطير، لكن من دخل فيها عن علم، وعن بصـيرة يريد الحق، ويريد ان يوجه الناس إلى الخير، ويريد أن يعرقل الباطل، ليس الأصـل هو الطمع في الدنيا، ولا الطمع في المعاش، وإنما قد دخل لينصر دين الله، وليجاهد في الحق وفي ترك الباطل بهذه النية الطيبة، أنا أرى أنه لا حرج في ذلك، وأنه ينبغي حتى لا تخلو هذه المجالس من الخير وأهله، إذا كان دخل بهذه النية، وهو عنده بصـيرة حتى يجادل عن الحق، وحتى يدعوا إلى ترك الباطل، وَ لعل الله ينفع به، حتى تحكم الشريعة بهذه النية بهذا القصد مع العلم والبصرة، فالله جل وعلا يأجره على ذلك، أما إذا دخل يقصد الدنيا أو بقصد الطمع في الوضـيفة لا يجوز هذا، لكن دخوله يريد وجه الله والدار**

**الأخرة، يريد نصر الحق، يريد بيان الحق بأدلته، لعل هذه المجالس ترجع إليه وَ تنيب إليه)**[1]

واتە: ئەم بەشداری کردنە ترسناکە واتە پەرلەمان و ئەنجوومەنی نوێنەران، بەڵام ئەوەی بەشداری تێدا بکات لەسەر علم و چاوڕوونی و مەبەستی هەق و ڕاستی بێت، بیەوێ خەڵك ئاڕاستە بکات بەرەو چاکە و، بیەوێ بەربەست دروست کات بۆ ناهەق و باتڵ، نەك هەر لە بنەڕەتدا مەبەستی دونیا بێت و، چاوی تەنها لە مەعاشەکە بێت، بەڵکوو بۆ ئەوە بەشداری کرد بێت دینی الله سەر بخات و لە پێناو هەق تێبکۆشێت، واز لە باتڵ بێنێت، بەم نییەتە من وای دەبینم لەو بارەیەوە هیچی تیا نەبێت، وا پێویست دەکات ئەم دانیشتنانە چۆڵ نەبێت لەخێر و ئەهلی خێر، ئیتر کەوا ئەو بەم نییەتەوە چوو هەروەها چاوڕوونی و بەسیرەی هەبوو بۆ ئەوەی هەق بەرپا بکات و دەمەقاڵی لە پێناو هەقدا بکات و، بانگەواز بکات بۆ وازهێنان لە باتڵ، لەوانەشە الله تعالى بیکاتە مایەی سوود بەخشین تا حوکم بکرێ بە شەریعەتی الله، جا بەم نییەت و مەبەستە و بە هەبوونی زانست و چاوڕوونی، ئەوا الله جل وعلا پاداشتی لەسەر دەداتێ.

---

[1] پەرتووکەی دکتور عمر سلیمان الاشقر -حكم المشاركة في الوزارة والمجالس النيابية- (ل: ١٣٧).

بەڵام ئەگەرهاتوو چوو بە مەبەستی دونیا و تەماحی تەنها وەزیفەکەبوو، ئەمە دروست نییە، بەڵام ئەگەر چوونەکەی لە پێناوی الله و ڕۆژی دووای بوو، بیەوێ هەق سەر بخات، بیەوێ هەق بە بەڵگەکانییەوە ڕوون بکاتەوە، بەو ئومێدەی ئەم دانیشتنانە بۆ لای هەق بگەڕێتەوە.

## ئەگەر سەرنجی هەردوو وتەکانی عبد العزيز بن باز بدەین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت:

١-تەواو بەرچاو ڕوون نەبووە لە یاسـاکانی ئەنجومەنی پەڕلەمان و هەڵبژاردن و ئەو باجانەی دەبێ بەربژێر بیدات، بە داننانی بە سیستەمی عەلمانیەت و دیموکراسی و شیرک و کوفرەکان، بە دڵنیاییەوە ئەگەر ڕاستی و واقیعیەتیەکانی بۆ ڕوونکرابایەوە ئەوە قەدەغەی دەکرد، بۆ نموونە؛ کە لێی دەپرسـن دەبارەی سـوێند خواردنی یاسـایی پەڕلەمان بەبێ دوو دڵی حەرام و قەدەغەی دەکات، کە (عبد العزيز بن باز خۆی سـەرۆک بووە، عبد الله بن قعود ئەندام بووە، عبد الله الغديان ئەندام بووە، عبد الرزاق عفيفي جێگری بن باز بووە) لەو لیژنەیە، دەڵێت: **(لايجوز ذلك من غير يمين فكيف مع اليمين ولا شـك أنه مع اليمين يكون أشد إثما)**[1] واتە: بەبێ سوێند خواردنیش جائیز و دروست نییە کە بڵێ ئەو

[1] لە فتوای (ژ: ٧٨٠٢)ی لیژنەی فتوای سعودی -اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء- هاتووە.

یاسا شیرکی و کوفری و بێدینیانە دەپارێزم لەگەڵ سوێند خواردنەکەدا تاوان و گوناحەکەی زیاتر و توندتر دەبێت.

٢-ئیبن باز بە ڕەهایی بە دروستی دا نەناوە، بەڵکو لە سەرەتادا بە ترسناک ناوی دەبات و ئینجا چەند مەرج و قەیدێک دیاری دەکات ئەگەر بێنەجێ ئینجا پێی دروستە.

- **مەرجی یەکەم؛** کەسەکە نیەت پاکی و ئیخلاس بوونی هەبێت.
- **مەرجی دووەم؛** پشتگیری ڕەوایەتی و پشتگیری شکاندن و ڕسواکردنی خراپە و باطیل بکات.
- **مەرجی سێیەم؛** کەسەکە دەبێ خاوەن زانست بێ و بەرچاو ڕوونبێت (لەسەر بەسیرەبێ).
- **مەرجی چوارەم؛** خەڵکی لە حەق و ڕاستیە کان بگەیەنێت و بە بەڵگە کانەوە ڕوونیان بکاتەوە.

جا بە دڵنیاییەوە تاوەکو ئێستا نەبیستراوە و نەبیندراوە ئەو مەرجانە هاتبێتەدی و ئاسان ناشهێتەدی وە دەتوانین بڵێین مەحاڵە هاتنەدیی.

٣-محمد بن صالح العثیمین لە وەڵامی پرسیارێکدا کە لێی دەکرێ دەربارەی چوونە ناو پەرلەمان و بەشداریکردن لەو وڵاتانەی کە شەرعی الله جێبەجێ ناکەن دەڵێ: **(وهو أن لا**

**بد من الدخول والمشـــاركة في الحكومة ، وأن ينوي الإنســـان بدخوله الإصـــلاح لا الموافقة على كل ما يصــدر ، وفي هذا الحال إذا لقي ما يخالف الشرـع فإنه يرده ، وهو وإن لم يتبعه على ذلك أناس كثيرون يحصــل بهم تقويته في أول مرة أو ثاني مرة أو الشهر الأول أو الثاني أو الثالث أو السنة الأولى أو السنة الثانية سوف يكون في المســـتقبل له أثر طيب ، أما التخلي عن ذلك فيترك المجال لأناس بعيدين من تحكيم الشريعة فإن هذا تفريط عظيم لا ينبغي للإنسان أن يتصف به)**[1]

واتە: هەر دەبێ بچیت و بەشداربی لە حکومەت و، دەبێ مرۆڤ نییەتی لەو بەشداریکردنە چاکســـازی بێت نەك ڕازی بوون بە هەموو ئەو فەرمانانەی دەردەچن، لەم حاڵەتەشـــدا ئەگەر شـــتێکی نا شـــەرعی کەوتە پێش دەبێ ڕەتی بکاتەوە، خۆ ئەگەر لەوبارەیەوە یەکەم جار خەڵك شـــوێنی نەکەوت کەوا دەبوونە هۆی بەهێزکردنی ئەوســـا بۆ جاری یەکەم یان دووەم، یان مانگی یەکەم یان مانگی دووەم و ســـێیەم، یان ســـالێ یەکەم و دووەم، ئەوە لە داهاتوودا هەر شـــوێنەوارێکی جوانی بۆی ئەبێت، بەڵام واز هێنانی هەر لەوکاتەوە ئەوە دەرفەت خۆش دەکات لەبەردەم ئەوانەی دوورن لە حوکمکردن بە شـــەریعەتی ئیســـلام، بەڕاستی ئەمەش کەم تەرخەمییەکی گەورەیە کەنابێ مرۆڤ پێی ناوزەد بێت.

---

[1] پەرتووکەی دکتور عمر سليمان الاشقر -حكم المشاركة في الوزارة والمجالس النيابية- (ل: ١٤٠).

لە پرسـیارێکی تریشـدا لە وەڵامدا گوتوویەتی: **(وأما الحلف على احترام الد ستور فينوي بقلبه أنه حلف على احترام الدسـتور ، إن لم يخالف الشرـع ، والأعمال بالنيات ولكل امرئ ما نوى . أما ترك هذه المجالس لا سفهاء والف ساق والعلمانيين ، وأ شباههم ، فهذا غلط لا يحل المشكلة ، والله لو كان الخير في امتناعه عن هذه المجالس لقلنا يجب البعد والكف عنها ، لكن الأمر على عكس ذلك)**[1]

واتە: سوێند خواردن لە سەر ڕێزگرتنی دە ستور، با لە دڵیەوە کە سەکە نیەتی ئەوە بێنێت کە سـوێند لە ڕێزگرتنی دەسـتورێک کە پێچەوانەی شـەرع نەبێت دەخوا لەسـەری، کار و کردەوە کان بە نیەتەکانە هەر مرۆڤێکیش نیەتێکی هەیە. بەڵام وازهێنان لەو ئەنجومەنانە بۆ گێل و لە فەرمان دەرچوان و عەلمانیەکان و نموونەی ئەوان، ئەوە هەڵەیە و چارەسـەری کێشـەکان ناکات، سـوێند بە الله ئەگەر خێر و چاکە لە خۆگرتن با لەو ئەنجومەنانە ئەوە دەمانگووت پێویستە بە دوور کەون و وازبێنن لێیان، بەڵام کارەکە پێچەوانەی ئەوەیە.

## لە دوای سەرنجدانی قسەکانی ئیبن العثیمین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت:

١-بە ڕەهایی ئەویش هەر نەیگوتووە و مەرج و قەیدی بۆ داناوە.

٢-تەواو لە ماهییەت و کاری ئەنجومەنەکان نەگەیشتووە.

[1] ئەوەش لە پەرتووکی -حكم المشاركة في الوزارة والمجالس النيابية- دکتۆر عمر سليمان الأشقر (ل: ١٤١) هاتووە.

٣-فتوای تەواوی زانایانی جێگای متمانە لەگەڵ ئەوەیە کە سوێند خواردنەکە لەسەر نیەتی ئەو کەسەیە کە سوێندی دەدات و سوێندی بۆ دەخوات سوێند خۆرەکە، نەوەک لە سەر نیەتی سوێند خۆرەکە بێ تا بڵێین نیەت دەوری تێدا دەبینێ.

٤-لە خراپەی ئاشکرا و کوفر و شیرکی گەورە و ئاشکرا نیەت هیچ ڕۆڵێکی نابێت، پێمان سەیرە کە بۆ خۆیان ئەو بابەتە کەسانە ئەو قسانەیان کردووە و لێیان وەرگیراوە وەکو؛ ئیبن العثیمین، لە شوێن و جێگاکانی تری پەرتووک و کیتابەکانی عەقیدە ئەوەیان ڕوونکردوەتەوە کە نیەت لە شیرک و کوفری ئاشکرا دەور نابینێت وە لە مەسەلەی تەڵاقیش، بۆچی لێرە نیەتی وەپاڵ خستووە؟

٥-محمد بن صالح العثیمین فتوای هەیە لەسەر حەرامێتی حیزب و کۆمەڵیەتی بوونی مو سڵمانان و تەحەزوب کردن لەگەڵ ئەو ڕایەی بۆ هەڵبژاردن تێک دەگیرێت بە ڕا ستی وە تێک ناکەتەوە، جا ئەوانەی کە قسەی ئیبن العثیمین دەهیننەوە و بەقسەی دەکەن، دەبێ لە مە سائیلی کۆمەڵ بوون و حیزبایەتی و تاقم بوونی ئی سلامێتیش بە گوێی بکەن، بۆ لەوە لێی وەردەگرن و لەویتر لێی وەرناگرن؟

٤-ئەگەر سەرنجی وتەی محمد ناصر الدین الألباني بدەین دەربارەی جەزائیر و هەڵبژاردن و دەنگدان کە پرسیاری لێکراوە دەڵێ: **(ولكن لا أرى ما يمنع الشعب المسلم إذا كان**

**في المرشحين من يعادي الإسلام ، وفيهم مرشحون إسلاميون من أحزاب مختلفة المناهج ، فنا صح - والحالة هذه – كل م سلم أن ينتخب الإ سلاميين فقط ، ومن هو أقرب إلى المنهج العلمي الصحيح الذي تقدم بيانه أقول هذا . وإن كنت أعتقد أن هذا الترشيح والانتخاب لا يحقق الهدف المنشود كما تقدم بيانه من باب تقليل الشر ، أو من باب دفع المفسدة الكبرى بالمفسدة الصغرى كما يقول الفقهاء«)**[1]

واتە: من نابینم گەلی موسڵمان قەدەغەبێت ئەگەر لە بەربژێران هەبێت دژایەتی ئیسلام بکات و تێیاندا هەبێت بەربژێرانی ئیسلامی لە پارتە جۆراو جۆرەکان لە پڕۆگرامەکانیان، لەو حاڵەدا ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێک دەکەم کە تەنها لە ئیسلامیەکان هەڵبژێرێت، ئەوەی نزیکترە لە پڕۆگرامی دروست و سەحیح کە ڕوونکراوەتەوە لە پێشتر. وە دەڵێم ئەگەر من بڕواشم وایە ئەو هەڵبژاردن و خۆ بەربژێر کردنە ئامانجی داواکراو دەستەبەر ناکات، هەر وەکو لە پێشتر ڕوونکردنەوەی هاتووە لە باس و بابەتی کەمکردنەوەی خراپە یان لە باس و بابەتی ڕەتکردنەوە و لادانی خراپەی مەزنتر و گەورەتر بە خراپەی بچووکتر هەروەکو زانایانی شەرعزان گوتوویانە.

[1] ئەوەشیان هەر لە پەرتووکەکەی دکتۆر عمر سلیمان الأشقر (ل: ١٤٣) -حكم المشاركة في الوزارة والمجالس النيابية- وەرمانگرتووە.

**لە دوای سەرنجدانی قسەکەی محمد ناصر الدين الألباني ئەو خاڵانە دەردەکەوێ:**

١-هەڵبژاردن و دەنگدانی پێ باش نەبووە تەنها لە باس و بابەتی بوونی خراپەی گەورە و بچووک کامەیان هەڵبژێرێت ئەگەر هاتەجێ قسەی کردووە.

٢-پێشی وابووە کە هیچ سوود و کەڵکی بۆ ئامانجە دیاریکراوەکان تێدا نییە.

وە لە پا شان لە شوێنێکی تر دەربارەی هەڵبژاردن و ئەندام بوون لە پەڕلەماندا گوتوویەتی:

**(فوجود هؤلاء فى البرلمانات لا يفيدهم شيء ، والتأريخ والتجربة في نحو نصف قرن من الزمان ، أكبر دليل على أن وجود المسلمين الطيبين الصالحين فى البرلمانات هذه لايفيدون شيئاً ، بل قد يضرون أولا بأنفسهم لأنهم يدخلون ليصلح غيرهم ، فإذا بغيرهم قد أفسدوهم...)**[١]

واتە: بوونی ئەوانە ئیسلامیەکان لەناو پەڕلەماندا هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێت، وە مێژوو ئەزموون گەلی نزیکەی نیو سەدە لە کات، گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بوونی موسڵمانانی چاک لە پەڕلەمانەکان هیچ سوودێکیان نەگەیاندووە، بەڵکو ئەوانەی چاک و

[١] -سلسلة الهدى والنور- کاسیەتی (ژ: ٣٨١).

پاک و ڕێک بوونە لەناو پەڕلەمانەکانیش سـەرەڕای ئەوەی سـوودیان نەگەیاندوە، ئەوان چوون خەڵکی چاکساز بکەن و چاک بکەن خەڵکە خراپەکە ئەوانی تێکداوە...

جا لە درێژەی قسەکان زۆر بە کورتی باسی ئەوەش دەکا دەڵێ؛ بە جل و بەرگی شەرعی دەچن و دەگۆڕێن بۆ پانتۆڵ و بۆین باغ و چاکەتی کافران و لەبەر کردنی، وە بە ڕیشـەوە دەچن و بە ڕیش تاشـینەوە لێی دەردەکەون، وە بە پابەندبوون بە واجبە شـەرعیەکان و سونەتەکانەوە دەچن بە کەمتەرخەمی و ساردبوونەوە لێیان دەردەچن، بەخۆ دوور گرتن لە خۆچواندن بە کافر و بێبڕوایان دەچن و بەخۆچواندن بە کافرانەوە لێی دەردێن، ...هتد زیانەکان باس دەکات.

جا ئەوەی پێویسـتە لێرە ڕوونیشـی بکەینەوە لە دوای لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بۆمان دەرکەوت لایەنگر و قوتابیانی ئەلبانی کۆ دەنگن لەسـەر ئەوەی پەشـیمان بوەتەوە لەو بۆچوونەی، کە لەڕابردودا ئامازەمان پێکرد و هێنامانەوە، بەڵگەکەشـیان ئەوەیە کە کۆتا فتوای بریتییە لەوەی لە گۆڤاری (ألأصاله) بڵاوکراوەتەوە کە لە (ئوردون) دەردەچێ لە ژێر ناونیشانی فتوایەکی کۆمەڵی و جەماعی بۆ گشت موسڵمانان (مسائل عصرية في السياسة الشرعية) کە واژوو کراوە لەلایەن (محمد ناصر الدين الألباني و مقبل الوادعي و هەندێکی تر لەوانەی یەمەن) دەقی ئەو بڕگەیەی پەیوەندی بە باسەکەوە هەیە هێناومانەتەوە

لەویّ دەردەکەویّ ئەوە کۆتا وتە و فتوا و قســەی ئەلبانی بووە لەوەی پێشــتر پەشــیمان بوەتەوە، دەڵێ: **(الانتخابات الســياســية : فهي بالطريقة الديمقراطية حرام أيضــا لا تجوز، لأنه لا يشــترط في المنتخب والناخب الصــفات الشرــعية لمن يســتحق الولاية العامة أو الخا صة ، فهي بهذه الطريقة تؤدي إلى أن يتولى حكم الم سلمين من لا يحوز توليته ولا استشارته ولأن المقصود بالمنتخب أن يكون عضوا في مجلس النواب التشريعي والمجالس النيابية التي لا نحتكم إلى كتاب الله وسنة رسوله وإنما تتحاكم إلى الأكثرية ؛ فهي مجاليس طاغوتية لا يجوز الاعتراف بها ، فضــلا عن أن يســعى المســلم إلى إنشــائها ويتعاون في إيجادها وهي تحارب شرع الله ولأنها طريقة غريبة من صنع اليهود والنصاري ولا يجوز شرعا التشبه بهم)**(١)

واتە: هەڵبژاردنە سیا سیەکان : ئەوە بە ڕێگای دیموکرا سی حەرامە هەروەکو ئەوەی پێشتر دروســـت نییە، چونکە بە مەرج ناگیر ێت لە ( کا ند یدە کان و دەنگدەرە کان) ســـیفەتە شەرعیەکان بۆ ئەوەی شایستەبێت بۆ بەرپرسیارێتی گشتی یان تایبەت، ئەو هەڵبژاردنە بەو ڕێگایە وا دەکات کەسـێکی ناشـایسـتە کە دروسـت نەبێت بەرپرسـیارێتی پێ بدرێت و حوکمی مو سڵمانان بگرێتە ئە ستۆ وە درو ست نەبێت بەرپرسێتی پێ بکرێت و ئستیشارەی پێ بکرێت ئەوانە دەکرێنە بەرپرس و ئستیشارەیان پێ دەکرێت چونکە مەبەست لە بەربژێر

(١) -گۆڤاری ألأصالە- ژمارە دووی (١٥ / ٦ / ١٤١٣)ی کۆچی (ل: ١٦- ٢٤).

و کا ند ید ئەوەیە ببێتە ئە ندام لە ئەنجومەنی نوێنەرانی یاســـا دا نان ئەنجومەنە کانی نوێنەرایەتی ئەوانەی کە حوکم بە قورئانی الله و ســـونەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ناکەن بەڵکو حوکم و بڕیارەکان بۆ زۆرینە دەگەڕێننەوە؛ ئەو ئەنجومەنانە ئەنجومەنی طاغوتین وە دروســـت نییە دانیان پیادا بنرێت، نەک موســـڵمان کۆشـــەش بکات بۆ دامەزراندن و یارمەتیدان و بۆ هێنانە کایەوەی، ئەو ئەنجومەنانە دژایەتی شـــەرعی الله دەکەن چونکە ڕێگایەکی خۆرئاواییە و لە دروستکردنی جولەکە و نەسرانیەکانە وە دروست نییە لە شەرع خۆچواندن بەوان.

کەواتە بڵاو کردنەوە و واژوو کردنی ئەو فتوایە لەلایەن ئەلبانییەوە تەواو قسە و فتوایەکەی پێشتر هەڵدەوەشێنێتەوە و دەیسەلمێنێ کە لێی پەشیمان بوەتەوە و پێی ڕازی نەبووە.

٥-دکتور عبد الله عزام لە وەڵامی پرســـیارێک کە ئاراســـتەی کراوە ئایە ڕای تۆ چییە دەربارەی بەشـــداریکردن لە هەڵبژاردن بۆ پەڕلەمان و ئەنجومەنەکانی گەل؟ گوتوویەتی:

**(هـناك فرق بين أن يكون وزيرا وبين أن يكون في مجلس نيابي الذي يكون في مجلس نيابي وضـيفته نقد دولة وضـيفته والإعتراض، ويحق له ان يعترض على كل أمر و على كل قانون في الدوله، فإذا كان همهم أن يبينوا للناس مســـاوئ هذه الدوله أو عيوبها أو يصـــحنونها أو يقوومونها أو يخففون الضـــلم عن الناس، أرجو الله تعالى لا يكون فيها شـــيء، وهذا خفف كثيرا من الضـــلم في بعض البلدان، أما**

**إذا كان همه الدنيا فويل له ثم ويل له. أما مجلس الوزرء: لا يجوز دخوله لأنه مجلس تنفيذي، وإذا دخل مجلسا تشريعيا لا يجوز له أن يوافق على مادة تشريعية واحده تخالف الإسلام أو القران، وإذا وافق على مادة قانونية تخالف الإسلام فإنه يخرج من الإسلام... مفهوم؟. إذا وافق على قانون واحد نصه مثلا: يسجن السارق شهرين، إذا وافق عليه واحد فى مجلس النواب يخرج من الإسلام والله أعلم. ولذالك ان أرى المجالس نيابية فى بلد فيها رائحة حرية يكون فيه خيرن للمسلمين أو يخفف الضلم عن المسلمن، لكن لا يعمل دولة إسلاميه ولا يقيم مجتمعا إسلاميا هذا العمل)**

واتە: جیاوازی هەیە لەوەی ئەو کەسە وەزیر بیت یانیش ئەندام بێت لە ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە، ئەوەی ئەندامە لە ئەنجوومەنی نوێنەرانەوە وەزیفەکەی ئەوەیە ڕەخنە لە دەوڵەت بگرێت و ڕێگری لێبکات و، مافی ئەوەشی هەیە ڕەخنە و ڕێگری بکات لە هەر کارێك یان یاسایەکی دەوڵەت، جا گەر هەموو هەم و غەمیان ئەوە بێ بۆ خەڵکی ڕوون کەنەوە عەیب و عاری ئەم دەوڵەتە و ڕاستی بکەنەوە، یانیش ستەم لەسەر خەڵکی سووك بکەن، ئەوە ئومێدەوارم لە الله کە گوناحێکی تێدا نەبێت، ئەمەش زوڵمێکی زۆری کەمکردۆتەوە لە هەندێك وڵاتدا، بەڵام گەرهاتوو تەنها هەم و غەمی دونیا بێ واوەیلا بۆی پاشانیش واوەیلا.

بەڵام ئەنجومەنی وەزیران دروســـت نییە بچیتە ناوی لەبەر ئەوەی ئەو ئەنجوومەنێکی جێبەجێ کارییە، خۆ ئەگەر چووە ئەنجوومەنێکی تەشریعیش نابێت ڕازیبێت لەســـەر یەك تەشریعیش کە پێچەوا نە بێت لە گەڵ ئیســـلام وقوڕئان، وە ئە گەر ڕازی بوو لەســـەر ماددەیەکی یاســایی پێچەواەی ئیســلام، ئەوە لە ئیســلام دەردەچێت .. تێگەیشــتی؟ . ئەگەر ڕازی بوو لەسەر یەك یاسا بۆ نموونە دەقەکەی وابوو : دزی کەر دوو مانگ بەند دەکرێت، ئەگەر کەسێك لە ئەنجوومەنی گەل پێی ڕازی بوو لە ئیسلام دەردەچێت، والله أعلم.

بۆیە ڕام لەگەڵ ئەو ئەنجوومەنی نوێنەرانە لە وڵاتێك کە بۆنی ئازادی لێ بکرێ خێری بۆ موســوڵمانان تێدا بێت یانیش ســتەمیان لەســەر ســووك بکات، بەڵام ئەم کارانە دەوڵەتێکی ئیسلامی نە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی دانامەزرێنێت.

## ئەگەر سەرنجی قسە و وتەکانی دکتور عبد الله عزام بدەین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت:

١-چوونە ناو حکومەتی عەلمانی پێ نادروست بووە.

٢-چوونە ناو هەڵبژاردن و ئەندامبوون لە پەڕلەمانی بە چەند مەرجێک پێ دروست بووە:

- بە نیازی بەرگریکردن لە یاساکانی ئیسلام و موسڵمانان بچێتە ناوی.
- کەمکردنەوەی خراپە و ستەمەکان.

- ڕەتکردنەوەی یاساکانی دژ بە ئیسلام و پێچەوانەکانی.

وە بە ڕاشــکاویش دەڵێ ئەوەی دانبنێت بە یاســاکانی پێچەوانەی ئیســلام، ئەگەر تەنها لە یەک دانە یاسا ڕازی بێت لەو یاسایانە ئەوە کافر دەبێت و لە ئیسلام دەردەچێت، وە پێشی وابووە کە ئەو بەشــــداریکردنە لە ناچارییە و ڕێگا چارە نییە بۆ بانگەوازی و بنیادنانی کۆمەڵگای موسڵمان و دەوڵەتی ئیسلامی، ئەوەی بە فتوای ئەو بکات دەبێت مەرجەکان لە خۆی بێنێتەجێ و بەشــــداری حکومەت و وەزارەتەکانیش نەکات، جا ئەوە دەرکەوت کە دەڵێ ئەگەر دز لە ئیســلامدا دەســتی دەبڕێ، لە یاســایەکی دەســتکرد و لە ناو پەڕلەماندا بگووترێ دوو مانگ با بگیرێ دزەکە، هەرکەسێک دەستی بۆ بڵندکات پێی ڕازی بێت ئەوە بە دڵنیاییەوە دەڵێ کافر دەبێ و لە ئیسلام دەردەچێ، کە پەڕلەمانەکان سەدان سەدان ئەو کوفر و شیرکانەیان تیدایە و یاساکانی الله ی تێدا ڕەت دەکرێتەوە.

## چەند خاڵێکی گرینگ لە هەڵوەشاندنەوەی گشتی بۆ پەنا بردنە بەر وتەی موفتی تویژەرەوەکان:

١-بەڕاســتی وتەی زانایان لە کاتی جیاوازی لە نێوانیاندا نابێتە بەڵگە و حوجەی پێ ناهێنرێتەوە، بەڵکو دەبێ حوجەی بۆ بهێنرێتەوە، ئیبن تەیمیە -رحمە الله- دەفەرمووێ:

**(ولیس لأحد أن یحتج بقول أحد في مسائل النزاع، وإنما الحجة النص والإجماع، ودلیل**

**مستنبط من ذلك تقرر مقدماته بالأدلة الشرعية لا بأقوال بعض العلماء ؛ فإن أقوال العلماء يحتج لها بالأدلة الشرعية ، لا يحتج بها على الأدلة الشرعية)**[1] واتە: بۆ کەس نییە بەڵگە بێنێتەوە بە قسەی کەس لە باسەکانی کە جیاوازییان لە سەرە، تەنها بەڵگە دەق و ئیجماعە، ئەو بەڵگەیەش کە لەوەوە هەڵهێنجراوە کە پێشەکییەکانی بە بەڵگە شەرعیەکان بڕیاردراوە نەوەکو بە قسەکانی هەندێک لە زانایان؛ بەڕاستی قسەکانی زانایان بەڵگەی بۆ دەهێندرێتەوە بە بەڵگەکانی شەرعی، نەوەک بکرێتە بەڵگە لەسەر بەڵگەکان.

٢-بە هێنانەوەی جیاوازی نابێت دەقەکان ڕەتبکرێنەوە لە کاتی لاوازی جیاوازیەکە و بە دیارکەوتنی ڕای پەسەند بە بەڵگە.

٣- نابێ بە گوێرەی بەرژەوەندی و هەوا و هەوەس ڕاو بۆچوونەکان وەربگیرێت، ئەوەی لەگەڵت بگونجێ وەریبگریت و ئەوەی لەگەڵیشت نەگونجێ ڕەتی بکەیتەوە، بۆ نموونە وتەکانی ڕابردوو ئەوانەی ناومان هێناون لە (عبد العزیز بن باز، ابن العثیمین، البانی، احمد شاکر، عبد الله عزام، ...هتد) هەندێک فتوا و قسەیان هەیە ئەوانەی قسەکانیان دەهێننەوە پێی ڕازی نین و ڕەتی دەکەنەوە، بۆچی لە هەندێکدا بە قسەیان دەکەن و لە

---

[1] -مجموع فتاوي- (ج: ٢٦، ل: ٢٠٢ تا ٢٠٣).

هەندێکی تردا ڕەتی دەکەنەوە مادەم پێتان زانا و جێگای متمانەن؟ دەبێ ئێوە لەگەڵیاندابن و لە هەندێک شــتدا چاوپۆشــییان مەکەن و ڕەتیکەنەوە و پێ ڕازی نەبن، ئەگەر دەشــڵێن لەبەر ئەوەیە لەهەندێک بەڵگەیان هەیە و لە هەندێک نییانە، بە دڵنیاییەوە مەبە ستتان ئەوە نییە و لێتان دەرکەوتووە مەبەســـت ز یاتر ئەوەیە لەگەڵ بەرژەوە ندی ئێوە هە ند ێک لە قسەکانیان گونجاوە وەرتانگرتووە.

٤-زانایان مەعســوم نین بەدڵنیاییەوە ڕای دروســتی دەبێت و جاروباریش جاری وا هەیە دەخلیسکێت و ناپێکێت و ئەگەر زانایەکە لە کۆ شە شکار و موجتەهیدبێ بە دڵنیاییەوە لە هەڵە و کەم و کورتیەکەش ئەجر و پاداشــتێک وەردەگرێتەوە، وەکو پێغەمبەر فەرموویەتی (ﷺ) بەڵام ئەگەر پێکای دوو ئەجر و پاداشـــت وەر دەگرێتەوە، بەڵام نابێ خەڵکی بە هەڵەکەی بکات و شــوێن هەڵەکەی بکەو ێت ئەگەر زا نایەکە ڕێز لێگیراویش بێت و موجتەهیدیش بێت.

ئیبن تەیمیە گوتوویەتی: **(إن الرجل الجليل الذي له في الإسلام قدم صالح و آثار حسنة ، و هو فيها معذور ، بل مأجور ، لا يجوز أن يتبع فيها مع بقاءِ مكانته و إمامته و منزلته من قلوب المؤمنين)**[1] واتە: بەڕاســتی پیاوی شــکۆدار ئەوەی کە لە ئیســلام پێی

---

[1] -فتاوی الكبرى- (٦/ ٩٢).

چاک و شـــوێنەواری چاکی هەیە، ئەو تیایدا بیانووی هەیە، بەڵکو پاداشـــت وەرگرە لە هەڵەیەک کە دەیکات لە کاتی کۆشـــەش و ئیجتیهاد کردندا، جا دروســـت نییە شـــوێنی بکەویت لە هەڵەکەی لەگەڵ مانەوەی ئەو لە پلە و پایە و شوێنی لە دڵی بڕواداران.

واتە ڕێزی لێدەگیرێ و هەر بەڕێز دەمێنێتەوە یەکێکی وەک؛ شـــافیعی و مالیک و ئیمامی ئەحمەد و...هتد ئەو سەردەمەش کە مەرجەکانی زانایەتی جێگای متمانەی ڕێکوپێکیان لێ هاتبێتەجێ، بەڵام ئەگەر هەڵەیان کرد لە هەڵەکەدا نابێ بە دوایان کەوین، بە بەڵگەوە دەبێ ڕەتی کەینەوە.

٥-هەر زانایەک تەواو الله ویســـت بێت گەر ڕای ڕاســـت و حەقی بۆ ڕوونکرایەوە ئەگەر پێشـــتر ناحەقیشـــی گووتبێ، پێویســـتە لەســـەر ئەو ڕایەی خۆی دابەزێت و لەهەڵەکەی بگەڕێتەوە و پێداگیری لەسەر نەکات.

جا هەندێک جاریش بوختان کراوە بە دەمی ئەو کەسانەی کەوا دەڵێن ئەو ڕاو بۆچوونەیان هەیە، هەروەکو لە گرتەیەکی ڤیدیۆی أبو إسحاق الحويني دەڵێت ئەو بوختانەم پێکراوە کە لێم پرسراوە گوایە من ڕام وابووە الإخوان المســـلمون یـان هەر لایەنێکی تر بچنە نـاو هەڵبژاردن و دەنگیان پێ بدرێ و دروستە چوونە ناو پەڕلەمان، دەڵێ نە لە کۆن گوتوومە و نە لە ئێســتا، لە پاشــان دەڵێ ئەوە درۆیە پێم هەڵبەســتراوە و بوختانە، دەڵێ منیش ڕازی

نیم فتوای ئەوە بدەم خەڵک بەشداربێ لە پرۆسەیەکی عەلمانی بێدینی کە لە سەرەتایەوە و تا چوونە ناویەوە هەمووی خراپە و تاوان و گوناە و شیرک و کوفرە.

لە کۆتایدا دەڵێین بە دڵنیاییەوە هەندێک لەوانەی کە بە مەرج و قەید ڕێگایان داوە کە ئەو کەس و لایەنانەی پاشگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە بچنە ناو پرۆسەی هەڵبژاردن و دەنگ بدەن و ببنە ئەندام لە ئەنجومەنەکانی یاسا دانان، ئەگەر ئەمڕۆ مابان و ئاگاداری ئەوەبان کە ڕوویداوە لە واقیعەکاندا ئەو کاتەی کە ئەوان فتوایاندا و دواتر کە خەڵکێک چوونە ناوی و بەشدارییان کردووە لە دەسەڵاتەکان و بە حیسابی خۆیان قۆناغ بە قۆناغ بیگۆڕن و ئەگەر بە مەرجەکانیشەوە بەشدارییان کردبێ، بۆ نموونە؛ ئەوەی ڕوویدا لە میسر و لە جەزائیر و لە فەلەستین و شوێنەکانی تریش، ئەمڕۆ کە دەرئەنجامەکەیان بۆ دەرکەوت نەهامەتی گەورەتر و کوشتن و ناموس بردن و زەلیل بوون و چەوسانەوەی خەڵکی بەخۆوە بینی و لێ هاتەجێ، ئەوە بە دڵنیاییەوە لێی پەشیمان دەبوونەوە و نەیاندەگووت و دەشیانزانی کە ڕاو بۆچوونێکی هەڵەیە و موسڵمانان قەتاوقەت بەو ڕێگایە کە ڕێگای پێغەمبەران نییە (علیهم الصلاة والسلام) وە الله تعالی بۆی دا نە ناون بەرەنگاری دەسەڵاتداران و بێدینی و شیرک و زوڵم ببنەوە ڕازی نەدەبوون و لێی دەگەڕانەوە، بەڕاستی لە ڕوانگەی ژیری و عەقڵیشدا ڕێگای تاقیکراوەی هەڵە گومانی تێدا نییە کە ئەنجامی

خراپی لێکەوتبێتەوە نەفامی و گەمژەییە جارێکی تر تاقی بکرێتەوە، جا بە گوێرەی قورئان و فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) قەتاوقەت ئەو ڕێگایە ناگونجێت بۆ گۆڕانکاری و گەیشـــتنە ئامانجی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی الله و حوکم کردن بە شــەریعەتەکەی لە مەیدانی واقیعدا، چونکە پێچەوانەی ڕێبازی الله و پەیڕەوەکانیەتی لە پێغەمبەران (علیهم الصـــلاة والســـلام) و میراتگران و شـــوێنکەوتوانیان وە توشـــبوونی گوناح و تاوان و سەرپێچیکردنە لە فەرمانەکانی شەرع و لادانە لێیان و توشبوونە بە هاوبەشی و کوفر، جا پشتیوانی الله بۆ ئەو کەسانە نامێنێ و نابێت کەوا دەچن تاوان و گوناح ئەنجام دەدەن، وە داڕێژرانی ئەو هەڵبژاردن و سیستەمەکە و بە شداریکردنیش بیری بێدینی و عەلمانیەتە لە ماسـۆنی جیهانی، بە دڵنیاییەوە قەتاوقەت ڕازی نەبوون و نابن لە کەســانێک کە ســەد لە ســـەد لێی ئەمین نەبن بیر و بۆچوون و خاڵ و کوفر و شـــیرکەکانیان تەواو بۆ جێبەجێ بکات.

کەواتە بە دڵنیاییەوە پشــتگیری الله شــیان نامێنێ ئەو کەســانە، وە ڕازیبوونی ماسـۆنیەتی جیهانی و کافر و موشریک و کوفری جیهانیش بە دەست ناهێنن، کورد گووتەنی لە هەڕێ و لە مەڕێش دەبن، بە داخەوە! دەبێ بەســـەر خۆیاندا بچنەوە، دەنا هەر بە شـــکســـت خواردوویی لە دونیادا دەمێننەوە و دواڕۆژیشـــی لەســـەر دادەنێن و دەیدۆڕێنن، جا با

بگەڕێینەوە و قیامەت و دوارۆژ بە بیر خۆمان بێنینەوە و تەوبە بکەین لە ڕێگا هەڵەکان و ڕێگای ڕاســـت و تەواو و ڕێبازی پێغەمبەری پێشـــەوا (ﷺ) بگرینەبەر، بۆ گەڕاندنەوەی حوکمی ئیسلام و بەشداریکردن لە هەر کار و ئیشێک لەپێناو الله تعالی.

## ڕای دووەم بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردن

**ڕای دووەم؛ دەڵێن بەشـــداریکردنی هەڵبژاردنی ئەو ســەردەمە بەو شـێوازەی هەیە لە سـیسـتەمی عەلمانیەت و دیموکراسـیەت چ وەکو بەربژێر (المرشـــح) چ وەکو دەنگـدەر (الـنـاخـب، المنتخـب) حەرامە و قەدەغەیە:** ئەمە ڕاو بۆچوونی هەندێک لەو نوســەر و لەو توێژەرەوانەیە و هەندێک لەوانەیە کە پرســیاریان لێکراوە و هەندێک لە بزوتنەوە و جوڵانەوەکان کە جیهادین، لەوانە؛ (شــیخ علی بن خضــیر الخضــیر، محمد ناصر الدين الألباني، مقبل بن هادي الوادعي، أبو نصرــ محمد بن عبد الله الإمام، محمدی بن عەبدولوهاب العبدلي، أبو إسحاقی الحويني، أبو عبد الرحمن الشنقيطي، عبد المنعيم مصطفى حليمة (کە بەناو بانگە بە أبو بصــير)، أبو أيمن المصرــي، أبو همام بكر بن عبد العزيز الأثري) وە دەتوانین بڵێین هەموو سەلەفییە جیهادیەکانی دونیا و هەندێک لە بزوتنەوە و جوڵانەوەکانی تر و خەڵکی تریش، وە توێژەرەوانی تریش هەن توێژینەوە و بەحسیان لە سەر کردووە، چ وەڵامدانەوەبێ بۆ ئەوانەی دروســتیان کردبوو چ ســەربەخۆ نوســیبێتیان، دەربارەی ئەو باس و بابەتە کە ئەوە دەسەلمێنن قەدەغەیە و حەرامە بەشداریکردنەکە.

## هەندێک لە بەڵگەکانی ڕای دووەم لە ژێر چەند سەرباسێکدا:

**سەرباسی یەکەم؛** یاسا دانان و شیرک و هاوبەشی و حەڵاڵ و حەرامکردنی لێ دەکەوێتەوە:

١-دەڵێن چوونە ناو پڕۆسەی هەڵبژاردن و ئەندامبوونی ئەنجومەنی یاسا دانان داننانە بە شیرک و هاوبەشی و گوناح و سیستەمی عەلمانیەت و دیموکراسی، یاسا دانان حاکمیەتی الله لە الله دەسێنێتەوە، چونکە حاکمیەت و یاسا دانان لە ڕوانگەی قورئان و فەرموودە تەنها بۆ الله یە هیچ کەسی تر ئەو مافەی نییە:

- الله تعالی فەرموویەتی: **﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ الْحَقَّ ۖ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ﴾ (الأنعام : ٥٧)**

واتە: حوکم و فەرمانڕەوایەتی تەنها هی الله یە و بۆ ئەوە و ئەوە ڕەوایەتی باس دەکات و بڕیاری پێ دەدات ئەو باشترین جیاکەرەوەیە لە نێوان ڕەوایەتی و نا ڕەوایەتی.

- الله تعالی فەرموویەتی: **﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (يوسف : ٤٠)**

واتە: حوکم و فەرمانڕەوایەتی تەنها بۆ الله یە فەرمانی کردووە تەنها ئەو بپەرسترێ ئەوەیە ڕێباز و ئاینی ڕێک و ڕاست بەڵام زۆربەی خەڵکی نایزانن.

● الله تعالى فەرموويەتى: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ۖ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ (يوسف : ٦٧)

واتە: حوكم و فەرمان ڕەوايەتى تەنها بۆ الله يە پشتم بەو بەستووە ئەوانەى پشت دەبەستن با پشـت بەو ببەسـتن (ئەوە وتەى يەعقوب پێغەمبەر بوو (ﷺ) كە بە كوڕەكانى گووت كە ڕەوانەى ميسرى كردن).

● الله تعالى فەرموويەتى: ﴿فَالْحُكْمُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْكَبِيرِ﴾ (غافر : ١٢)

واتە: سا حوكم و فەرمان ڕەوايەتى بۆ الله ى بڵند و بەرز و مەزنە.

● الله تعالى فەرموويەتى: ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾ (الكهف : ٢٦)

واتە: لە حوكم و فەرمان ڕەوايەتى الله هيچ كەس و شتێك هاوبەش نييە.

● الله تعالى فەرموويەتى: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ﴾ (الشورى : ٢١)

واتە: ئەوان هاوبەشانێكيان هەيە كە ياسايان لە ئاين بۆ دادەنێن كە الله ئەو مۆڵەتەى پێيان نەداوە.

جا خاوەنی ئەو ڕاو بۆچوونانە دەڵێن بەوەندە ئایەتانە و چەندین ئایەتی تریش ئەوانە تەنها نموونە بوون دەڵێن ئەوە دەردەکەوێت کەوا هیچ کەس و شـــتێک نابێ بکرێنە هاوبەش بۆ الله تعالى، لە حوکم و فەرماندا الله تاک و تەنهایە لە تەشریع و یاسا دانان و حوکم کردن.

جا پەڕلەمان و ئەندامەکانیان یا سا دادەنێن و بڕیار دەدەن و حوکم و دە سەڵات بۆ زۆرینە دەگەڕێننەوە لە یەکلاکردنەوەی یا ساکان و بڕیارەکان، کەواتە بوونە هاوبەش لەگەڵ الله و الله تعالى ئەو مافەی بە کەس نەداوە و ئەوان ئەو مافەیان لە الله تعالى بۆ خۆیان بڕیار داوە و دەیکەن کە یاسا دانانە.

٢-حەڵاڵ کردن و حەرام کردن تەنها مافی الله یە بۆ هیچ کەســێکی تر نییە حەڵاڵەکان حەرام بکات و حەرامەکان حەڵاڵ بکات، ئەوانەی الله تعالى بڕاندویەتیەوە و حەڵاڵیەتی پێداون یان حەرامیەت:

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿**اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ**﴾ **(التوبة : ٣١)**

واتە: جولەکەکان زاناکانیان و نەسرانیەکانیش دێر نشــینەکان و قەشــەکانیان گرتبوو بە پەرستراو جگە لە الله یان لەگەڵ الله دەیان پەرستن.

پێشەوا ئیبن کەسیر -رحمە اللە- لە تەفسیر و ڕاڤەی ئەو ئایەتەدا دەفەرمووێ: **(أي : حيث عدلتم عن أمر الله لكم وشرعه إلى قول غيره ، فقدمتم عليه غيره فهذا هو الشرك)** واتە: ئێوە لاتاندا لە فەرمانی اللە کە بە ئێوەی کردبوو لە شەرعی اللە بۆ قسەی جگە لە اللە، قسە و فەرمانی جگە لە اللە تان بە پێشی ئەوخست، ئا ئەوەیە شیرک و هاوبەشی.

## خاوەن ئەو ڕاو بۆچوونانە دەڵێن کاری سەرەکی تەواوی پەڕلەمان بریتییە لە دوو خاڵ:

١-یاسا دانان و دارشتنی سیستەمی کاری دەوڵەت بۆ ناوە و دەرەوە.

٢-چاودێریکردنی دەسەڵاتی جێبەجێکردن و دادپەروەری قەزائی بۆ جێبەجێکردنی دەستور و یاساکان.

کەواتە کورتەی باس و بابەت ئەوەیە کە ئەندامانی پەڕلەمان بڕیار دەدەن لە سەر یاساکان، هەموو باس و بابەتێکیش دەتواندرێ بدرێتە دەنگدان، بە ڕێژەی زۆرینە یەکلا دەکرێتەوە، بۆ نموونە؛ ئارەق کە سەد لە سەد اللە تعالی حەرامی کردووە لە قورئانی پیرۆزدا، ئەگەر دەنگی پێبدرێت زۆرینەی دەنگ بێنێت و ڕێگای پێ بدرێ یاسای بۆ دادەڕێژن و لە حەرامیەکەی حەلاڵ دەکرێ، زیناش بە هەمان شێوە، ئەگەر زۆرینەی دەنگ بە دەست

بێنێ بە ڕێگا و شوێنی یا سایی حەڵاڵ دەکرێت، دزیش بە هەمان شێوە کە الله تعالی بۆی داناوە بە مەرجە شـــەرعیەکانەوە ئەوەی دزی دەکات لەســـەری جێگیربێ دەبێ دەســـتی ببڕدرێ، بەڵام بە یاســـاکان کە لە پەڕلەمانەوە دەردەچێت زۆرجار بە زۆرینەی دەنگ ئەو سنورە شەرعیەیان بڕیوە و سنوری تری الله یش لە حدودەکان لایداوە، ئەو کاتە لە جیاتی دەست بڕین دەڵێن با زیندانی بکرێ، یان هەر یاسا و بڕیارێکی تر دەردەکەن.

جا ئەوەی بڕوای وابێت کە دروســـتە ئەو باس و بابەتانە قســـەیان لێبکرێت و بدرێتە دەنگدان، ئەوە کافر دەبێ بێ شک و گومان، وە حەرامێکی حەڵاڵ کردووە و ئەو یاسایەی الله دایناوە ئەو شکاندویەتی و لە جێگای یا سای الله یا سایەکی تری داناوە و خەڵکیش پابەند دەکات بە جێبەجێکردنی، کەواتە ڕێک پەڕلەمان لەو خاڵە و لێرەدا بت و سەنەمێکە دەپەرسترێت، ڕێگای پێدراوە ئەو خاڵ و شتانە جێبەجێ بکرێت.

کەواتە بەشـــداریکردن لە پڕۆســـەیەک کە ڕێگایە بۆ ئەو هاوبەشـــی و شـــیرکانە ســـەرەڕای ئەوەی هەر لە ڕێگاکەوە تێکەڵی نێر و مێ و چەندین گوناح و تاوانی تری لێدەکەوێتەوە و پارە بە فیڕۆدان و غەیبەت کردن و بەر بەرەکانێی نا شەرعیانە، جا بەڕا ستی ئەو دانپێدانانە شـــیرکەکە و لە ڕێگاش ئەو هەموو گوناح و تاوانانە بەناڕاســـتەوخۆ یان بەڕاســـتەوخۆیی بە دڵنیاییەوە حەرام و قەدەغەیە و ڕێگا پێدراو نییە.

پێشــەوا تەبەری -رحمه الله- لە تەفسـیری ئایەتەکەی سـوڕەتی التوبة دەفەرمووێ: **(إنهم لم يكونوا يصــومون لهم، ولا يصــلون لهم ولكنهم كانوا إذا احلوا لهم شــيئاً إستحلوه، وإذا حرموا عليهم شيئا أحله الله لهم حرموه، فتلك كانت ربوبيتهم)** واتە: ئەوان (جولەکە و نەسرانیەکان) ڕۆژویان بۆ زانا و قەشــەکان نەدەگرت، نوێژیان بۆیان نەدەکرد بەڵکو ئەوان ئەگەر شــتێکیان بۆیان حەڵاڵ کردبان ئەوە بە حەڵاڵیان وەردەگرت، ئەگەر لەوانەی اللـه بۆی حەڵاڵ کردبوون حەرامیـان کردبـا ئەوانیش بە دڵنیـاییەوە بە حەرامیان دەگرت، ئەوەبوو کەوا ئەوانیان بە پەرستراو گرتبوو.

جـا لە پەڕلەمـانیش حەڵاڵ حەرام دەکرێ و حەرامیش حەڵاڵ دەکرێ، کەواتە وەکو زاناکانی جولەکە و دێر نشینەکان و قە شەکانی نەسرانی دەکەن و خەڵکیش وەری دەگرن و کاری پێدەکەن یان بە ســەریاندا دەســەپێندرێ، ڕێک ئەو ئایەتە ئەوە دەگرێتەوە، وە پەڕلەمان و ئەندامەکانیان دەپەرســترێن و یاســای جگە لە الله دادەنێن و هەندێک جار حەڵاڵە بڕاوە سـەد لە سـەدەکان حەرام دەکەن و حەرامە بڕاوە سـەد لە سـەدەکان حەڵاڵ دەکەن.

٣-کەســێک بە حوکمی الله و پێغەمبەری الله ڕازی نەبێت یان تەنانەت دڵ تەنگبێت ئەوە بڕوای نییە:

• الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا**﴾ **(النساء : ٦٥)**

واتە: سوێند بە پەروەردگارت ئەی محمد (ﷺ) بڕوایان نەهێناوە تاوەکو تۆ نەکەنە فەرمان بەدەست و حاکم لەوانەی تێیدا ناکۆکن لەنێوانیاندا لە پاشانیش هیچ پێ ناخۆشییەکیان لە دڵدا نەبێت لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل کەچ نەکەن بە مل کەچییەکی تەواو.

پەڕلەمان نەوەک مل نادات بەڵکو ئەو فەرمان دەکات و بڕیارەکان دەردەکات بێجگە لە هی پێغەمبەر (ﷺ) و بە پێچەوانەی هی پێغەمبەریش، وە هیچ حیسابێکیش لە بڕیارەکان بۆ پێغەمبەری الله (ﷺ) و قورئانی پیرۆز ناکەن، بەڵکو بە گوێرەی هەوا و هەوەسیان ڕەتیدەکەنەوە و بە بڕیارەکان ڕازی نابن.

٤-هەموو یاسا و ڕێباز و بڕیارێک جگە لە هی الله نەفامی و گومڕاییە:

• الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ**﴾ **(المائدة : ٥٠)**

واتە: ئایە فەرمان و حوکمی نەفامیتان دەوێت؟ ئایە کێ حوکم و بڕیاری لە هی الله جوان و چاکترە؟ لای کەسانێک کە بڕوای تەواویان هەیە.

بە دڵنیاییەوە لە حوکم و یاســـای الله باشـــتر و چاکتر نییە، وەکو الله تعالی فەرمووی: ﴿**وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ**﴾ بەڵام یاساکانی پەرلەمان و دەستوورەکانی و هەڵبژاردن لە چوارچێوەی عەلمانیەت و دیموکرا سی نەفامیەتە و جگە لە یا سا و بڕیاری الله یە، لەبەرئەوە دروست نییە بەشداریکردن لەو پرۆسەیە و بڕوابوون بەو نەفامیەتیە.

٥-شـــورەیحی کوڕی هانیء دەگێڕێتەوە، کە باوکی هانیئە، کاتێ بە نوێنەرایەتی ڕۆیشـــتن بۆ لای پێغەمبەری الله (ﷺ) بیستی بە هانیء دەڵێن: ئەبو حەکەم، پێغەمبەری الله (ﷺ)پێی فەرموو: بێگومـــان تەنهـــا الله حەکەمە، بۆچی بە ئەبو حەکەم بـــانـــگ دەکرێی؟ وتی: کەســـوکارەکەم ئەگەر جیاوازی تێبکەوێ من بانگ دەکەن، هەردوو کۆمەڵەکە ڕازی دەبن بە بڕیارم، فەرمووی: چی لەمە چاکترە، چەند منداڵت هەیە؟ وتی: شـــورەیح و عبدالله و موســـلیم، فەرمووی: کامەیان گەورەترینیانە؟ وتی: شـــورەیح، فەرمووی: کەواتە تۆ ئەبو شورەیحیت، نزای کرد بۆ خۆی و منداڵەکەشی[١].

ئیبن ئەســـیر -رحمە الله- لە النهایة دەربارەی ئەو فەرموودەیە فەرموویەتی: **(وانما كره له ذلك، لان لا يشـــارك الله في صـــفاته)** واتە: پێغەمبەری پێشـــەوا (ﷺ) ئەوەی پێ

---

[١] ئەوە شیان نە سائی لە سونەنەکەی لە -کتاب اداب القضاة- لە بابی -إذا حكم رجلا فقضى بينهم- (ژ: ٥٣٨٧) هێناویێتی، وە ئەبو داودیش لە -کتاب الاداب- لە باسی -تغيير الاسم القبيح- (ژ: ٤٩٥٥) هێناوێتی.

ناپەســـەندبوو بۆ هانیئ کەوا کونیەی بە ئەبو حەکەم بێ، لەبەر ئەوە بوو هەتا لەیەکێک لە سیفەتە تایبەتەکانی الله نەبێتە هاوبەش کە حوکم کردن و حاکمیەتە.

٦-لە دۆعایەکانی صــحیح هاتووە بە ســەنەدەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(والیك حاكمت)**[1] واتە: حوکم و فەرمان بە تۆوە دەدەم و بۆلای تۆ دەگەڕێنمەوە.

ئیبن ئەسیر لە قسەکردن لەسەر ئەو فەرمودەش فەرموویەتی: **(والیك رفعت الحكم یا رب، ولا حكم إلا لك)** واتە: حوکم و فەرمان ڕەوایەتیەکان هەمووی بۆلای تۆ دەگەڕێنمەوە، هیچ حوکم و فەرمانێکی تر نییە جگە لە هی تۆ کەوا قبوڵمبێ و بڕوام پێی هەبێ.

کەواتە لەو فەرموودانەش دەرکەوت کە تەنها الله حاکمە و فەرمانڕەوایە، هەر ئەوە مافی یاســا دانانی هەیە و بڕیاری یەکلاکەرەوە دەدا، بۆ هیچ کەس و شــتێکی تر نییە، جا بۆ پەڕلەمانیش نییە یا سا دابنێت و بڕیاری یەکلاکەرەوە بدا لە باس و بابەتەکان، تەنها بۆ الله یە.

لە کۆی ئەو باس و ئایە تانەی ڕابردوو وە فەرمووده کانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە مان بۆ دەردەکەوێ کە کەس نابێت و بۆی نییە جگە لە الله تعالی یاسا و تەشریع بکات و دابنێت، وە ئەوەی بڕوای وابێت یان وابکات ئەوە بڕوای بە هاوبەش هەیە و شــیرکی کردووە،

---

[1] پێشەوا بوخاری لە سەحیحەکەی لە -الکتاب التهجد- (ژ: ١١٢٠) هێناوێتی.

کەســـیش بۆی نییە حەرامە کان کە الله تعالی قەدەغەی کردوون حەڵاڵیان بکات، بە پێچەوانەشـــەوە کەســـیش بۆی نییە حەڵاڵەکان کە الله تعالی حەڵاڵی کردوون حەرامیان بکات ئەو کار و ئیشانە تەنها بۆ الله تعالی یە، هەر ئەوە یا سا دادەنێ و بەرنامە دادەنێ و جگە لە یاســـا و بەرنامەی ئەو هەمووی گومڕایی و نەفامیەتە پڕن لە کەم وکورتی، هەر کەســـێکیش فەرمان و بڕیار و یاســـاکان و حەرامەکان کە حەڵاڵ بوون و حەڵاڵەکان کە حەرام بوون لە هەر کەس و شـــتێک و لایەنێک وەربگرێت بڕوای پێی هەبێت یان مل بـدات بۆی و کـاری پێ بکـات بەبێ زۆرەملێ و نـاچـارکردن و ئیکراه بە مەرجە شەرعیەکانیەوە ئەوە ئەو کەس و لایەنەی بە تەئکید و بە دڵنیایی پەرستوە و بە شەریک و هاوبەشی الله ی داناوە و شیرک و هاوبەشی ئەنجامداوە.

## ئەگەر سەرنجی هەڵبژاردن و چوونە ناو ئەنجومەنی یاسا دانان و پەڕلەمان بدەین زۆر بە ڕوون و ئاشکرایی ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

١-مافی یاسا دانان بەخۆیان دەدەن و یاسا دەردەکەن و خەڵکیشی پێوە پابەند دەکەن.

٢-گوێ بە فەرمانە کانی الله و پێغەمبەر (ﷺ) نادەن لە بە حەڵاڵ دانان و حەرامکردنی شتەکان.

٣-زۆرینەی دەنگ لەلایان کار و یاسـا و بڕیارەکان یەکلایی دەکاتەوە، ئەگەر پێچەوانەش بێ لەگەڵ فەرمانەکانی الله و پێغەمبەری الله ش (ﷺ).

کەواتە ئەوانەی بەشـدار دەبن و پلەی ئەندامیەت بە دەسـت دێنن تەنها ئەوەیان بۆ هەیە گفتوگۆیەکی نەرم و کورت لە ماوە پێدانێکی دیاریکراو لەلایەن سـەرۆکایەتی پەڕلەمانەوە لە بازنەی یاساکانەوە ئەنجام بدەن، بەرهەڵستی و ناڕەزایەتیەکەیان ناخوات، ئەگەر زۆرینە دەنگ بە یاسـاکە بدات، دەبێ لە جێگای خۆیان دابنیشـن و ئەوپەڕی ئەوەیان بۆ هەیە کە هۆڵەکە بەجێ بهێڵن، بەڵام لە دواتر بێنەوە ناو هۆڵەکە و بەشدار ببنەوە و دەست لە ملانێ بکەن لەگەڵ ئە ندامە کان کەوا شـیرکیان کردووە یان کوفر یان کردووە یان حەڵاڵیان حەرامکردوە و حەرامیان حەڵاڵ کردووە.

کەواتە دەرکەوت بەو بەڵگانە کارەکە هاوبەشـییە و تاوانە و نابێت بکرێت و قەدەغە و حەرامە.

**سەرباسی دووەم؛** داننانە بە دیموکراسیەت و عەلمانیەت:

ئەمجارە دەڵێین چوونە ناو پرۆسـەی هەڵبژاردن و عەلمانیەت و دیموکراسـی پێچەوانەی هەڵسـوکەوت و ژیانی پێغەمبەری پێشـەوا (ﷺ) و چوار خەلیفە ڕاشـیدەکە و پێشـینانی چاکە.

**سەرەتا ئەگەر بە خێرایی تەماشایەکی ژیانی پێغەمبەری الله (ﷺ) بکەین لە مەککەدا و هەڵسوکەوت و کاری لەگەڵ قورەیشیەکان ئەوانەمان بۆ بە دیاردەکەوێت:**

١-پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ڕاشکاوانە بانگەوازی بۆ الله بەیەکگرتن و تەوحید دەکرد و شیرک و هاوبەشی ڕەتدەکردەوە.

٢-پێغەمبەری الله (ﷺ) بەبێ ماندوبوون و بەردەوام کۆڵی نەدەدا لە بانگەوازیەکەی و بەشێوازی جۆراوجۆر لەگەڵیان بانگەوازی بۆلای الله دەکرد.

٣-هاوەڵەکانی ئامادە دەکرد لە بواری بیروبڕوا و بەردەوامیەتی و ئارامگرتن لەسەر ئازار و ئەشکەنجەکان و ئومێدی سەرکەوتنی پێدەدان و دڵی دەدانەوە لە ناخۆشی و ناڕەحەتیەکان.

٤-ئارامی دەگرت لەسەر ئەشکەنجە و ئازارە جۆراوجۆرەکانی قورەیش.

٥- پێغەمبەری الله (ﷺ) ملی نەدەدا بۆ تەماح و داواکاریەکانی سەرانی قورەیش و بە بوێرانە ڕاستیەکانی تێ دەگەیاندن و بۆی دەگووتن و دانەدەبەزی لە بیروبڕوا و فەرمانەکانی الله و ئاینی ئیسلام.

٦-بۆ جارێکیش و ڕۆژێک نەبووە خۆی بێدەنگ بکات دەربارەی ناساندنی بتەکان و ئەوانەی دەیانپەرست بێجگە لە الله تعالی و ڕسواکردنیان.

تەنها ئەگەر وەک نموونە سـەرنج بدەینە هەندێک دیمەن و هەڵسـوکەوتی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککە لەگەڵ سـەرانی قورەیش ئەو ڕاسـتیانەمان هەمووی بۆ ڕووندەبێتەوە، وە ئەوە دەبێتە وەڵام بۆ ئەو کەسـانەی کەوا بەشـداری دەکەن لە پرۆسـەی هەڵبژاردن و پروپاگەندە و چوونە نێو پەرلەمان، کە دەڵێن ئێمە مەبەسـتمان گەڕاندنەوەی شـەریعەتی ئیسلامە یان مەبەستمان ئەوەیە ڕێبازەکەی پێغەمبەر (ﷺ) پەیڕەو بکەین.

ئەوەتا پێشەوا ترمزی -رحمه الله- گوتوویەتی پێغەمبەری الله (ﷺ) سێ ساڵ بە شاراوەیی لە مەککەدا بوو، لە پاشـان لە چوارەمدا ڕایگەیاند و ئاشـکرای کرد، ١٠ سـاڵ خەڵکی بانگکرد، لەهەر سـاڵێک لەکاتی حەج بەشـداری دەکرد و شـوێن خەڵکی دەکەوت بەرەو ماڵە کانیان لە (عكاض و محنة و ذي المجاز) داوای لێدەکردن پە نای بدەن، تاوەکو پەیامەکانی الله بگەیەنێت و بەهەشتیان بۆ هەیە، کەسێکی نەدەدۆزیەوە پارێزگاری لێبکەن و سەریبخەن تاوەکو وای لێهاتبوو پرسیاری لە هۆزو تیرەکان و ماڵەکانیان دەکرد، تیرە بە تیرە دەگەڕا بەناویاندا و دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە بڵێن هیچ پەرسـتراوێکی حەق و ڕەوا نییە جگە لە الله سەرفراز دەبن، دەسەڵاتی عەرەبەکان پێوەی بەدەست دەهێنن، وە گەردەن کەچی عەجەمەکانی پێوە بەدەسـت دەهێنن، ئەگەر مردیشـن، ئەوە دەبنە پاشـا و خاوەن بەهەشت، جا سەرانی قورەیش کەوتنە ئەشکەنجە و ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی،

قسەی زۆر ناشرینیان پێدەگووت، ڕێگایان پێدەگرت لە دەعوە و بانگەوازیەکەی، ئازاریان دەدا، ڕواو ڕووی دەوەستانەوە، بەردیان تێدەگرت، جوێنی ناشرینیان پێدەفرۆشت، پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرامبەریاندا ئارامگربوو.

یەکێک لە جارەکان کە موسڵمانیەتی بوونی حەمزەی مامی پێوە هاتەجێ، کە لە سیرەدا باس دەکرێ، کە جاریەیەکی عەبدوڵای کوڕی جەدعان کە یەکێک لە ژورەکانیان دەیڕوانی بەسەر کێوی صفاء، پێغەمبەر بەیانییەک (ﷺ) لەوێ بوو ئەبو جەهل ڕێگای پێگرت و قسەی نەشیاوی پێگووت، وردە بەردی تێدەگرت تا دەم و چاوی پێغەمبەر (ﷺ) هەمووی بە خوێندا هات ئەو ڕدێنە پان و پۆڕە جوانەی سور بوو لە ناو خوێنەکان، جاریەکە دڵی پێی دەسوتا و هیچیشی پێ نەدەکرا، ئەوە لەبەر ئەوە نەبوو پێغەمبەر (ﷺ) بێ جورئەت و بێغیرەتە، حاشا و حاشاکی ئەو، لەهەموو خەڵک و مەردووم بەغیرەتتر بووە، تەنها غیرەتی نەگەشتوەتە غیرەتی الله تعالی، وەکو پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خۆی فەرموویەتی، بەڵام ڕێگای پێ نەدرا بوو لەلای الله تعالی کەوا بەرهەڵستی ئەبو جەهل بکات بە لێدان و بەرەنگار بوونەوەی دەست.

ئەوەبوو لە کۆتاییەکەیدا کاتێک جاریەکە حەمزەی پاڵەوانی مامی پێغەمبەری (ﷺ) بینی بەخۆی و بە تیر و کەوانەکەی لەگەڵ ئەسپە چاکەکەی دەهاتەوە لە ڕاو ڕێگای پێگرت،

گووتی لە کویێ بووی ئەی حەمزە؟ خۆت لە کوێ شـــاردبوویەوە؟ ئەمڕۆ من بینیم برازایەکەت محمد (ﷺ) ئەبو جەهل لەســەر کێوی صــفاء ڕێگای پێگرتبوو، قســەی نە شیاوی پێ دەگووت، بە بەردی نوک باریک لەناو چاوانی دەدا خوێنی پیادا هاتە خوار، ئەگەر لەوێ بای دڵت پێی دەسوتا و سەرت دەخست، حەمزە غیرەتی خزمایەتی جوڵا و الله تعالی یش دڵی نەرم کردبوو بۆئەوەی هیدایەتی ببێ و ببێتە موســڵمان، ئەوەبوو دڵی تەنگ بوو بە هاوارەوە گووتیە جاریەکە کوا لە کوێیە ئێستا ئەبو جەهل؟ وتی وابزانم وا لە دارونەدوەیە وا لە پەڕلە مانەکە یان دانیشـــتووە، بەبێ یەک و دوو بەغیرە تانە حەمزەی پاڵەوان ڕۆیشـــت بەرەو دارونەدوە، کە چوو لەوێ ئەبو جەهل بۆ خزم و کەســەکان بۆ قورەیش و کافرەکان دەیگێڕایەوە ئەو ڕۆژە چیکردووە لە پێغەمبەری پێشــەوا (ﷺ)، وە پێغەمبەریش (ﷺ) وەڵامی نەداوەتەوە، حەمزە دەچێ و یەکسەر لەسەر سەری ئەبو جەهل دەوەستێ و هەتا کەوانی تیرەکەی دەگرێ لەناو چەوانی دەدا و پێشە سەری لەت دەکا و خوێنی پێدا دێتە خوار، (بەنو مەخزومیەکان) خزم و کەس و دارودەســتەی ئەبو جەهل هەڵدەســتنەوە لێی، بەڵام ئەبو جەهل دەزانێ لەگەڵ حەمزە ناتوانێت دەربچێ، هەرچی لەگەڵ بکات هەر دۆڕاوە (حەمزە ئەوەندە پاڵەوان بووە)، هەر ئەوەی بۆ دەمێنێتەوە دەڵێ ڕاوەســتن و هیچ نەکەن، بەنو هاشــمیش لەولایەوە هاتن بەرگری بکەن لە حەمزە، وتی

نەخێر ئەوە برازایەکەی من یەخەم پێ گرتبوو، من قسەم پێ گوتبوو (قسەی نا شیاو)، وە من بەردم تێی گرتبوو، هات تۆڵەی خۆی ستاندەوە.

حەمزە لەکاتی لێدانەکەدا بەدەنگێکی بەرزەوە و جەهوەرییەوە هاواری کرد بە سەر سەری ئەبو جەهل و هەموو موشریک و کافرەکان، وتی وات لێدێت و لێی دەدەی لە برازایەکەم؟ نازانی من چوومەتە سەر دین و ڕێبازەکەی ئەو؟ من بەدوای ئەو کەوتووم، ئەوەبوو حەمزە ئەو قسەیە کاری تێی کرد و نەیویست بە درۆزن دەربێ، ڕۆیشت بەدوای پێغەمبەر گەڕا (ﷺ) لە کۆتاییەکەی دەچێتە خرمەتی و دەبێتە موسڵمان، لەسەر یەکێک لە ڕاو بۆچوونەکان ئەوە تەنها سێ ڕۆژ پێش موسڵمان بوونی عومەری کوڕی خەتاب بووە (رضي الله عنه)، لە پاشان عومەریش دەبێتە موسڵمان، ئینجا عومەر و حەمزە دەبنە پارێزەر و پاسەوان بۆ ئەوەندە موسڵمانانەی کە لەناو ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم کۆدەبوونەوە، وانەی تەوحید و الله بەیەکگرتنیان دەخوێند لەخزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، فێری ئەوە دەکران کوفر بکەن بە طاغوت، بەربەرە کانێی طاغوت و موشریکە کان بکەن، بت و سەنەمە کان هەڵبوەشێننەوە، فێرە غیرەتی دەکردن پێغەمبەر (ﷺ)، فێری ئەوەی دەکردن خۆڕاگربن بەهەشتیان بۆ هەیە.

ئەوەبوو لە کۆتاییەکەیدا هاتن لەلای کەعبەدا وەســتان و حەمزەی پاڵەوان لەلای ڕاســتی ڕیزی موســڵمانەکان و عومەری پاڵەوانیش لەلای چەپیەوە و پێغەمبەریش (ﷺ) لە ناوە ڕاستەکەیدا، (لا إله إلا الله) یان ئاشکراکردوو گەیاندیان.

پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککە بەو شــێوەیە ژییــا، بۆ جــارێکیش دڵی نەیبرد بچێتە نــاو دارونەدوەکە و پەڕلەمانەکەی قورەیشیەکان، ببێتە ئەندام لەوێ بەرهەڵستی بکات، دەیزانی ئەوە ڕێباز و ڕێگای الله تعالى نییە و لەوێوە هیچ سوود و کەڵکێکی نابێت، ئەگەر سوود و کەڵکێکی کەمیشــی هەبێت، بەدڵنیاییەوە ئەوە هەڵەیە و خەلەلە، هەڵوەشــاندنەوەی عەقیدە و بیروبڕوایەکەی خۆیەتی و تەوحیدی پێوە هەڵدەوە شێتەوە و شیرکی پێوە ئەنجام دەدرێ و دابەزین دەبێ لە بیروبڕوای و لە خاڵەکانی تری ئیســـلام، ئەگەر هەندێک بەرژەوەندی کەمیشی پێ بەدەستبێ، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی هەڵنەبژارد ئارامی گرت لەسەر ئازار و ئەشکەنجەکان، تەوحیدی گەیاند سەحابیەکانی لەسەر ئەوە پێدەگەیاند کەوا تەنها الله بپەرستن و کوفر بکەن بە طاغوت و ڕۆژێکیان دادێ ئەو کاتە سەردەکەون بەسەریان و بەڵکو جەنگ و جیهاد بەرپابکەن، ئەو ڕێگایانەی هەڵبژارد.

لەپاشان قورەیشیەکان کەوا بینیان پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ڕۆژ بە ڕۆژ ئەوانەی شوێنی دەکەون زیاد دەبێت، ئەو کاتە هاتن چەند پێشـــنیارێکیان کرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، کە

بەڵگەی حاشــا هەڵنەگر و ڕاشــکاوانەی لێ وەردەگیرێ ســەبارەت بەو ســەردەمەی ئێمە، چوونە ناو هەڵبژاردن و ئەو پرۆســەی و دەســەڵات وەرگرتن لە کەســانێک کەوا لەســەر ڕێبازی الله و پێغەمبەری پێشــەوا (ﷺ) نەبن لا یا ندابێت و گومڕابووبن و مەنهەج و پرۆگرامەکەیان مەنهەج و پرۆگرامێکی کوفری و شیرکی بێت.

جا یەک لە جارەکان وەکو لە ســیرەدا هاتووە کە پێغەمبەری پێشــەوا (ﷺ) دەچێتە ناو مزگەوت و بەتەنها دەبێ واتە ڕووە و کەعبە و لە حەڕەمی مەککەدا و لە حەڕەمی کەعبەدا بۆ نوێژ خوێندن، لەولاشــەوە باوکی وەلید کە عوتبە[1]ی ناوبووە لەگەڵ قوڕەیشــیەکان دانیشــتووە و لە کۆبونەوەدایە پێی گووتن و بۆی پێشــنیار کردن، بۆچی نەچێ بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) چەند قســەیەکی لەگەڵ بکات؟ بەڵکو هەندێکی لێ وەربگرێ، جابری کوڕی عەبدوڵا (رضي الله عنهم) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ: **(اجتمعت يوما فقالوا: انظروا أعلَمَكم بالســحر والكهانة والشــعر، فليأت هذا الرجل الذي فرّق جماعتنا، وشــتت أمرنا وعاب ديننا، فليكلمه، ولننظر ماذا يرد عليه. فقالوا: ما نعلم أحدا غير**

[1] عوتبە کەســێکی ناودار و قســەزان و ســیاســەتمەداری ئەوکات بووە، وە دەم ڕاســت بووە بۆ تیرەیەک لە تیرەکانی ناو قوڕەیشیەکان و گەورە بووە لەناو گەل و هۆز و تیرەکەی خۆیدا و بەڕێزەوە تەماشایان دەکرد و قسەزانیش بووە.

**عتبة بن ربيعة**[1] قورەیشـــیەکان ڕۆژێک کۆبونەوە گووتیان: بڕوانن کێ لە ئێوە زاناترە بە سـیحر و جادوو و بە فاڵچیایەتی و بە شـعر و هۆنراوە، بابچێتە لای ئەو پیاوە کە محمدە (ﷺ) بڕوانن و تاماشـــا بکەن ئەو کۆمەڵەی ئێمەی پەرتەوازە کردووە، ئەو هێز و توانای ئێمەی کەمکردووەتەوە و دینی ئێمەی عەیبدار کردووە، با قسـەی لەگەڵ بکات، بزانێ چ وەڵامێکی دەبێ بەرامبەری تاوەکو بزانین چی دەوێ لە ئێمە. بەیەکدەنگی قورەیشـــیەکان گووتیان: ئێمە کەسـێکی وا ناناسـین جگە لە عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، کە ئەو سـیفەت و ئاوەڵناوانەی لێ بێتەجێ و بینێرین و ڕەوانەی بکەین.

ابن إسـحاق یش لە ڕیوایەت و گێڕانەوەیەکی تر بەو شـێوازەی گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێک بە تەنها لەناو مزگەوت بوو، عوتبەش کە گەورە بوو لەناو تیرەکەی خۆی لە نادی دانیشـــتبوو لە پەڕلەمانەکەیان و ڕایان دەگۆڕییەوە لەگەڵ خەڵکەکەدا، ئەویش کە پێغەمبەری بینی (ﷺ) تەنها چووە مزگەوت، پێشـنیاری کرد گووتی بۆ نەچمە لای محمد (ﷺ) قسەی لەگەڵ بکەم و هەندێک شتی پێ بڵێم؟ بەڵکو هەندێکیانمان لێ وەربگرێت،

---

[1] ئیبنو ئەبی شەیبە و ئەبو یەعلا و حاکم و بەیهەقی لە دەلائیل و ئەبو نەعیم لە دەلائیل گێڕاویێتیانەوە، کە حاکم بە سەحیحی داناوە و ئیمامی زەهەبیش لەگەڵی ڕێککەوتووە و دەفەرمووێ ڕاســتە بەگشــتی زانایانی مێژوو نووس و ئەوانەی ســیرەیان نوسیوەتەوە دەڵێن ئەو ڕیوایەت و گێڕانەوەیە حەسەنە و قبوڵە و وەردەگیرێ وەکو؛ دکتۆر ئیبراهیم عەلی (ژ: ٨٠) لە سەحیح و سیرەکەدا هێناویەتیەوە و بەحەسەن سەنەدەکە و مەتنەکەی ئەو گێڕانەوەی داناوە.

جا چی بویت بەڵکو پێی بدەین تاوەکو وازمان لێ بهێنێت[1]، کاتێک ڕێگایان بە عوتبەدا و عوتبە هاتە لای پێغەمبەری پێشـــەوا (ﷺ) و پێی گووت ئەی برازام ئەی کوڕی برام تۆ دەزانی ڕێز و پلە و پایەت هەیە لەناو عەشـــیرەتەکەت (هی بنەماڵە و نەژادەکەت)، وە تۆ بۆخۆشت سەنگین و بەڕێزی، جێگات هەیە لەناو عەشیرەتەکەت و بەڕێز تەمەشا دەکرای، تۆ شتێکی گەورەت بۆ گەلەکەت هێناوە، ئەو کۆمەڵ بوونەی هەیانبوو (یەک دەنگیەکەیان) تۆ پەرتەوازەتکردن، خەونەکانیانت پوچەڵ کردووەتەوە، ئاین و پەرســـتراوەکانی ئەوانت عەیبدار کردووە، باوک و باپیرەکانی ئەوانت کافر کردووە، هەندێک شـــت و کارت پێشکەش دەکەم و پێشنیارم هەیە ئەگەر تێبڕوانی هەندێکیانم لێ وەربگریت، پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵامیدا فەرمووی: **(قل يا أب الوليد أسمعك)** دەی تۆ بیانڵێ ئەی باوکی وەلید منیش گوێبیســـت دەبم، عوتبە گووتی ئەی برازام ئەی کوڕی برام ئەگەر بەو کارەتەوە دەتەوێ پارە و سامانت دەستکەوێت لە سامانەکانمان ئەوەندەت پێدەدەین تاوەکو پارە و ســامانت لە هەموومان زیاتربێ، وە ئەگەر پلە و پایە و شــکۆداریشــت پێیەوە دەوێت ئەوە دەتکەینە پلەداری خۆمان هیچ کارێک بەبێ تۆ یەکلا ناکەینەوە و نابڕێنینەوە، ئەگەر دەتەوێت بتکەینە پاشــا و ســەرۆکی خۆمان ئەوە دەتکەینە ســەرۆک و پاشــای خۆمان، وە

[1] ئەوە لەو کاتەدا بوو کە ئیمامی حەمزە (رضي الله عنه) گووتمان تازە بوو بووە موسڵمان، قورەیشیەکان ترسیان لێ نیشتبوو.

ئەگەر جنۆکەت توشـــبووە و کارەکەت دەروونییە ناتوانی لە خۆتی دووربکەیتەوە و ڕەتی بکەیتەوە پارە سەرف دەکەین و پزیشکت بۆ دەخوازین و دابین دەکەین، وە ئەگەر حەزت بە ژنە ئەو ژنەی لە قوڕەیشیەکان دەتەوێت دە ستنیشانی بکە با بیکەینە هاو سەرت و پێتی بدەین، لە دوای ئەوەی باوکی وەلید لە پێشنیارەکانی بوەوە پێغەمبەری پێ شەوا (ﷺ) پێی فەرموو: **(أفرغت يا أب الوليد)** بەتاڵ و تەواو بووی لە قســەکانت ئەی باوکی وەلید؟ ئەویش گووتی بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: **﴿حم * تَنْزِيـلٌ مِنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * كِتَابٌ فُصِّلَتْ آَيَاتُهُ قُرْآَنًا عَرَبِيًّا لِقَوْمٍ يَعْلَـمُونَ * بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْــمَعُونَ * وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آَذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنْ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ * قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِلْــمُشْرِكِينَ * الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ بِالْآَخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ * إِنَّ الَّذِينَ آَمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّــالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ * قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَـمِينَ * وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَــوَاءً لِلسَّائِلِينَ * ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ اِئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ * فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّــمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَــابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ * فَإِنْ أَعْرَضُــوا فَقُلْ أَنْذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾ (فصلت : ١-١٣)** واتە: اللە چاکتر دەزانێ

مەبەستی چییە لەو پیتانەی سەرەتای سوڕەتەکان * قورئان لە الله ی خاوەن بەزەیی فراوان و گەیەنەر بۆ بەزەییەکەی دابەزیوە * پەڕاوێکە بەڵگەکانی ڕوون کراوەتەوە (لێك جیاکراوەتەوە) قورئانێکە بە زمانی عەرەبی (هاتووە) بۆ گەلێك کە شارەزان و دەزانن * قورئان موژدە دەری ترسێنەرە بەڵام زۆربەی کافرانی قوڕەیش پشتیان تێکردووە و گوێی بۆ ناگرن و لێی تێناگەن * قوڕەیشیەکان گووتیان دڵەکانمان پێچراوە گوێچکەکانمان مسی تێدایە و تێکراوە لەوەی بۆمانت هێناوە ئەی محمد (ﷺ) ئەوەی بانگەوازیمان بۆی دەکەی ئێمە گوێمان لێ نییە (واتە مسمان لە گوێدایە و گوێی پێ نادەین) و دڵمان پێچراوەیە وەری ناگرین و لەنێوان ئێمە و ئێوە ئەی محمد (ﷺ) پەردە هەیە تۆ بە ڕێگای خۆت بڕۆ و کار بکە ئێمەش بە ڕێگای خۆمان دەڕۆین و کار دەکەین * الله تعالی فەرمووی بڵێ منیش تەنها مرۆڤێکم لە مرۆڤەکان وەکو ئێوە تەنها وەحیم بۆ هاتووە لەلای الله تعالی بەڕاستی پەرستراوتانە و پەرستراوێکی یەک و تەنهایە ڕاست و ڕێکبن بۆلای ئەو تەنها ئەو بپەرستن و بەو شێوازەی فەرمانی پێتان کردووە داوای لێبوردنیشی لێبکەن لە ڕابردووتان لەناوچوون بۆ هاوبەش بڕیاردەرانە * بەڕاستی ئەوانەی کەوا زەکات[1]ی ماڵی الله تعالی نادەن ئەوان

[1] زەکات لێرە مەبەست لێی یان چاکە و خێر و خۆ پاک کردنەوەکانە یان چاکە و خێر و صەدەقەیە یان زەکاتی واجبی ماڵی الله تعالی یە ئیختیلاف و جیاوازی لەنێوان توێژەرەوانی قورئان هەیە.

بێ بڕوان وە کافرن بە قیامەت و بە زەکات و بە الله تعالی * ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کار و کردەوەی چاکیان کردووە پاداشتێکی نەبڕاوەیان بۆ هەیە * ئێوەن ئەی قوڕەیشیەکان و کافرەکان کافر بوون بە الله تعالی بەو الله یەی کە زەوی بەدی هێناوە لە دوو ڕۆژدا ئێوە هاو وێنەی بۆ بڕیار دەدەن ئا ئەوەیە پەروەردگاری جیهانیان * وە لە سەر زەوی دا شاخی زۆری داناوە وە پیت و فەڕی تێ خستووە وە بژێوی (هەموو گیانداریکی) لە زەوی دا دیاری کرد لە ماوەی چوار ڕۆژدا بەیەکسانی بۆ گشت داواکەران * لە پا شان ڕووی کردە ئاسمان لە کاتێکدا کە دوکەڵ بوو ئینجا بە ئاسمان و بە زەوی فەرموو: وەرن بەویستی خۆتان یا بە ناچاری (بێنە ژێر فەرمانم) هەر دووکیان وتیان بە ویستی خۆمان هاتین * ئەو سا حەوت ئا سمانی لە دوو ڕۆژدا درو ست کرد وە هەر ئا سمانەی فەرمانی کاری خۆی بۆ نارد وە ئاسمانی دونیامان بە چرایانێك (ئەستێرەکان) ڕازاندەوە و پارێزراوە (لە گوێ گرتنی شەیتانەکان) ئەوە بڕیاری الله ی زاڵی بەدەسەڵاتە * جا ئەگەر ڕوویان وەرگێڕا ئەوە بڵێ بە هەورە تریشقەیەك (بروسکەیەك) دەتانترسێنم کە دای لە هۆزەکەی عاد و سەموود.

کەواتە ئەوەمان بۆ بەدیار دەکەوێت، پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) نەچووە سەر ڕاو بۆچوونەکانی قوڕەیش و کافر و موشریکەکان، بەڵکو ئاوای وەڵام دانەوە و پشتی تێکردن.

کاتێک عوتبە گوێبیســـتی بوو پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: **(قَدْ سَــمِعْتَ يَا أَبَا الْوَلِيدِ مَا سَمِعْتَ، فَأَنْتَ وَذَاكَ)** ئەوەی گوێبیستی بووی لەمنەوە گوێبیســتی بووی، تۆ و ئەوە واتە هیچ وەڵامێکی ترم نییە (جگە لەوە)، عوتبە هەســـتا گەڕایەوە بۆلای هاوڕێکانی و لە دوورەوە کە عوتبەیان بینی بەرەو لای ئەوان دەچووەوە هەندێکیان بە هەندێکیان دەگووت **(نحلف بالله لقد جاءكم أبو الوليد بغير الوجه الذي ذهب به)** ســـوێند دەخۆین بە الله بەو ڕووەی لەلای ئێمە ڕۆیشـــــت باوکی وەلید بە جگە لەو ڕووە گەڕایەوە بۆلامان، کە گەیشــتەوە لایان و پێیان گووت چیت کرد و چیت ئەنجامدا ئەی باوکی وەلید، گووتی من قسەیەکم بیست سوێند بە الله نمونەیەکم نەبیستووە لەو قسانە، نە جادوو و سیحر بوو نە شیعر و هۆنراوە بوو نە کەهانە و فاڵچیایەتی بوو، ئەی گەلی قورەیش گوێڕایەڵم بن بۆ منی جێبهێڵن لەو پیاوە و ئەوەی تێیدایە بگەڕێن و لێی دوور بکەونەوە، ســـوێند بە الله ئەو قسـانەی لێم بیسـت هەواڵ و نەبەئ[1]ی پێوە بوو، ئەگەر عەرەب بە گشـتی تووشـیبوون، ئەوە بە جگە لە ئێوە بەسـیەتی، ئەگەر زاڵیش بوو بەسـەر عەرەبەکان، ئەوە دەسـەڵاتەکەی دەســـەڵاتی ئێوەیە، شـــکۆمەندی و عیزەتەکەی عیزەت و شـــکۆمەندییە بۆ ئێوە، ئێوە بەختەوەرترین خەڵک دەبن پێیەوە، گووتیان **(سـحرك والله يا ابا الوليد)** ئا ئەوە سـیحر و

[1] نەبەء لە زمانی عەرەبیدا واتە ئەو شتانەی کە هەواڵی شتی گەورە لە خۆ دەگرن و وە شتەکان دادێن و ڕوودەدەن.

جادووی لە تۆش کرد ئەی باوکی وەلید، عوتبەش پێی گووتن **(هذا رئي فاصـــنع ما بدا لكم)** ئا ئەوە ڕاو بۆچوونی منە ئێوەش چیتان دەوێت ئەوە بکەن و ئەنجامی بدەن[1].

## ئەوەی لەم سەرگوزشتەدا بۆمان دەردەکەوێت:

١-باوکی وەلید پێشنیاری کرد کە پێغەمبەری الله (ﷺ) تەنها وازیان لێبهێنێت، چیتر قسە بە بت و سەنەمەکان و پەرستراوەکانیان نەڵێت، باوک و باپیرەکانیان کافر نەکا بە ئا شکرا لەناو خەڵکی، لەبەرامبەر ئەوەدا ئەگەر ئەوەی بیەوێت پێی دەدەن:

- دەیکەنە ســەرۆکی خۆیان بە تەعین و دامەزراندن بە مســۆگەری، نەوەک چوونە ناو پرۆسەیەک کە ئەنجامەکەی دیار نییە و هەڵبژاردنێکبێ.
- لە کۆتایدا ڕایەکان بۆلای ئەو دەگەڕێننەوە و ئەو بڕیاریان بۆ دەدات، واتە دەیکەنە مەڕجەع و بۆلا گەڕاوە و سەرۆکی پەڕلەمان.

جا ئەو دوو خاڵە لێرەدا مەبەســتی ئێمەیە، پێغەمبەری پێشــەوا (ﷺ) ئەگەر ڕازیبا لە ڕوالەتدا بەرژەوەندی و چاکی زۆری ئیســلام و بانگەوازی و موســڵمانانی تێدابوو، خۆ دەیتوانی بە ئومێدی زاڵبوون بەســەریان و چەســپاندنی شــەریعەتی الله بە پلە پلەیی و

[1] لە تەفسیری ئیبن کەسیریش ڕیوایەتەکان و گێڕانەوەکان هاتووە.

گۆڕانکاریی بچوو بایە ناو پرۆسـەکە و بە دەنگیانەوە چوو با، بەڵام بۆمان دەرکەوت لە خوێندنەوەی ئایەتەکان کەوا پێغەمبەر (ﷺ) ڕەتیکردنەوە و ئەوانی نەویست.

## ئەوەی لەم چەند ئایەتانەدا بۆمان دەردەکەوێت:

١-پێغەمبەر (ﷺ) بە ئایەتەکانی قورئان وەڵامی ئەوانی دایەوە، کە باشترین قسە و گووتنە وەڵامی کافرانی پێ بدرێتەوە.

٢-پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی پێگەیاندن کەوا بەرنامەکەی ئەو بەرنامەی الله تعالی یە و نابێ و بۆ کەس نە هاتووە لێی لا بدات و ئەویش بۆی نییە کە پێغەمبەری الله یە (ﷺ) لێی لابدات، وە دەبێ پەیڕەوی لێبکات.

٣-بەرنامەی الله کە بریتییە لە قورئانەکەی زۆر ڕوون و ئا شکرایە و هەموو شتێکی تێدایە و گشـتگیر و هەمە لایەنە وە لەلای الله ی بەدیهێنەری بە بەزەیی زاڵ و خاوەن ناز و نیعمەتە کان بەسـەر بە ندە کانییەوە دابەزیوە، لەبەر ئەوە دەبێت پەیڕەوی لێبکرێ و ئەو چاکترین دەستوور و یاسایە نەک بچینە سەر یاسا و دەستورێکی مرۆڤ کرد.

٤-ئەوەی پەیڕەوی لێبکات لە بەندەکانی الله و بڕوادار بێت پێیەوە ئەوە پاداشـت دەکرێت و قازانجێتی هەم لە دونیا و هەم لە دواڕۆژدا، ئەگەر پشـتی تێبکات و پێی کافر بێت ئەوە زەرەر دەکا و لەناودەچێ و ژیانی دونیاشی خۆش نابێ وە لە قیامەتیش سزا دەدرێت.

٥-پێغەمبەری الله (ﷺ) هەر بیریشی لە قسە و پێشنیارەکانی باوکی وەلید نەکردەوە لەگەڵ ئەوەدا تەماحی دوو سەرەی تێدابوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ):

- **تەماحی تاکی و کەسێتی:** بریتی بوو لەوەی سامانی پێ دەدەن دەوڵەمەندی دەکەن، کچ و ژنی جوانی دەدەنێ کە بە دڵی خۆیبێت، وە نیشانی با شترین پزیشکی دەدەن بۆ چارەسەری نەخۆشیەکەی ئەگەر نەخۆشبێ.
- **تەماحی گشتی و کۆمەڵی:** بریتی بوو لەوەی دەیکەن بە سەرۆک پەڕلەمان و ئەو ڕایەکان یەکلا بکاتەوە، ئەوە بە حیسابی بیرکردنەوەی کاتی ئێستا با ئەوکاتە موسڵمانان و پێغەمبەر و ئاینیش قازانجی دەکرد.

خۆ ئەگەر مۆڵەت هەبوایە لەلای الله تعالی و ڕێگای پێدرابا لە ڕواڵەتدا ئەگەر تێی بڕوانین بەرژەوەندی چاکی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەکانی و بانگەوازی تێدابوو، ڕەنگە هەندێک ئازار و ئەشکەنجەیان پێی کەم دەبویەوە، وە بە نەخشە ڕێگاوە چووبانە ناو پرۆسەکە و قورەیشیەکانیان ڕازی کردبایە لەسەر چەند خاڵ و ڕێکەوتنێک و نزیک بووبانەوە لێیان، ئەوەی بە پێغەمبەر (ﷺ) درا بە دڵنیاییەوە لە هیچ مێژوویەک بە هیچ کەس و لایەنێک نەدراوە لەلایەن کەسایەتیەکانەوە.

کەواتە ئەو بابەتە ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو ڕێگا و شوێنانە نادروستن و الله نایەوێت و پێیان ڕازی نییە و مۆڵەت نەدراوە و دژە بە ڕێبازی اللە و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، ئەو دابەزینەی داواکرا لە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) زۆر کەمتر بووە لەو دابەزینانەی داوا دەکرێت لەو کەس و لایەنانەی کە بەشدار دەبن لە هەڵبژاردن و پەرلەمانی ئەو سەردەمە، ئەوەی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) تەنها گووتیان با واز لە ئێمە بێنێت، ئەویش بە پێغەمبەریان نەگووت (ﷺ)، لەناو خۆیان گووتیان لەو پێناوەدا دەچین پێی دەڵێین، کە باوکی وەلیدیان نارد و قسەی لەگەڵ پێغەمبەر کرد (ﷺ).

## ئەوەی ئەو سەردەمەی ئێمە ئەو خاڵانە هەمووی جیاواز ترە لە هی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ):

١-پێش مسۆگەر بوونی دەرچوون و سەرکەوتن، دەبێ دانبنێین بە عەلمانیەت و دیموکراسی و یاسا و خاڵەکانی کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن.

٢-دەبێ لە دوای مۆرکردن و واژوو کردن لەسەر یاسا و خاڵەکان، بەڵێن بدەن بە پاپەندبوون پێیانەوە.

٣-دەبێ لە چوارچێوە و بازنە و یاساکانی دیموکراسی و پەرلەماندا بخولێنەوە، نەوەک بە ڕێبازی الله و ئاینەکەی بکەن و لەسەری بڕۆن.

کەواتە ئەوەش بەڵگەیەکی تری ڕوون و حا شا هەڵنەگرە لە سەر حەرامی بە شداریکردن لە

پڕۆسەی هەڵبژاردن و چوونە ناو پەڕلەمان.

بەشداریکردنی ئەو پڕۆسەیە و سەرکەوتن تیایدا لە ساڵانی ڕابردوو لایەن و کەسەکان هیچ

ســـوودێکیان دابین نەکرد بۆ هیچ کەســـێک و ڕەنگە تەنها هەندێک چاکەی بچووکی لێ

کەوتبێتەوە، لە بەرامبەریشـــیـــدا زەرەر و زیـــانی زۆر گەورەیـــان بەخۆیـــان و خەڵکیش

گەیاندووە، ئەگەر سەرنجی مێژووی ڕابردوو بدەین لەوەتەی حوکمی ئیسلام و دە سەڵاتی

خەلافەتی ئیســـلامی نەماوە لەســـەر ڕووی زەوی کۆمەڵ و تاقم پەیدا بوون بە بیانووی

جۆراوجۆر بۆ گەڕا ندنەوەی حوکمی الله تعالی و خەڵک بانگەوازیکردن بە حیســـابی

خۆیان، ئەو کات خەڵکێک بڕیاریدا بچێتە ناو پڕۆ سەی هەڵبژاردنی سیستەمی عەلمانیەت

و دیموکراســـی وە بەشـــداریش بوون بە فیعلی و کرداری، با هەندێک نموونەی بێنینەوە

بزانین چ ســـوود و قازانج و کەڵکێکی لێ وەرگیرا، ئایە ئەو مەرجانەی ئەوانەی ڕێگایان

پێدا هاتنەجێ یانە نا؟ وە لە کۆتایشـــدا قازانجە کانی چی بوو چ قازانجێکی لێکرا؟ بۆ

نموونە؛ ئەو مەرجانەی هاتوەتەوە لەلایەن ئەوانەی کەوا بەو مەرجانەوە ڕێگا یان داوە

بچیتە ناو ئەو پڕۆســـەیە، لە هیچ وڵات و شـــوێنێک مەرجە کان نە هاتوەتەجێ، ئەگەر

مەرجێکیان هێنابێتەجێ دوانەکەی تر پشـــتگوێ خراوە، عەقیدە و بیروبڕوایان کە دەبێ بە سـەحیحی و دروســتی بمێنێتەوە و لەســەری پێداگربن و وەڵام دەرەوەبن بۆ شــوبهە و گومانەکانی بەرامبەر و ئەوانەی دژن بە الله و بە پێغەمبەر (ﷺ)، لەو مەیدانەدا زۆربەی جاران ئەو تاقم و کۆمەڵانە دۆڕاون، لە عەقیدە و بیروبڕوادا تەنازولیان کردووە و وەڵام بە دەســت نەبوونە یان نەیان داوەتەوە و پێیان باش نەبووە ڕاشــکاوانە وەڵامی ئەو کوفر و شـیرک و جوێن فرۆشــی و بێڕێزیانەی بەرامبەر بە الله بە پێغەمبەر (ﷺ) و بە ئاینەکەی کراوە و دەکرێ بدەنەوە، وە فەرمانیان بە چاکە نەکردووە و ڕێگریان لە خراپە نەکردووە کە لە سەرووی هەموو فەرمان بە چاکەیەک و لە هەموویان با شتر و پلە دارتر فەرمانکردنە بە تەوحید و الله بەیەکگرتن، ئینجا لەسـەرووی هەموو ڕێگرییەک لە خراپیەکان و لە هەموو خراپەیەک خراپتر شـیرک و هاوبەشــی و کوفر و لە ئیســلام دەرچوون و بێ بڕواییە، کە ئەوانە هیچ نەبیســتراوە و نەبیندراوە کەم یان زۆر لەو لایەن و کەســانەی کە پاشــگری ئیســـلامییان بەخۆیانەوە لکاندووە لەو مەیدانەدا ئەنجامیان دابێ و بیکەن، وە چاکەی باشــیان پێ مســۆگەر نەبووە بۆ خۆ یان و خەڵکیتر بەڵکو زۆربەی چاکە کانیشــیان لەدەستداوە.

- ئەگەر تەنها بە نموونە ئەم ساڵانەی ڕابردوو زۆر کۆنیش نییە میسر بە نموونە بێنینەوە کاتێ کەوا حوسنی موبارەک ڕووخێندرا و سیستەمی عەلمانیەت بەبەر شاشەکانەوە و خەڵکی لە ڕواڵەتدا وا تێگەیشت بەرەو ڕووخانە، لەولاشەوە الإخوان المسلمون کە هێزی جەماوەری زۆریان هەبوو وە چەندین تاقم و کۆمەڵی تریش لەو مەیدانەدا هەڵخەڵەتان و دروست بوون، حیزبی نور و هەندێکی تر لە لایەنەکان هاتنە ناو ئەو بازنەیەوە و گووتیان هەڵبژاردن چارەسەرە، بەشدارییانکرد لە پرۆسەی عەلمانیەت و دیموکراتیەت، تەنازول و دابەزینیان کرد لە هەندێک خاڵە سەرەکییەکانی ئاین، کە چوونە ناوی سەرەتا وا بەدیارکەوت لە ڕووی زاهیری و ڕواڵەتەوە کەوا بردیانەوە، ئەوەبوو محمد مورسی کرا بە سەرۆک کۆماری ئەو وڵاتە، لە پاشان لە مەجلیس شەعبەکەی ئەو وڵاتە و ئەنجومەنی گەلی ئەو وڵاتە زۆرینە بە دەست ئەوانە بوو کەوا پاشگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندبوو و لە بازنەی تاقم و کۆمەڵەی ئیسلامی دەخولانەوە، لە کۆتاییدا بە ماوەیەکی کەم و کورت هیچ زەرەر و زیانیشیان بۆ موشریک و کافر و دووڕووەکان نەبوو، تەنها ئەوان ڕۆژ بە ڕۆژ بە محمد مورسیەوە و لایەنەکانی ناو (مجلس الشعب) و ئەنجومەنی گەل تەنازول و دابەزینیان دەکرد لە

خاڵە سەرەکییەکانیان بۆ ئەوەی زلهێزان ڕازی بکەن و لەولاشەوە جولەکە دەنگی لێوە

نەیەت و بمێننەوە لە دەسەڵاتدا.

لە کۆتاییەکەیدا چی بەسەر هات؟ ئەو هەموو خەڵکە بەستەزمانە و جەماوەرە ئەوانەی

بە دوای ئەو لایەن و کەسانە کەوتبوون هەموویان ئەزیەت و ئازار دران، حەسانەوەیان

نەبینی، ژیان خۆشییان نەبینی، وایان بەسەر هات کەوا بینیمان بە بەر چاوی شاشەکانەوە

و بە بەر چاوی خەڵکییەوە بە ئاشکرا بە ڕۆژی ڕووناک ئا ئەوانە ئازار و ئەزیەت دران،

دەسەڵات لە مورسی سەندرایەوە، تەنها پاسەوانێکی خۆی چوو پێی گوووت وەرە

دەرەوە، ناوی برد، بە سەرۆکیش ناوی نەهێنا، ئەویش پێی سەیر بوو، گووتی بۆ پێم

ناڵێی سەرۆک؟ گووتی وەرە تۆ ئێستا سەرۆک نیت! بردیان لە ناو کۆپتەرێکدا بە

ئاسمانەکان گێژ و وێژیان کرد ئەوەندەیان سوڕاندەوە، بەخۆشی نەیزانی چی بەسەرهات،

لەولاوە سی سی خوێن ڕێژی عەلمانی دەسەڵاتی گرتە دەست، ئەوە بوو بە کودەتایەکی

سەربازییەوە هاتە مەیدانەکە، ئەوەی ناڕازیش بوو کۆڵان و جادەکانی چۆڵ نەدەکرد

هەڵخەڵەتابوون بە پڕۆسەی دیموکراسیەت و سیستەمی عەلمانیەت، لەوێوە وتاف و

شیعاراتیان دەخوێندەوە و لێیان دەدا، بە ئافرەت و کچەکانەوە، وە بە پیاو و کوڕەکانەوە،

وە بە منداڵ و گەورە و بچوکەوە، هەر هەموو یان لەوێدا گولە باران کران، بە هەزاران

خەڵک تێداچوو کوژرا، خەڵکێکی زۆر لە ئافرەتان و کچان ناموســیان بردرا ئابڕویان لادرا و ئابڕویان شـکێندرا، ئەو شـوێنە بووە شـوێنی خوێن ڕشـتن و ناموس بردن، ئەو پڕۆسـەیە بووە مایەی ئەوەی خەڵک بکوژرێت و خوێنی بڕژێت و ناموسـی ببردرێت و دوور بخرێتەوە و پەرتەوازە بکرێت و هێزی لەبەردا نەمێنێت، ئەوەبوو بە دەیان ساڵ ئەو هێز و لایەنە گەڕانەوە دواوە، وە ئەو هەموو خەڵکە یان بە کوشـتندا، وە ئەو هەموو ناموسـە بردرا، ئەو هەموو خەڵکە تووشـی زیندان بوو ، لە کۆتاییەکەیدا موڕسـی جێی زیندانە و بێ ڕێزیشـی لەگەڵ کراوە و ئازار و ئەشـکەنجەش دراوە و دەیان و سـەدانی تریشیان، وە لەپاشان ئافرەتان ژمارەیەکی زۆریان ناموسیان بردرا وە گیران و زیندانیان دەر حەق کرا و کوشـتنیان بەسـەرداهات، عەدەد و ژمارەیەکی زۆریان خوێنیان ڕژا، پەرتەوازە کران، ڕسوا کران، زەلیل و ژێر دەستە کران، ئەشکەنجە دران، لە پاشان سی سـی خوێن ڕێژی کودەتاچی جارێکی تر خۆی هەڵبژاردەوە، (٩٧%) دەنگەکانی بە حیسـابی ئیعلام و ڕاگەیاندنی خۆی بە دەسـتهێنا لەلایەن گەلی میسرـەوە کە بکرێتەوە سـەرۆک کۆماری میسرـ، یەکەم وڵات لە وڵاتە زلهێزەکـان کە خۆی بە دایکی دیموکراسیەت دەزانی وە یەکەم کەس و سەرکردە و سەرۆکی وڵاتەکان تڕامپی سەرۆکی ئەمریکا بوو پیرۆزبایی کرد لە سـی سـی کە جارێکی تر هەڵبژێردرا بۆ سـەرۆکایەتی و

بویەوە بە ســـەرۆکی وڵاتی میسرـــ، کەواتە ئەوە ئەوە دەردەخات کە هەمووی درۆ و دەلەسەیە.

- لە جەزائیریش (جبهة الإنقاذ) هەبوو، بەرەی ڕزگاری کە عەباس مەدەنی سەرۆکایەتی دەکرد و عەلی بلحاج جێگرەکەی بوو، بە دەیان لایەن و کۆمەڵ و کەسایەتی ئەوانەی پاشـــگری ئیســـلامەتیان بەخۆیانەوە لکاندبوو لەوێدا کۆبوبونەوە و لەژێر چەتر و سـێبەری ئەو بەرە و جەبهەیەدا هەموویان بەشـداربیانکرد لە پڕۆسـەی هەڵبژاردن لە سـیسـتەمی عەلمانیەت و دیموکراتی لە وڵاتی جەزائیر، لە کۆتاییەکەیدا لە (٨٧٪)ی دەنگەکانی جەماوەر و خەڵکییان بە دەسـتهێنا، بەڵام چییان بەسـەر هات؟ قازانجەکە لە کوێدابوو؟ زلهێزەکان کە فەڕەنسـا ئەو بە حیسـابی خۆی لانەی دیموکراسـیەتە و لەوێوە دیموکراسـیەت هەڵقوڵاوە، خەڵکی ئەو سـیسـتەمەیان هێناوە و خۆیان ڕزگار کردووە لە کەنیسەکان و لە ئاین لە ئەوروپا، کە ئاین چیتر نەیەتە ناو کایەکانی ژیانەوە و نەیەتە ناو حوکم و فەرمان ڕەوایەتی و سیاسەت، ئا لەوێوە هەڕەشەیان لێکرا، کە لە ڕووی سەربازییەوە فەڕەنسا دێتە ناو باس و پڕۆسە و شتەکانی ناو جەزائیر و یەکلایی دەکاتەوە، ئەگەر (جبهة الإنقاذ) دەسەڵات بگرنە دەست، با لە ڕێی دەنگدان و لە ڕێی پڕۆسەی هەڵبژاردنیش بێت.

لە کۆتاییەکەیدا ئەوەیان بۆ مایەوە عەباس مەدەنی بە هەڵهاتوویی هەڵهاتوو شـوێنەکەی لەوێ نەما و پەڕاگەندەی وڵاتان بوو خۆی و چەند ســەرکردە و کەســایەتییەک، عەلی بلحاج کە لەناو جەزائیر بوو خۆیی و چەندین سەرکردە و کادیرێکیان لێ گیرا، لە پاشان هەندێکی تریان ئازار و ئە شکەنجە دران و کوژران و پەرتەوازە کران و نامو سیان بردرا هیچیان بە هیچەوە نەکرد، ئێســتاشــی لەگەڵ دابێ تاوەکو ئێســتا ئەوە چەندین ســاڵی بە سەردا ڕۆیشتووە، ئینجا هیچ بوون و وجودێکی ئەوتۆیان نەما و نەیان توانی جارێکی تر بگەڕێنەوە سەر بانگەوازی و کارەکانی ئاشتیانەی خۆشیان بە حیسابی خۆیان، لەناو ئەو سیســتەم و وڵات و شـوێنەدا نەک قازانجیان بە دەســت نەهێنا، زەرەرێکی زۆریان لێکرد، هەموو یان پەرش و بڵاو بوون و کارە کانیان لێ تێکچوو، ئەوەی کوژرا، ئەوەی گیرا، ئەوەی هەڵهات و ڕایکرد، ئەوەی قســەی بە شــوێن هەڵبەســترا، هیچیان بە هیچ نەکرد و قازانجی هیچیان بە دەست نەهێنا.

لە وڵاتەکانی تر لە ئوردن و لە فەلەســتینیش ئەو نموونانە زۆرن، لەو وڵات و شــوێنەی خۆشــماندا لە ســاڵانی ڕابردوو با بزانین چی کراوە و چی ئەنجام دراوە و چۆن ئەوانە هاتوون، توانیو یانە قازانجێکی گەورە و مەزن بگەیەنن و شــتێکی بەرچاو و دیاریکراو بکەن بۆ دینی الله تعالى لە ناو ئەو پڕۆســەیەدا کە بەشــداریيان کردووە، لە ناو ئەو

ئەنجومەنەدا کە تێیدا بوونە ئەندام؟ کە لە بەرامبەردا خۆیان تووشـــی گوناحی گەورە و مەزنی وەکو شیرک و کوفر کردووە، لەگەڵ چەندین گوناحی تر لە تێکەڵی و لە نەزەر و لە دان پێداهێنان و هەڵســوکەوتکردنی ئاشـتیانەی ڕێز لێگرتن لەگەڵ ئەو کەســانەی کە دژ بوون بە الله تعالی و بە پێغەمبەر (ﷺ) و بە ئاینی ئیسلام.

کەواتە ئەوە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەو ڕێگایە ڕێگایەکی تاقیکراوەیە و شکستی هێناوە و چیتر نابێ تاقی بکرێتەوە، بەڕاسـتی لە ڕووی عەقڵی و ژیریشـەوە هەر ڕێگایەک تاقیکرایەوە و شکستی هێنا لە کۆتاییەکەیدا بووە مایەی زەحمەتی و زەرەر و زیانی زۆر بۆ خەڵکەکە ئەو ڕێگایە دەبێ وازی لێ بهێندرێ، دەبێ جارێکی تر نەچینەوە سەری و پێیدا هەڵنەڵێینەوە و وانەکەین کەوا خەڵکەکە تووشـی ئەو دەرد و بەڵایانە بکەین وەکو لە میسرـ و جەزائیر و وڵات و شوێنەکانی تریش توو شی بوون، لەو پێناوەدا چەند کە سێک بەرژەوەندییان پێیوە دابین دەبێ لە سـەرکردەی لایەنەکان و کادیرەکان و لایەنەکان ئەویش تەنها بەرژەوەندی دونیا و سـیاسـەتی خۆیان، جەماوەر و خەڵکە نەزان و فەقیر و هەژارەکەش تووشـی ئەو دەردە سەری و مەینەتیانە دەکرێن، وەکو لەو وڵاتانە بەسەریان هات، بە هیچ قازانج نەکەن و قیامەتیشیان بخرێتە مەترسی.

## خلیسکان و خراپییەکانی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن:

ئێستایش دێینە سەر خاڵێکی تری سەرەکی باس و بابەتەکە کە لە پێشەکیەکەدا وادە و بەڵێنمان پێتان دابوو، ئەویش خلیسکان و خراپیەکان و گومانەکانی هەڵبژاردن و دەنگدانە، کە سەرەتا دێین باسی خلیسکانەکان و خراپیەکان دەکەین لە خاڵێکیدا، ئینجا خاڵێکی تر باسی گومانەکان دەکەین، خلیسکانەکان و خراپیەکانیش دەکەینە دوو تەوەر:

**تەوەری یەکەم؛** خلیسکان و خراپیەکانی پێش ئەندام بوون لە پەڕلەمان.

**تەوەری دووەم؛** ئەو خلیسکان و خراپیانەی کە لە ئەنجامی بەشداریکردن لە پڕۆسەی هەڵبژاردن و ئەندامبوونی پەڕلەمان.

**تەوەری یەکەم؛** خلیسکان و خراپیەکانی پێش ئەندام بوون لە پەڕلەمان.

سەرەتای بەشداریکردنەکە لە پڕۆسەی هەڵبژاردن تاوەکو بە ڕۆژی دەنگدان دەگات چەندین خلیسکان و خراپە و بێشەرعی لێدەکەوێتەوە، بە کورتی و پوختی هەندێکیان بە نموونە دەهێنینەوە:

**١-خاڵی یەکەم لە خلیسکان و خراپیەکان؛** واژوو کردن و دان پێدانانی یا ساکانی بێشەرعی و دەستکردی مرۆڤ و بەرهەمی دیموکراسی و عەلمانیەت.

**هەر کەس و لایەنێک کە بیەوێت بەشداری بکات لە هەڵبژاردن دەبێ ئەو خاڵانەی تێدا بێتەجێ و لێی هاتبێتەجێ و بیان سەلمێنێت:**

- مۆڵەتی هەبێت لەلایەن حکومەتی عەلمانی و ڕێگای حیزبی بوونی پێدرابێت.
- چەند یاسایەک هەیە لە کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن دەبێ ملکەچیان بێت و بەڵێنی پابەند بوونیانی دابێت، لەوانە؛ ڕازیبون بە عەلمانیەت و دیموکراسی و چەند لایەنی و ژیانی ئاشتیانە لەگەڵ ئاین و لایەنە کافر و موشریکاندا.
- دانپێدانانی پارتەکان و مافی حکومکردن لە کاتی دەرچوونیان بە دەنگی زۆر، ئەگەر کافر و دژ بە ئیسلامیش بن، ئەگەر کوفری و دژ بە ئیسلامەتیش بچەسپێنن و پێی لەسەر دابگرن و پەیڕەوی لێبکەن.

- ســـڕینەوەی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، بە ناوی ئازادیی بیروبڕوا و ئازادیی تاکەکان و یەکسانی نێر و مێ و...هتد
- گوێڕایەڵی تەواوی کافر و کوفرەکانیان، لە پێناوی یاسا و پابەندبوون پێیانەوە.
- گەڕاندنەوەی ناکۆکیەکان بۆلای دەنگی زۆرینە، نەک بۆ لای قورئان وفەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ).

جا گەر سەرنجی ئەو چەند ئایەتانە بدەین دەردەکەوێت کەوا موسڵمان بۆی نییە لە ڕێبازی الله لابدات و بۆ هیچ کەســێک نییە دانبنێت بە کوفری کافران و خەڵکی کافر لەگەڵیان بژیەت، بەڕێز و ئاشــتیانە هەڵســوکەوتیان لەگەڵدا بکات و واز بێنێت لە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە و گوێڕایەڵی کافران بکات لە فەرمانەکانیان و یاســاکانیان جێبەجێ بکات:

- الله تعالی فەرموویەتی: **﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (ال عمران : ٨٥)**

واتە: ئەوەی جگە لە ئیســـلامی بوێت بە ڕێباز ئەوە لێی وەرناگیرێت و ئەو لە دواڕۆژدا لە زەرەر بارانە.

جا ئەو یاسا و خاڵانەش کەوا دەر هاوێشتەی عەلمانیەتە و دیموکراسیەتە و لە کۆمیسیۆندا هەیە زۆربەیان دژن بە ڕێبازی الله تعالی و جگە لە ئیسلامن، کەواتە نابێ قبوڵیان بکەین ئەگەرنا لە زەرەر باران دەبین و الله لێمان وەرناگرێت.

• الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ**﴾ **(الأنعام : ١٢١)**

واتە: بەڕاستی شەیتانەکان نیگا و وەحی بۆ دۆستەکانیان دەکەن تاوەکو دەمە دەم و گفتوگۆتان لەگەڵ بکەن و شوبهە و گومانەکانتان بۆ بخەنە ڕوو ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵیان بن بەڕاستی ئێوە لە هاوبەش بڕیار دەرانن.

ئەوە تەنها لەو ئاژەڵانەی کە (بسم الله)یان لێ نەخوێندرێت لە پێش ئەو بڕگە ئایەتە کە الله تعالی باسی دەکات ئەو پێیان بخەڵەتێت و گوێڕایەڵییان لێوە بکات الله تعالی ئەوەی ناو برد بەوەی وەکو ئەوان بەشدارە لە شیرک و هاوبەشی و بە موشریک لە قەڵەم دەدرێت.

• الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَى أَدْبَارِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَى لَهُمْ * ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ * فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ * ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ**﴾ **(محمد : ٢٥-٢٨)**

واتە: بێگومان ئەو کەسانەی پاشەوپاش گەڕانەوە (لە ئایینەکەیان) لە پاش ئەوەی هەقیان بۆ ڕوون بوویەوە شـــەیتان خراپەکانیانی بۆ جوان و ڕازاوە کردبوون وە بە هیوا و ئومێد فریوی دابوون * ئەو زاڵ بوونی شـــەیتانە بەهۆی ئەوەوەبوو کەبەڕاســـتی دووڕووەکان دەیانوت بەوانەی کەداخ لەدڵ بوون بەرامبەر ئەوەی الله دایبەزاندووە کە قورئانە: ئێمە لەمەودوا لەهەندێک هەڵوێســـتدا بەقســـەتان دەکەین الله یش خۆی چاک ئاگادارە لەو نهێنی و پیلانانەی کەدەیشـارنەوە * ئاخۆ چۆن بێ (حاڵی ئەو ناپاکانە) کاتێ فریشـتەکان گیانیان دەکێشن و لە ڕوخسار و پاشیان دەدەن * ئەو (جۆرە گیان کێشانە) لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە شـوێن شـتانێ کەوتبوون کە الله ی تورە کردبوو ڕەزامەندی الله شـیان پێ ناخۆش بوو بۆیە الله ش کردەوەکانیانی پووچەڵ کردەوە.

کەواتە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا نابێ پستە پست و قسە چ بە نهێنی و چ بە ئاشکرا بۆ کافر و موشریکەکان بکرێ و دڵ ڕازی بکرێن، تا ڕێگا بدەن بەشـــداربن لەو خاڵ و شـــتانەی کە دژن بە قورئان و بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) لێی دابەزن و بڵێن بڕوامان هەیە بە ئێوە ئەو کات شـــەیتان فێڵیان لێ بکات و بۆیان بڕازێنێتەوە و ژیانی دونیایان لەلا خۆش و بەتام بێ و دووری تێ بڕوانن و بڵێن لە هەندێک کار و کردەوە بەڵێ ئێمەش بە گوێتان دەکەین (یاســاکان جێبەجێ دەکەین) جا الله نهێنیەکانیان دەزانێ، ئەوان لەکاتی

مردندا با بترسێن لە الله تعالی فریشتەکان دێن وەڵامتان چی دەبێ ئەوانەی بەشداری دەکەن لەو شوێن و جێگایانە؟ ئەوانەی بەو شێوەیە دووڕوانە دڵی کافر و موشریکەکان ڕازی دەکەن کە ئەوەی الله تعالی پێی فەرموون وازی لێدەهێنن ڕێبازی الله پشتگوێ دەخەن یاساکانی ئەوان واژوو دەکەن و جێبەجێی دەکەن ئا ئەو کاتە لە کاتی سەرەمەرگدا فریشتەکان دێن لە ڕوویان دەدەن و لە پشتیشیان دەدەن دەڵێن پشتتان کردە ئایەتەکانی الله تعالی و ڕێبازەکەی الله، بەوەش لە ڕوو یان دەدەن دەڵێن ڕوو تان کردە یاساکانی دەستکرد وشەیتانەکان و پێڕی ئەوان و بەدوای ڕازانەوەکانی ئەوان کەوتن؟ ئا ئەو کاتە کار و کردەوەکانیان هەرچییان کردبێ خۆ ئەگەر شەو و نوێژیش بکات و ڕۆژووش بگرێ ئەگەر نوێژیش بکات ئەگەر هەموو قورئانیشی لەبەربێت ئەگەر ڕاڤەی ئایەتەکانی قورئانیشی کردبێت و بکات بە دڵنیاییەوە هەمووی بەسەردا دەدرێتەوە و الله تعالی لێی وەرناگرێ الله دەفەرمووێت: **(فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ)** کار و کردەوەکانیان سڕاوە دەبێت و نامێنێت و حیسابی بۆ ناکرێت و هەمووی هەڵدەوەشێتەوە.

کەواتە الله تعالی لەگەڵ ئەوەدایە کە بەندەکانی الله تعالی لە سەر یا سای الله تعالی بڕۆن و لەسەر دەستورەکەی ئەو بڕۆن و گوێ ڕانەگرن و گوێڕایەڵ نەبن بۆ هیچ یاسا و دەستورێکی تر و لەگەڵیدا نەبن.

• الله تعالى فەرموویەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ﴾ (ال عمران : ١١٠)

واتە: ئێوە ئەی ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) چاکترین ئومەتن بۆ خەڵکی پەیدابوونە و دەرچوونە فەرماندەکەن بە چاکە و ڕێگری دەکەن لە خراپە.

نابێ ئەو کار و ئیشەی چاکترینێتیان پێوە پێ بەخشراوە (فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە) ڕە شیکەینەوە و بیەسڕینەوە لە چوار چێوەی جێبەجێکردنی یا ساکانی عەلمانیەت و دیموکراسیەت، کە لەوێوە بە ناو و بیانووی بیروبڕوای ئازاد و یەکسانیەت و نابێ خەڵکی بریندارکەیت و هەرکەس هەرچی بۆ خۆی دەڵێ نابێ ئینکاری مونکەرەکان بکرێت و ڕێگری لە خراپیەکان بکرێ.

• الله تعالى فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾ (الحج : ٤١)

واتە: ئەو موسوڵمانانەی کە لە پێناو الله تعالى کۆچیان کرد لە مەککەوە بەرەو یەسریب و شاری مەدینە ئەو کات ئەگەر دەسەڵاتمان پێیاندا و لە زەوی تەمکینمان پێیان بەخشی ئەوە نوێژ بەرپا دەکەن و زەکات دەدەن و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەکەن گەڕانەوەی هەموو کار و شتێک بۆ الله یە و ئەو بڕیاری لەسەر دەدات.

ئەگەر فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە نەما، ئەوە بە دڵنیاییەوە خەڵکی دەبێ زۆر لە خۆیان بترسێن، بەڵاو ناخۆشی زۆریان بەسەر دێت، بە گشتی هەموو خەڵکەکە دەگرێتەوە، هەر وەک پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(إن الناس إذا رأوا المنكر، ولا يغيرونه، أوشك أن يعمهم الله بعقاب منه)**[1] واتە: بەڕاستی مەردوم و خەڵکی ئەگەر خراپەیان بینی، و نەیان گۆڕی، نزیکە الله بە تۆڵەی خۆی گشتیان بگرێتەوە، واتە تۆڵەی گشتیبێ بۆ هەر هەموویان و دەربازیان نەبێ.

بە دڵنیاییەوە ئەوەی بە دڵ خراپەی پێ ناخۆش نەبێت بەزمان و دەستیش نەیگۆڕێت ئەوە بڕوا و ئیمانی هەر نییە، چونکە دیارە ڕازییە بە خراپەکە، هەر وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان)**[2] واتە: ئەوەی لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بە دە ست بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی با بە زمان، ئەگەر نەیتوانی با بە دڵی ئەوەیان لاوازترینی بڕوایە لە دوای ئەوەوە بڕوا و ئیمان نامێنێت.

[1] ئیمامی ترمزی لە سونەنەکەی (ژ: ٢١٧٦) هێناویەتی و سەحیحە.

[2] پێشەوا موسلیم لە صەحیحەکەی (ژ: ٤٩) هێناویەتیەوە.

● الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَلَنْ يَجْعَلَ اللهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْـمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾ (النساء : ١٤١)

واتە: الله دای نەناوە بۆ کافرەکان زاڵبوون و دەسەڵات بەسەر بڕواداران بەڵکو ئەنجام و ئاکامی تەنها بۆ بڕواداران بڕیار داوە.

کەواتە کافر بۆی نییە دە سەڵات بگرێتە دە ست بە سەر بڕوادار و دانی پێدا بهیندرێ، لەو پڕۆژەدا کە بەشداری دەکرێت و لە سیستەمی عەلمانیەت و دیموکراسی هەرکەسێک دەرچوو دەبێ دانبنێی بە یاساکانیان و بە دەسەڵاتەکانیان، ئەگەر کافر و دژیش بێ بە الله و بە پێغەمبەر (ﷺ).

● الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ﴾ (البقرة : ١٢٤)

واتە: بیربکەنەوە کاتێک الله ئیبراهیمی تاقی کردەوە بەچەند بڕیار و فەرمایشتێک کە ئەویش بەجێی هێنان (الله) فەرمووی: بێگومان من تۆ دەکەم بە پێشەوای خەڵکی (ئیبراهیم) وتی: لەنەوەشم ئەکەیت؟ (بە پێشەوا) فەرمووی: پێغەمبەریەتیی من ناگات بەستەمکاران.

واتە ستەمکار ئەگەر پێشەوایەتی و فەرمان ڕەوایەتی بەسەر مسوڵمانان گرتە دەست ئەوە ڕێگای پێ نادرێت و بەرهەڵستی دەسـەڵاتەکەی دەکرێت، بەو ڕێگا شـەرعیانەی کە لە شەرعی ئیسلام باسی کراوە، ئەی ئەگەر کافر و موشریک بێ؟ بە هیچ شێوازێک الله تعالی ڕێگای نەداوە دانی پێدا بهێندرێت و پێی ڕازیبن کە ئەو دەسەڵات بگرێتە دەست، جا ئەگەر ئەوە درو ستبێت دەبوایە مو سڵمانان و پێ شەوا ئەبو بەکری سدیق (رضي الله عنه) لەو سـەردەمەدا دانیان نابوایە بە دەسـەڵاتەکەی موسـەیلەمەی کەزاب لە دوای پێغەمبەرەوە (ﷺ)، چونکە زۆرینەی خەڵکی وڵات موسـەیلەمەیـان هەڵبژاردبوو شەڕیشیان لەسەر دەکرد.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ**﴾ **(النساء : ٥٩)**

واتە ئەگەر ناکۆک بوون و جیاواز بوون لە شتێک بیگەڕێننەوە بۆلای الله و قورئانەکەی و پێغەمبەری الله (ﷺ) و فەرموودەکانی ئەگەر ئێوە بڕوادارن بە الله و بە ڕۆژیی دوایی.

نەک بیگەڕێننەوە بۆلای هەوا و هەوەستان و زۆرینەی دەنگ.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللهِ**﴾ **(الشـوری : ١٠)**

واتە: ئەی خەڵکینە ئەوەی تێیدا جیاواز بوون لەهەر شتێک ئەوە بڕیارەکە بۆلای الله یە و بۆ لای ئەو بیگەڕێننەوە بڕیاری لەسەر بدات.

نەک بۆلای هەوا و هەوەس و یاسا و دەستورەکانی دەستکرد و عەلمانیەت و دیموکراسیەت و زۆرینە یەکلایی بکاتەوە.

بەو ئایەتانەدا دەرکەوت بە هیچ شێوازێک دروست نییە کەسەکان بچن بەشداری ئەو پڕۆسەیە بکەن و ئەو یاسایانەی جگە لە یاسای الله تعالى جێبەجێ بکەن و بەڵێن بدەن و تە نازول بکەن و دابەزن لە عەقیدە و بیروبڕوا یان و لەو خاڵانەی الله بۆی دا ناون، بە بیانووی ئەوەی بەرژەوەندی دەعوە و بانگەوازی تێدایە یان هەر یەک لە بیانووەکانی تر.

**٢-خاڵی دووەم لە خلیسکان و خراپیەکان؛** خۆ دەرخستن و بە چاک خۆ نیشاندان و داوای دەسەڵاتکردن و داواکردن لە خەڵکی کە دەنگیان پێ بدەن.

خۆ دەرخستن و بە چاک خۆ نیشاندان ئەگەر کەسەکە وانەبێت ئەوە درۆزنایەتییە و فێڵکردنە و ساختەکارییە لەگەڵ خەڵکی دەکرێ و چەواشەکردنی خەڵکەکەیە، ئەگەر واشبێت ئەوە زۆربەی جارەکان پێشێلکردنی فەرمانەکانی الله یە و گوناحە و الله تعالى ڕێگای لێ گرتووە:

- الله تعالى فەرموویەتی: **﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَىٰ﴾ (النجم : ٣٢)**

واتە: بەخۆتاندا هەڵمەدەن و خۆتان بە پارێزکار نیشان مەدەن الله زاناترە بەوەی پارێزکاری دەکات.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنْفُسَهُمْ بَلِ اللهُ يُزَكِّي مَنْ يَشَاءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا**﴾ **(النساء : ٤٩)**

واتە: ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە کە خۆیان بە پاك و چاك دەزانن (وانییە) بەڵکو الله هەر کەسێکی بوێت پاك و خاوێنی دەکات و کەمترین ستەمیان لێ ناکرێت (با بە ئەندازەی ئەو دەزوە باریکەی ناوکی خورماش) بێت.

کەواتە بەخۆ هەڵدان و تەزکیەی خۆکردن و خۆ بە باش نیشاندان شتێکە الله تعالی پێی ڕازی نییە و لە قورئانی پیرۆزەوە ئایەتەکان بەڵگەن.

پێغەمبەریش (ﷺ) بەخۆدا هەڵدان و خۆ مەتح کردنی بە کارێکی نا پەسەند و نەشیاو خستوەتە ڕوو وە هەڕەشەی کردووە لەو کەسەی کە بەخۆیدا هەڵدەڵێ یان مەتحی خۆی دەکات:

- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(إياكم والتمادُحَ، فإنّه الذَّبْح)**[1]

[1] لە سونەنی ئیبنو ماجە هاتووە (ژ: ٢٦٧٤).

واتە: ئاگاداربن لە بەخۆدا هەڵدان، بەڕاستی ئەوە خۆکوشتن و سەر بڕینە.

کەســـەکان کە عەمەل و کردەوەیەکیان کردووە ئەگەر لە پێناو الله بێت نابێت بە چاوی خەڵکیدا بدەنەوە و کار و کردەوەکان بهێننە بەرچاوی خەڵکی و بیڵێنەوە تا خەڵک لێیان ببیســتێ، جا یەکێک لەو ئیش و کارانەی پەرلەمانتاران ئەوانەی کاندیدن بۆ پەرلەمانتاری ئەوەیە دەیکەن، چاکەکان بە خەڵکی دەفرۆشــنەوە و خۆیان چاک دەردەخەن و بەخۆیاندا هەڵدەڵێن و بە لایەنەکەیاندا هەڵدەڵێن، ئەگەر واشبن هەر ڕێگا لێگیراوە وەکو باسمان کرد، ئەگەر وا نەبن دوو جار و حەوت جار حەوت جار ڕێ لێ گیراوتر و خەتەرتر و ترســناک ترە و سزابار دەبن وە گوناحکار دەبن.

- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(مَن سَمَّعَ النَّاسَ بعَمَلِه ، سَمَّعَ اللهُ بِه سامِعَ خَلقِه وصَغَّرَه وحَقَّرَه)**[1] لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرمووێت **(سمَّع اللهُ به مسامِعَ خَلقِه يومَ القيامةِ)**

[1] ئەو فەرموده شیان ئیمامی ئەحمەد لە مو سنەدەکەی (ژ: ٦٩٨٦) هێناویێتی، و الحافظ المنذري لە -الترغيب والترهيب-دا (ژ: ٢٣) هێناوێتی، فەرموودەکەش بە سەحیح دانراوە.

واتە: هەر یەکێک کار و کردەوەکانی کە کردوویەتی بە گوێچکەی خەڵکیدا بدات و ڕوو پامایی بکات (واتە ڕیا بازبێ تێیدا) الله بە گوێچکەی خەڵکەکەیدا دەدات، لە ڕێوایەتێکی تر دەڵێ لە ڕۆژی دوایی بچووکی دەکاتەوە و کەم و هیچی نیشان دەدات.

ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە موسـنەدی ئیمامی ئەحمەد هاتووە عەبدوڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) گێڕاویەتیەوە هەر کە ئەو فەرموودەی بۆ دەگێڕدرایەوە و دەیبیست وە بەخۆشی دەیگێڕاوە چاوی فرمێسکی دەکرد و دەگریا.

جا ئەگەر سـەرنجی بەربژێر و کاندیدەکان بدەین ئەوە ئەوانە سـەد لە سـەد لە کارەکانی ئەواندا دەبینینەوە و چاکیەکانی خۆیان باس دەکەن و کار و کردەوەکانی خۆیان دەخەنە بەر گوێچکەی خەڵکی و بەخۆیاندا هەڵدەڵێن و سـەرنجی خەڵکەکە ڕادەکێشـن بۆ لای خۆیان بۆ ئەوەی مەتح بکرێن و شتە چاکەکانیان ناشارنەوە.

کەواتە بەو بەڵگانەی ڕابردوو ئەو کەسانە کارێکی نا شیاوی بێشەرعی پێچەوانەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن و تاوانبار دەبن لەسەری.

خوا ستنی دە سەڵات و داواکردنی فەرمان ڕەوایەتی بە سەر خەڵکەوە کارێکی ناپە سەندە بۆخۆت داوای بکەیت و پێی لەسـەر دابگری مەگەر چەند جارێک بە چەند مەرجێک لە هەل و مەرجی تایبە تدا ڕێگا درابێ، ئەو خاڵانەش لەو کەس و لایە نانەی ئێسـتا لە

پڕوپاگەندەکانی هەڵبژاردنەکانی سـەردەم دەیکەن نەهاتوەتەجێ و نایەتەجێ پڕۆسـەکەش جیایە لەگەڵ ئەو پڕۆ سەیە و ئەو هەل و مەرجانەی کە لە شەرع با سکراوە، وەکو یو سف پێغەمبەر (ﷺ) یان هەر کەسـێکی تر لە کەسـی چاکە کاری دیندار و شـوێن کەوتەی پێغەمبەر (ﷺ) بیکات.

- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(إنكم ستحر صون على الإمارة، و ستكون ندامة يوم القيامة)**[1]

واتە: ئێوە پێداگیری دەکەن لەسـەر دەسـەڵات وفەرمان ڕەوایەتی وەرگرتن، دەسـەڵات وەرگرتنیش پەشیمانی ڕۆژی قیامەتە.

- لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: **(إنا والله لا نوليِّ هذا العمل أحداً سأله، أو أحداً حرص عليه)**[2]

واتە: سوێند بە الله کەسێک ناکەین بە کاربەدەست کە خۆی داوای بکات، یان سووربێت لەسەر وەرگرتنی.

[1] لە سەحیحی بوخاری (ژ: ٧١٤٨) هاتووە.

[2] لە سەحیحی موسلیم (ژ: ١٧٣٣) هاتووە.

- پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: **(مَنْ تَكَفَّلَ لِي أَن لا يَسْأَلَ النَّاسَ شَيْئًا، وَأَتَكَفَّلُ لَهُ بالجَنَّة)**[1]

واتە: کێ پەیمانم پێ دەدات کە داوای هیچ شـــتێک لە خەڵک نەکات، منیش پەیمانی بەهەشتی پێ دەدەم.

جا ئەو کار و ئیش و قسە و خۆ دەرخستن و مەتحکردنی خۆت و داواکردنی دەسەڵات و داواکردن لە خەڵکی کە دەنگیان پێ بدرێ هی ئەو کاندید و بەربژێرانەی بۆ هەڵبژاردن کار دەکەن و لە گۆڕەپانەکەدا ســەرنجی خەڵک ڕادەکێشــن گەر ســەرنجیان بدەی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر (ﷺ) یان لێ دێتەجێ، ئەوان لەبەر خەڵکی دەپاڕێنەوە و داوایان لێ دەکەن زەلیلانە وە زۆر شت تەحەمول دەکەن و قبوڵ دەکەن و لایەنەکانیشیان سواڵی دەنگدان دەکەن لە خەڵکەکە.

**٣-خاڵی سـێیەم لە خلیسـکان و خراپیەکان؛** ڕێگادان بە هەموو کەس و لایەنێک بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردن.

کەســەکە و لایەنەکە باشــبێ یان خراپبێ کافربێ دوو ڕووبێ درۆزنبێ بەدڕەوشــتبێ هەر کەســێکبێ، پێوەر لەلای ئەوان ئەو شــتانە نییە، باشــایەتی و چاکایەتی و دینداری و

[1] لە -الترغيب والترهيب-دا (ژ: ٨٠٧) هاتووە و سەحیحە.

موسڵمانییەتی، کە سی موسڵمان و بێ بڕوا و بێ گوناح و گوناحکار و ڕاستگۆ و درۆزن و بەدڕەوشت و ڕەوشت بەرز هەموویان دەهێندرێنە یەک ئاست و بەیەک پێوەر تەمەشا دەکرێن، پێوەرەکەشیان ئەوەیە ئەو یاسایانەی کە ئەوان دایان ڕشتووە لێی بێتەجێ، جا کەسەکە ئەگەر لە ئایندا بە خراپیش ناو ببرێ و هیچ پێوەرێکی ئاینی و ڕەوشت بەرزیی و عورفیشی لێ نەیەتەجێ، ئەوەیە پڕۆسەی عەلمانیەت و دیموکراسیەت بۆ هەڵبژاردن:

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿**قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ**﴾ **(الزمر : ٩)**

واتە: ئایە ئەوانەی زانستیان هەیە و دەیزانن یەک ئاست و یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی نایزانن و زانستییان نییە.

- الله تعالى فەرموویەتی: **(أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ * مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ) (القلم :٣٥-٣٦)**

واتە: ئایە موسڵمانان وەکو تاوانباران یان کافران دابنێین * ئەوە چیتانە چۆن بڕیار دەدەن.

ئەوە چ بڕیارێکە کە موسڵمان و کافر بەیەک ئاست تەماشا بکرێت و لە یەک ڕووەوە پێکەوە یەکسان بکرێن لەگەڵ کافر و بێ بڕوا یان گوناحبار لەگەڵ بێ گوناح یان تاوانبار لەگەڵ بێتاوان.

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿مَثَلُ الْفَرِيقَيْنِ كَالأَعْمَى وَالأَصَمِّ وَالْبَصِيرِ وَالسَّمِيعِ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلاً أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ﴾ (هود : ٢٤)

واتە: نموونەی دوو کۆمەڵەکە بڕوادار و بێ بڕوا وەکو نابینا و کەسێک کە چاوی نابینێت یان کەسێک کە نابیستێ کەڕە وە لەگەڵ چاو ساغێک و کەسێک کە دەیبینێ و دەیبیستێ ئایە ئەوانە یەکسانن ئایە تاوەکو کەی بیر ناکەنەوە.

واتە قەتاوقەت کەسێکی نابینا و ئەوەی دەبینێ وەکو یەک یەکسانیان ناکات و یەکسان نین وە کەسێک کەوا کەڕە و نابیستێ لەگەڵ کەسێک کەوا دەبیستێ وەک یەک نین بە دڵنیاییەوە.

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾ (ص : ٢٨)

واتە: ئایە ئەوانەی بڕوایان هێنا و کردەوەی چاکیان کردووە وەکو کافر و گەندەڵکاران لە زەویدا دابنێین ئەوانەی پارێزگارن وەکو تاوانبار و خراپەکاران دایان بنێین قەتاوقەت نابێ وەکو یەک دابنرێن و لە یەکتر جودان.

کەواتە ناکرێت بە یەکچاو و یەکسانی تەمەشای باش و خراپەکان وە کافر و موسڵمانان بکرێت کە لە پڕۆسەی هەڵبژاردن یەکسان دەکرێن، وە لە زۆر بوار و شتەکانیشدا تەنها

ئەو یاســـایانە ڕەچاو دەکرێ کەوا دایان ناوە کەســـی کافر و بێدین وە کەســـی موشریک

کەسی داوێنپیس کەسی خەتابار کەسی ناڕێک و نالەبار دەهێندرێتە ئاستی کەسەکانی تر،

هەردوولا بۆیان هەیە بەشـــداری بکەن بە یەکســـانی و تێیدا بەشـــداربن و خۆیان بدەنە

دەنگدان.

نابێ موســـڵمان کەســـی کافر بکاتە کەســـی نزیکی خۆی و لە دەوروبەری خۆی دابنێت و

لەگەڵیدابێ الله ئەوەی قەدەغە کردووە و نایهەوێت کە دەفەرمووێ: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَـــاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ**﴾ **(ال عمران : ١١٨)** واتە: ئەی کەســـانێ کە بڕواتان هێناوە مەگرن بۆ خۆتان دۆســـتی گیانی بە گیانی

جگە لە خۆتان درێغیتان لێ ناکەن لە هیچ شـــەڕ و خراپەیەک ئاواتە خوازی ناخۆشـــیتانن

بێگومان دەرئەکەوێت خەشـــم و قین لە(قســـەکانی) دەمیانەوە وە ئەوەی لە دڵیاندا

شاردویانەتەوە گەورەترە بەڕاستی بەڵگەکانمان بۆ ڕوون کردونەتەوە ئەگەر ئێوە ژیربن.

واتە نابێ کە سێکی کافری بێ بڕوا بکەیتە دۆ ست و هاوڕێ و لێی نزیک بیتەوە و پرس و

ڕای پێبکرێ و ڕاوێژی پێبکرێ، کە لە پرۆســـەی دەنگدانەکەدا ئەوە ئەنجام دەدرێ و لە

چوونە ناو پەڕلەمانەکەش و پەڕلەمانتاریەتیەکەشـــدا ئا ئەوانە دەبنە هاوڕێ و دۆســـتن و پرس و ڕایان پێ دەکرێ و لەگەڵیان دەبی و نهێنیەکانت دەزانن.

ئەبو موســـای ئەشـــعەری (رضي الله عنه) کە یەکێک لە نەســـڕانیەکانی ئەهلی ذیمەی وەرگرتبوو بە نوســـەر و کاتب پێشـــەوا عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) نامەی بۆ نووســی و ســەر زەنشــتی کرد لەســەر ئەو کارەی زۆر بە توندی، ئەو ئایەتەی بۆ نارد **﴿لَا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَـــاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ﴾**.

پێشـــەوا قوڕتوبی -رحمه الله- لە تەفســـیری ئەو ئایەتەدا فەرموویەتی: لەو ســـەردەمەی ئێمەدا[1] حاڵ و بارەکان سەراو ژوور کراوەتەوە لەلایەن نەفام و گێلەکان لە دەسەڵاتداران و فەرمان ڕەوایان بە گرتنی خاوەن پەرتووکەکان (جولەکە و نەســـڕانیەکان) بە نوســـەر و ئەمین کە دانراون یان پێیان دەدرێت.

کەواتە پشـــتیان پێ دەبەســـترێت، دەهێندرێن دەکرێنە نوســـەر، قبوڵیان نەبووە زانایان و پێشینانی چاک، وە زۆریان پێ هەڵە و نالەبار بووە، تەنانەت بە کاتب و نوسەرێکیش دایان بنێی جولەکە و دیانەکان یان کافر و موشریکەکان.

---
[1] مەبەست پێی سەردەمی خۆیەتی پێشەوا قوڕتوبی نەک سەردەمی ئێمەی ئیستا.

کەواتە ئەگەر پێشەوا عومەر (رضي الله عنه) ئێستا لەو سەردەمەی هاوچەرخی ئێمە ژیابا دەبوایە چی بڵێ بەو کەسـانەی بەناوی موسـڵمانیەتییەوە یان پاشـگری ئیسـلامییان بەخۆیانەوە لکاندووە ئەو هەموو هەوڵە دەدەن تاوەکو نزیک ببنەوە و دۆسـتبن لەگەڵ ئەو کەسـانەی کەوا کافر و بێ بڕوان و ئەو کەسـانەی بەدڕەوشـت و خراپەکارن وە لەگەڵیان بچنە یەک بازنە و لەوێ ڕاوێژ بکەن و حیساب لەگەڵ یەکتر بکەن بەبێ ئەوەی حیساب بۆ الله و پێغەمبەرەکەی الله (ﷺ) بکەن، جا بە دڵنیاییەوە پێشەوا عومەر ڕازی نەدەبوو.

**٤-خاڵی چوارەم لە خلیسـکان و خراپیەکان؛** پارە و سـامانێکی زۆر و کاتی زۆر بە فیڕۆ دەدرێ.

ئەو سامان و پارانەی لە پڕوپاگەندەی ناشەرعی هەڵبژاردن بە فیڕۆ دەدرێ یەکجار زۆرن و چەندین کەسـی هەژار و نەبووی پێ دەبوژێتەوە ئەگەر پێیان بدرێت، ئەو کاتەی کە لێپرسـینەوەی لەسـەرە و ئەوەی کە الله تعالی سـوێندی پێی خواردوە و بە گرینگ پیشانی داوە کە هەر ئەوە بۆت مسۆگەر دەکات ئایە تۆ بەهەشتیت یان دۆزەخیت، ئەوە لە پڕوپاگەندەی پوچ و دیعایەی هەڵبژاردن سەرف دەکرێت و کار و قسە و گووتن و ئیشی زۆر نالەبار و بێشـەرعی و مایە پووچی تێدا ئەنجام دەدرێت، ئەو بە هەدەردانی پارە و

سامان و بە فیڕودانی کات لە قورئان و شەریعەتی ئیسلام قەدەغە کراون و دروست نییە، ئەگەر سەرنجی ئەو ئایەتانە بدەین ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت:

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾ (النساء : ٢٩)

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە سامانەکانتان لە نێوانتان بە نا ڕەوایەتی مەخۆن مەگەر بازرگانی و کڕین و فرۆشتن بە دڵ و ڕەزامەندی لە ئێوە بێت.

کەواتە ئەو پارە و پولەی کە لە نێوان خەڵکەکەدا بەو شێوەیە سەرف دەکرێ و بە فیڕۆ دەدرێ الله پێی ڕازی نییە.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ (الأنعام : ١٤١)

واتە: زێدەڕەوی لە سامان و پارە و پول مەکەن چونکە بەڕاستی الله زێدە ڕەوانی خۆش ناوێت.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا﴾ (الإسراء : ٢٧)

واتە: ئەوانەی پارە و پول بە فیڕۆ دەدەن وەکو شەیتانەکانن وە شەیتانیش سپڵە و کافرە بە پەروەردگارەکەی.

- پێغەمبەریش (ﷺ) سـەبارەت بە کاتی زێڕینمان دەفەرمووێ: **(اغتنِمْ خمسًـا قبل خمسٍ : شـبابَك قبل هَرَمِك، وصِـحَّتَك قبل سَـقَمِك، وغناك قبل فقرِك، وفراغَك قبل شُغلِك)**[1]

واتە: پێنج شـت لە پێش پێنجیـانەوە بە دەرفەت وەرگرن: گەنجـایەتیەکەت پێش پیر بوونەکەت، ژیانەکەت پێش مردنەکەت، تەندروستیت پێش نەخۆش کەوتنت، دەوڵەمەندید پێش هەژاریەکەت، دەست بەتاڵیەکەت پێش سەرقاڵیەکەت.

جا شـاعیریش جوانی فەرمووە کە فەرموویەتی: **(اغتنم في الفراغ فـضل ركوع فـعـسى ان يكون موتك بغته، كم من صـحيح مات من غير علة وكم من سـقيم عاش حينا من الدهر)** واتە: لە کاتی دەسـت بەتاڵیت بە قەد خۆ چەماندنەوەیەک (بۆ الله تعالى) ئەو پاداشتە وەربگرە کێ دەڵێ مردنەکەی تۆ لە ناکاو نییە، چەند کەس لە لەش ساغان مردوون بەبێ ئەوەی نەخۆش بووبن وە چەند کەس لە نەخۆشـەکان ماوەیەک لە ژیاندا ماونەتەوە و نەمردوون.

---

[1] ئەوەشـیان پێشـەوا حاکم لە موسـتەدرەکەکەی (ژ: ٧٨٤٦) لە (٤/ ٣٤١) هێناویێتی، وە ئیبنو ئەبی شـەیبە (ژ: ٣٤٣١٩) (٧/ ٧٧) هێناویێتی، وە لە سـەحیحی -الترغيب والترهيب-یش (ژ: ٣٣٥٥) ئەو فەرموودە تۆمار بووە و هاتووە و بە سـەحیح و حەسەن دانراوە.

کەواتە دەســـت بە تاڵیەکەت بۆ الله بەکار بێنە نەچی بۆ پڕو پاگەندە و کار و ئیشـــی بێشـــەرعی و گوناح و تاوان ئەنجام بدەی تێیدا، لەبەر ئەوەی ژیانەکەت لێپرســـینەوەی لەسەرە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی لە مەیدانی حەشر و حیسابدا تۆ ناتوانی هەنگاو بنێیت، هەتا چوار پرســـیارت لێ نەکرێت، یەکێک لەو پرســـیارانەی کە دەفەرمووێ لێت دەکرێ: **(عَن عُمُرِه فيما أفناهُ)** تەمەنی خۆت لە چی ســـەرف کرد؟ توخوا تۆ ڕووت هەیە بڵێی ئەی الله تعالی لە پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن؟ لە قســـە ناڕێک و نالەباراکان؟ لە بێ شـــەرعیەکان؟ لە ڕازیبوون بە دۆستایەتی کافر و بێ بڕوایان بەوەی کەوا دینت وازی لێ بهێندرێ و یاسای دەســـتکرد جێبەجێ بکرێ؟ یان الله تعالی پرســـیارت لێدەکات **(وعنْ شـــبابِهِ فيما أبلاهُ)** گەنجایەتیەکەت هەمووی لە چی سەرف کرد؟ لەوەت سەرف کرد پۆستەرات هەڵبواسی؟ ڕسم و وێنەکان هەڵبواسی؟ لەوەت سەرفکرد کەوا چەپڵەی لێدەی و تەماشای نامووسی خەڵکی بکەی ئەگەر نێرینەی و ئەگەر ئافرەت و کچیشی ناموسی بنەماڵەکەت ببەی خۆت بەرچاوکەی بۆ خەڵکەکەی؟ بەدوای درۆ و دەلەسەکان بکەوی؟ کاری بێ شەرعی ئەنجام بدەی؟ خەریکی ڕێکلام و ئەنتەرنێت و شتەکانبی بۆ پڕوپاگەندەی پڕۆسەیەکی بێشەرعی؟ وە دەربارەی ماڵ و سامانەکەشت پرسیارت لێدەکرێ **(وعن مالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وفيما**

**أنفقهُ)** لە ماڵەکەشی پرسیاری لێدەکرێ لەکوێ و چۆنی بەدەست هێناوە و لە چی سەرف کردووە بە ئەندام پەڕلەمانێتی لە پڕۆســـەیەکی بێشـــەرعیدا پارەت دەســـتکەوت؟ لە پێناو پڕوپاگەندە و کار و بار و قســـەی بێشـــەرعی بۆ پڕۆســـەیەکی بێشـــەرعی بەکارت هێنا؟ ئەوانەی عیلم و زانســـتیشـــیان هەیە پرســـیاریان لێدەکرێ **(وعن عِلمِه ماذا عمل فيه)**[1] ئایە کارت بە عیلمەکەت کرد؟ نەتدەزانی یاســـا دانەر بەس الله یە؟ بەس ئەوە مافی هەیە یاسا دابنێ و کەسی تر مافی نییە، بۆ ئەو مافەت دا بە خەڵکی تر؟ ئایە بۆ عەمەلت بە عیلم و زانســـتیەکەت نەکرد؟ نەتزانی هەر الله تعالى یە حەڵاڵ حەڵاڵ دەکات و حەرام حەرام دەکات کەس بۆی نییە حەڵاڵەکانی ئەو حەرام بکات و حەرامەکانی حەڵاڵ بکات؟ بۆچی ئەو مافەت دا بە خەڵکی تر؟ بۆچی چووی لە پاڵ کەسانێک دانیشتی و بە دۆستت گرتن خۆشـــتویســـتن لێیان نزیک بویەوە وەلائت بۆیان پەیداکرد کاتێک کە الله تعالى قەدەغەی لێکردی عیلمت پێی هەبوو بۆچی کار و کردەوەت بە عیلم و زانســـتیەکەت نەکرد؟ بۆ چوویە دەنگدان؟ کارێکی بێ شەرعیت کرد لە پڕۆ سەیەکی بێ شەرعیدا لەپڕۆ سەیەکی مایە پووچی تاقیکراوە کە شکستی هێناوە.

---

[1] پێشەوا ترمزی (ژ: ٢٤١٦) هێناوێتی، وە تەبەرانی (ژ: ٩٧٧٢)، وە بەیهەقی لە -شعب الإيمان- (ژ: ١٧٨٤) هێناوێتی.

بە گوێرەی ژیری و عەقڵی و واقیعیش هەڵەیە شـــتێک چەند جارێک شـــكســـت بێنیێ و بدۆڕێ جارێكی تر سەری خۆتی پێوە بئێشێنی و بە دوایدا بچی.

جا الله تعالی لە مەیدانی حەشر و حیســـابدا ئەو لێپرســـینەوانە دەربارەی ژیان و تەمەن و گەنجایەتی و پارە و پولت دەكات، كە لەو پڕوپاگەندانە لەكاتی پڕۆســـەی هەڵبژاردن و بەشداریكردن دەكرێ، لە الله بترسە ئا ئەوانە بێشەرعین و قەدەغەن كەوا ئەنجام دەدرێن.

**٥-خاڵی پێنجەم لە خلیســكان و خراپیەكان؛** چەند خاڵێک لەخۆدەگرێت كە كاری بێشەرعین و لە پڕپاگەندەكاندا ئەنجام دەدرێن:

**١-ڕازیكردنی خەڵكی بەوەی دەنگی پێبدەن، ئا ئەو كەســە هەركێ بێت و بە هەر شێوازێک بێت.**

ڕازیكردنی خەڵكی بە هەر شـــێوازێک بێت كە پشـــتگیری لێبكەن یان هاتوچۆكردنیان و ڕێزلێنانیان و پێداهەڵدانیان، ئەگەر شایستەش نەبن ئەو كەسانە ئەگەر كافر و بێ بڕواش بن ئەگەر گوناحكاریشـــبن، كاتێک بەربژێرەكە دەچێتە لایان بە نیازی ئەوەی دەنگی پێبدەن دەستخۆشییان لێدەكات و ڕێزیان لێدەنێ كە الله تعالی بەوە ڕازی نییە.

- الله تعالی دەفەرمووێ: **﴿يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنْ تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾ (التوبة : ٩٦)**

واتە: دووڕوان ســـوێند تان بۆ دەخۆن تاوەکو لێیان ڕازیبن ئەگەر لێیان ڕازی بوون ئەوە بەڕاستی الله ڕازی نابێت لە کەسانێکی لە فەرمان دەرچوو و پێچەوانە کارانی فەرمانەکانی الله و پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

جا ئەوەی ڕەزامەندی خەڵکی بە نا ڕەزایەتی الله تعالی بە دەســـت بێنێ، بە دڵنیاییەوە الله تعالی لێی توڕە دەبێ.

- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(مَنِ التمسَ رضـا اللَّهِ بسَـخطِ النَّاسِ كفاهُ اللَّهُ مؤنةَ النَّاسِ ، ومَنِ التمسَ رضا النَّاسِ بسخطِ اللَّهِ وَكلَهُ اللَّهُ إلى النَّاسِ)**[١]

واتە: ئەوەی بیەوێ ڕەزامەندی الله بە توڕەیی خەڵک بخوازێ ئەوە الله تعالی بەسـیەتی و لەبەر منەتی خەڵکەکە دەری دێنێ و چی بیەوێ بۆی دەکـات، وە ئەوەشـــی بیەوێـت ڕەزامەندی خەڵکی بە دەســـت بێنێت بە توڕەیی الله الله دەیداتە دەســـتی خەڵکەکە کە ئازاری بدەن.

ئەوانەش کەوا بەشداری پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن دەکەن لەوانەی بەربژێر و کاندیدن هەر دەیانەوێ دڵی خەڵکەکە بەوەی ڕازی بکەن دەنگیان پێبدا، ئەو کەســە باشــبێ خراپبێ نا ڕێکبێ نا لەباربێ لێی وە دەنگ نایەن و دەستخۆشــی لێدەکەن کەســەکە هەرکێبێ و چۆن

[١] لە سونەنی ترمزی (ژ: ٢٤١٤) هاتووە.

دەنگیان پێبدا هیچ، لەلایان ئاسـاییە، وەکو سـواڵ کەرێک، ئەوانەی فێرن سـواڵ دەکەن، ئەگەر کەسـەکە شـتێکی پێ بدات لێی وەردەگرێ، شـتەکە کەمبێ یان زۆربێ، ئەگەر کەسەکە هەرچیبێ و چی بکات چاوپۆشی لێدەکات، لە پێناو بە دەستهێنانی پارە و شتەکە کەوا پێی دەدرێ.

جا ئەوەش ئەو ئایەت و حەدیسـانە دەیگرێتەوە نابێ کەسـی خاوەن بەرزایەتی و بە شەخسیەت کە سایەتی خۆی بێنێتە ئەو ئا ستە و ئاوا بپارێتەوە و شتەکان بە دە ست بێنێ پێچەوانەی شەرعە.

## ٢-وێنەکێشان و هەڵواسینی وێنەکان.

وێنەی مرۆڤ و کە سەکان بە نێر و بە مێ هەڵدەواسرێ و بایەخی زۆری پێدەدرێ و ڕێزی لێدەگیرێ، کە دەتوانین بڵێین لە سـەرەتاوە شـیرک و هاوبەشـیش لەوەوە سـەری هەڵدا، هەر وەکو لەسـەردەمی نوح پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکانێک هەبوون پیاو چاکبوون و وێنەیان داتاشرا، لە پاشـان هێدی هێدی لە نەوە بۆ نەوە پەرسـتران، لە کۆتایەکەیدا شـیرک و هاوبەشی لێ هاتەدی.

جا بەڵگە و فەرموودەی زۆر هەیە کە باسی خراپی وێنە گرتن و وێنە کێشان و هەڵواسینی دەکات، ئەگەر نێر و مێ بە یەکەوە پیاو و ژن وێنەکان بکێشن گوناحەکە مەزنتر و تاوانەکە

گەورەتر دەبێ، ئەی ئەگەر بێو کەسەکە کەوا وێنەی لەگەڵ دەگیرێ، پیاوێکی نا مەحرەم لەگەڵ ئافرەتێکی نا مەحرەم؟ هێشتا گوناح و تاوانەکە زیاتر دەبێ و پێکەوە گوناحبار دەبن، وە ئەوانەی کەوا بەرپرس و وەلی ئەمری کچەکە و ئافرەتەکەشن ئەوانیش گوناح و تاوانی زۆریان دێتە سەر، کە ڕێگا دەدەن کچەکانیان یان خێزان و هاوسەرەکانیان بەشداری ئەو شوێنانە بکەن و وێنەیان بکێشرێ لەگەڵ پیاو و نێرێنە نا مەحرەمەکان.

- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: **(كل مصور في النار يجعل له بكل صورة صورها نفسا فتعذبه في جهنم)**[1]

واتە: هەموو وێنەگر و وێنە کێشێک لە ئاگردایە وە بۆ هەر وێنەیەک کە کێشاویێتی نەفسێکی بۆ دروست دەکرێت و سزای دەدا لە ئاگردا.

واتە ئەوانەی وێنە دەکێشن، بە تایبەت وێنەکێشانی پڕوپاگەندەکان بۆ هەڵواسین و ئنتیخابات و هەڵبژاردن، بە دڵنیاییەوە زۆر تاوانکارن گوناحبارن ئەو فەرموودانە دەیانگرێتەوە ئەگەر موسڵمانیش بن، جا دەبێ خۆیانی لێ دوور بگرن.

وێنەکیشان و ڕسم گرتن بەو کەرەستە و ئامرازە نوێیانە وەکو؛ فۆتۆگرافی ڕا جیاوازی زانایانی لەسەرە، هەندێک زانا پێیان وایە بە هیچ شێوازێک دروست نییە، مەگەر بۆ

---

[1] لە سەحیحی موسلیم (ژ: ٢١١٠) هاتووە.

زەرورات بۆ مەعامەلات و نفوس و جنسیە و پاسەپۆڕت و ئەو شتانەی کە کەسەکان ئەمڕۆ لە یا سا و سیستەمی عەلمانیەت و دیموکرا سیەتی سەردەم پێویستیان دەبێ، ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی بەکاری بێنن و وێنەکان بگرن و بکێشن، ئەگەرنا بۆیان نییە و حەرامە.

## هەندێکیش دەڵێن بە مەرج حەڵاڵە:

١-گوناحی دەرەوەی وێنە کێشان و وێنە گرتنەکەی لێ نەیەتەجێ.

٢-لە پێناو خەیر و چاکە بێ.

٣-بۆ یادگاری بێت.

٤-هەڵنەواسرێ.

٥-لە شوێنێک بە شاراوەیی دابندرێ.

٦-نێر و مێ تێکەڵی یەک نەبن.

٧-پیاو هی ئافرەتان نەگرێ و ئافرەتیش هی پیاوان نەگرێ و وێنەکانی یەکتر نەبینن.

ئەو خۆپارێزیانە کە زۆر زەحمەت و قورسیشە ئاسان نایەتەجێ، هەندێک بە کۆمەڵێک لەو مەرجانەوە ڕێگا دراوی دەکەن، کە هیچ یێک لە مەرجە کانیش بەو زا نا یانەی کە

مەرجیشیان داناوە لە وێنە کێشان و وێنە گرتن و هەڵواسینی وێنەکان لە کاتی پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن و دەنگدانی سەردەم نایەتەجێ و نایگرنەوە.

- عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب (رضي الله عنه) بۆمان دەگێڕێتەوە گوتوویەتی: خواردنێکم دروستکرد، پێغەمبەرم (ﷺ) بانگێشت کرد و هات، کە هاتە ژورەوە پەردەیەکی بینی وێنەی تێدا بوو، دواتر چووە دەرەوە و فەرمووی: فریشتە ناچێتە هیچ ماڵێکەوە وێنەی تێدابێت [١] [٢].

بە دڵنیاییەوە ئەگەر وێنەکە شەرعیبێ (گیانلەبەر نەبێ) ئاسایییە هەڵواسینی وەکو دار و درەخت و شاخ و داخ و ئەو بابەتە شتانە، بەس ئەو وێنانەی لە پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن هەڵدەواسرێن وێنەی گیانلەبەرن و ڕێزیشیان لێ دەگیرێ، وە ئەو کاتە بە دڵنیاییەوە الله تعالی تورە دەبێ، وە خەشم دەگرێ، وە ناڕازییە لەو وڵات و شوێن و جێگا و لایەن و کەسانەی کە ئەو کارە بێشەرعییە ئەنجام دەدەن و دەیکەن.

---

[١] پێشەوا نەسائی لە سونەنەکەی (ژ: ٥٣٥١) هێناویێتی و سەحیحە.

[٢] زانایان فەرموویانە مەبەست پێی ئەو فریشتانەیە کە خەیر و چاکەن و بەرگری لە کەس و موسڵمانەکان دەکەن، بەڵام فریشتەی نوسینی تاوان و گوناحەکان و کار و کردەوەکان ئەوانە ئامادە دەبن و دەچن، وە فریشتەی ڕۆح کێشان و گیان کێشان کاتێک کەسێک ئەجەلی هاتبێت ئەگەر وێنەش هەڵواسرابێت و هەبێ دەچن بۆ ئەو شوێنە.

**٣-خەڵک کۆدەکرێتەوە لە کاتی پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن وەکو؛ (تێکەڵکردنی نێر و مێ و ژن و پیاوەکان و ژەندنی مۆسیقا و گۆرانی گووتن و تەماشاکردنی ناشەرعی و...هتد)**

ئەگەر تەما شای ئەو هۆڵ و گۆڕەپانانە بکەین و سەرنجیان بدەین هەڵبژاردنی تێدا دەکرێ سەرتاپا کار و قسەی بێشەرعی و گوناحی تێدا دەبیسترێ و دەبیندرێ، کە سی مو سڵمان دەبێ خۆی لە قسەی بێ سوود و خراپ بپارێزێ، نە دەبێ بیانکات و نە دەبێ گوێشیان بۆ بگرێت.

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿**وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ**﴾ **(القصص : ٥٥)**

واتە: ئەگەر کەسە بڕوادارەکان لە ئەگەری ئەوەی کە گوێبیستی جوێن و قسەی بێکەڵک بوو بان لە کافرەکان گوێیان بۆ نەدەگرت و دە یانگووت گوێی بۆ ناگرین و دەڵێین بە نەفامان: کار و کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان کار و کردەوەی ئێوەش بۆ خۆتان سڵاوتان لێ بێت ئێمە شەڕ خواز نین و نامانەوێت هاوڕێیەتی نەفامان بکەین.

لەوە دەردەکەوێت کە بڕوادار پابەندی پرۆگرامی الله یە و بەشدار نابێت لەو شوێنانە و گوێ ناگرێ بۆ ئەو قسانەی کەوا بێشەرعین و بێنرخن وە گوێیان پێنادات.

• الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْـــهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا﴾ **(الفرقان : ٧٢)**

واتە: ئەوانەی کەوا بڕواداری ڕا ستەقینەن یەکێک لە وە سف و سیفەتەکانیان ئەوەیە کە شایەتی بە درۆ نادەن و لەو کۆڕ و کۆبونەوانە ئامادە نابن کە شایەتی بە درۆ و قسەی بێشەرعی تێدا ئەنجام دەدرێت ئەگەر بەلای خراپەکاراندا ڕۆیشتن پشتیان تێدەکەن و بە خراپەکانیان ڕازی نابن وە ڕێزی خۆیان دەگرن و دوور دەکەونەوە لێیان.

**﴿لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ﴾ زانایان فەرموویانە دوو مانا دەگرێتەوە:**

١-بە واتای ئەوەی ئامادە نابێ لە شوێنی گوناح و تاوانەکان.

٢-بە واتای ئەوەی گەواهی و شـاهێدی خراپە و درۆ نادات بەسـەر هیچ کەس و بۆ هیچ کەسێک.

بەڵام دەتوانین بڵێین هەردوو ڕایە کان ڕاســـت و تەواون دەیگرێتەوە وەکو هە ند ێک لە زانایان فەرموویانە، واتە نە ئامادە دەبن لە شوێنی گوناح و تاوان و خراپەکان، نە شاهێدی بە درۆش دەدەن بۆ هیچ کەس و لەسەر هیچ کەسێک.

گەر ســـەرنجی ئەو گۆڕەپان و شـــوێنانە بدەین دەبینین پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری پێشـــەوا (ﷺ) و ژیاننامەکەی و هەڵســـوکەوتەکانی دەکرێ و ئەنجام دەدرێت لە کاتی

پڕو پاگە ندەی هەڵبژاردن، بۆ نموونە؛ کاتێک نێر و مێ تێکەڵ یەک دەکرێن کارێکی بێشەرعییە لە دیدگای قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)، وە تەماشا کردنی کچ و کوڕە نا مەحرەمەکان تاوان و گوناحە.

- پێغەمبەر (ﷺ) لە یەکێک لە جارەکان کاتێک فەزڵی ئامۆزای پێغەمبەر (ﷺ) کوڕی عەباسی مامی (رضي الله عنهما) لەگەڵیدا بوو، کاتێک ئافرەتێک هات پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد لە پرسیاری شەرعی و دەربارەی حەج، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) سەر و ملی فەزڵی کوڕە مامی سوڕاندەوە و لایدا بەسەر ئەو ئافرەتەیەوە هەتا لێک نەڕوانن، کاتێ کەوا پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) بۆ وات کرد لە کوڕە مامەکەت عەباس؟ فەرمووی: من دوو گەنجم بینی گەنجێکی نێر و گەنجێکی مێ دەڕۆیشتن، من ئەمین نەبووم لە شەیتان بە سەریانەوە تووشی تاوان و گوناحیان نەکات و نەیهێشت تەماشای یەکتر بکەن[١].

بە دڵنیاییەوە ئەوەی ناموسی بە جوانی نە پارێزێ و کەمتەرخەم بێت لە پاراستنی ناموسەکەی لایەنی کەم بێدەنگ بێت لێی لە کاتی خۆ خستنەڕوی کچ و خوشک و هاوسەر و دایک و هەر کەسێک کە ئەو لێی بەرپرسە لە ناموسەکانی و لە ئافرەتە

[١] لە سونەنی ترمزی (ژ: ٨٨٥) هاتووە و سەحیحە.

مەحرەمەکانی، وە کەســی نا مەحرەم لە پیاوان تەماشــای بکەن و لەگەڵیان تێکەڵ بێ تەنانەت لە شاشەی کەناڵەکانیش بێت، زانایانی سەردەم فەرموویانە پشکی دەیوسیەت و بێغیرەتایەتی بە بەر دەکەوێ.

- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(ثلا ثةٌ قد حرَّم ا لله عليهمُ الجـنةَ، مُدمنُ الخمرِ، والعاقُّ، والديُّوثُ الذي يُقرُّ في أهلهِ الخبَثَ)**[1]

واتە: سێ کەس هەن الله بەهەشتی لەسەریان حەرام کردووە (یەکسەر ناچنە بەهەشت)، ئەوەی لەسەر عارەق خواردنەوە بەردەوام بێ (لەسەریەوە بمرێ بەبێ تەوبە)، وە ئەوەی دایک و باوکی خۆی عەزیەت بدات، وە ئەو کەس (پیاو)ەش کەوا دەیوس و بێغیرەتە، ئەوەی خۆی بێدەنگ دەکات (زانایان فەرموویانە) لەو ئافرەتانەی کە ئەو وەلی ئەمریانە (خوشــکێتی دایکێتی یان کچێتی یان هاوســەرێتی لە پیســی و خراپە و بەدڕەوشــتی چاوپۆشییان لێ دەکات).

جا چەند کەس دەبینین کچەکانی خێزانەکانی خوشــکەکانی دەچن بەشــداری دەکەن لەو گۆڕەپانانە بەبێ منەتانە و کوڕ و پیاوانی لێیە تەنانەت دەگێڕدرێتەوە و ڕووشــی داوە بە

[1] نەسائی لە سونەنەکەی (ژ: ٢٥٦٢) هێناویێتی و سەحیحە، وە پێشەوا ئەحمەدیش لە موسنەدەکەی (ژ: ٥٣٧٢) هێناوێتی و تۆمارە.

بەڵگەی واقیعیش کە زۆرێک لە گەنجەکان ئەوانەی حەزیان بە ڕابواردنە یان ئارەزوویان دەجولێ تەنها بۆ ئەوە دەچن دەڵێن کاتی خۆ نمایش کردنی کچەکانە وە خۆ بۆیە کردن و جوان کردنیانە دەیانبینین و دڵمان دادەکەوێ و هەر یەک لەوێ کەسێکیان هەڵبژێرێ و پەیوەندی لەگەڵ دروست بکات.

کەواتە ئەو گۆڕەپانانە گۆڕەپانی گوناح و تاوان و خستنەڕووی ناموس و خستنە مەترسی دارێتی کردنی ناموسەکانە و لەوێدا چەندین گوناح و تاوانی بەو شێوەیەی لێ ئەنجام دەدرێ.

## ٤-قسەی گەورە و بەڵێنی ساختە و درۆ و بەکار هێنانی دەقە شەرعیەکان لە جگە لە شوێنی خۆیان.

ئەو کاندیدانە و لایەنگرەکانیان و لایەنەکانیان و بەرپرسەکانیان زۆرجار دەردەکەون لەو گۆڕەپان و شوێنانە، ئەو کات پاڵەوانێتی خۆیان بە دیاردەخەن و بەخۆیاندا هەڵدەڵێن (کە لە ڕابردوودا باسمان کرد)، لە پاشان قسەی ناشیاو و بێشەرعی بەسەر زمانیاندا دێت یان کار و کردەوەی بێشەرعی ئەنجام دەدرێ یان دەیکەن بە دیاریانەوە و لێی بێدەنگ دەبن، یەکێکیش لەو شتانە بەڵێنی زۆر گەورە گەورە بە خەڵکی دەدەن کە خاوەن بەڵێنەکانیشیان نابن لەو کاتەی کەوا دەر دەچن، وەکو زۆرجار دەبیسترێ و گوێمان لێیان دەبێ دەڵێن

چاکسـازی دەکەین پاکسـازی دەکەین بۆ گەنجەکان ئایندەی گەش و ژیانی خۆش دابین دەکەین حوکمی الله دەچەسـپێنین، بە تایبەت ئەوانەی کەوا پاشـگری ئیسـلامییان بەخۆ یانەوە لکا ندوە پڕ بە دەم یان لەو کاتەدا وا دەڵێن زۆر جار بۆ هەڵخەڵە تا ندنی خەڵکانێکە کەوا دین و ئیسـلام یان خۆشـدەوێ یان موسـڵمانن دەڵێن حوکمی الله دەچەسـپێنین و پەیڕەوی لێدەکەین، زۆری تریش لە قسـە و گووتە کان لە شـیعار و دروشمەکان کە بەرزی دەکەنەوە، لە بەڵێن و وەعدەکان کە دەیدەن بە خەڵکی.

جا قسەکانیان بەڵێ سەرەنج ڕاکێشن، هەندێک جار زاق و بریقن، بەڵام ئەگەر سەرنجی تەواوی لێبدەیت و ماوەیەک ئارام بگری لەسـەری بۆت دەردەکەوێت کە قسـە کان لە شوێنی خۆیان نین و خۆ شیان بە بیانووی جۆراوجۆر کە ئەو کات دەیهێننەوە بڕوایان پێی نییە و پەیڕەوی لێ ناکەن و وەعد و بەڵێنە کان ناهێننەجێ، ئەگەر پێشـیان دەڵێی بۆچی نایهێننەجێ؟ ئەو کات دەیە ها بیانوو یان هەیە، دەڵێن چی بکەین؟ ڕێگا مان پێنادەن ڕێگریمان لێدەکەن کارەکە نابێ ئێمە با شتر دەزانین ئاوامان کرد لە نهێنی ئەگەر لە ڕواڵەت دیار نەبێ، جا دەبێ خەڵکی بەڕا ستی عەقڵی هەبێت و بەکاری بخات و چەند پر سیارێک دەربارەیان بکات و سەرنجیان بدات:

١-ئایە ئەو ئەندام و لایەنانەی ئەو قسانەیان پێمان گووت لە خۆیان هاتوەتە جێ؟

٢-ئایە لەناو لایەنی خۆیان یان لەناو خاو و خێزانیاندا و لەناو دەوروبەریاندا و لەگەڵ ئەواندا قسەکانیان لێ هاتوەتەجێ؟

٣-ئایە چاکن پاکن تاوەکو بڵێن چاکسازی دەکەین و پاکسازی دەکەین؟

٤- ئایە تا چە ند لە ناو پارت و لایەنەکە یان یان خێزان و ماڵە کانیان و دەوروبەر یان نەخشەیان هەبووە و ئایندەی خۆیان و ماڵ و منداڵیان دابینکردووە؟

٥-ئایە تا چەند حوکم و فەرمانی الله یان جێبەجێ کردووە، هەم لە خودی کەسی خۆیان و هەم لە خێزان و منداڵەکانیان و لە دەورووبەریان و لەناو لایەن و پارت و کۆمەڵەکەیان؟

ئینجا ئەگەر کەسێک بۆخۆی نەبێ بۆ خەڵکی بە دڵنیاییەوە هیچی پێناکرێت و و ناشتوانێت هیچی وا بکات، وەکو الله فەرمان بە ئێمە دەکات سەرەتا خۆمانمان لەسەرە وەکو تاک، ئینجا دەوروبەرە نزیکەکەی خۆمان و هێدی هێدی وەکو بەردێک کە ئەیخەیتە ناو گۆمە ئاوێک بازنەی یەک بەدوای یەک بە دەوروبەریەوە دروست دەکات ئاوا هێدی هێدی دەڕوات کەسانی تر ئەرکیان دەکەوێتە سەرت بۆ ئەوەی چاکیان بکەی و پاکیان بکەی و بیانهێنیتە سەر ڕێگا و ئامۆژگارییان بکەی.

• الله تعالى دەفەرموویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (المائدة : ١٠٥)

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە خۆتانتان لەسەرە (واتە خۆتان ڕێنمویی بکەن و وەریبگرن و پێی بگەیەنن و بڕوادار ببن و بە دوای هیچێکی تر لە جگە لە ئیسلام نەکەون) ئەگەر هیدایەت و ڕێنمویتان بوو زیانتان پێ ناگەیەنێت گومڕایی ئەوەی گومڕا بووە وە گەڕانەوەی هەمووتان بۆلای الله یە هەواڵتان پێدەدات بەوەی کە کردووتانە.

جا لەو ئایەتەدا دەردەکەوێ هەر تاکێکی موسڵمان سەرەتا خۆی لەسەرە پێبگەیەنێ، تەوحید و الله بە یەکگرتن وەربگرێ و کوفر بکات بە طاغوت و پشت بکاتە شیرک و هاوبەشی و پابەندبێ بە فەرمانەکانی الله و پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) و پەیڕەوی بکات لە قورئان و لە فەرموودە، ئینجا دەپەڕێتەوە بۆ کەسە نزیکەکانی خۆی، ئەگەر باوکە بۆ منداڵەکان و هاوسەر و خێزانی، ئەگەر کەسێکی ترە بەرپرسە لە هەر شوێنێک بۆ ئەوانەی لە ژێر دەستی ئەودان و لە ژێر فەرمانی ئەودان، ئینجا بەرە بەرە و هێدی هێدی زیاد دەکات بازنەی بانگەوازی و پێگەیاندن و تێگەیاندن.

- الله تعالی دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ (التحريم : ٦)

واتە: ئەی ئەوانەی بڕوا تان هێناوە خۆتان و خێزان و منداڵەکانتان بپارێزن لە ئاگر کە هەڵگیرسێنەرەکەی و گڵپە پێدەرەکەی ئاگرەکە خەڵکەکە و بەردەکانن فریشتە توندوتیژەکان سەرپەرشتیاری ئەو ئاگرەن کە سەرپێچی فەرمانەکانی الله ناکەن لە فەرمان پێکراوەکانیدا و ئەوانەی الله فەرمانی پێکردوون ئەوان دەستبەجێ فەرمانەکان دەکەنە کار و جێبەجێی دەکەن.

کەواتە لەو ئەیاتەدا دەردەکەوێ کەسەکان لەناو ئەو پارت و لایەن و کۆمەڵانە ئەگەر ئیسلامییان بەخۆیان لکاندووە پێش هەموو کەسێک دەبێ ئیسلام پەیڕەو بکەن لە خودی خۆیاندا، لە پاشان لە خودی ماڵ و منداڵەکان و دەوروبەرەکانی خۆیاندا لەناو کۆمەڵ و تاقمی خۆیاندا چاکسازی بکەن پاکسازی بکەن حوکمی ئیسلام جێبەجێ بکەن، وە نەخشە ڕێگایان هەبێ بۆ ئایندەی باش و پابەندبن پێیەوە، ئەگەر وایان کرد ئینجا خەڵک ئەوەی قبوڵە و تەماشا دەکات و ئومێدی پێیان دروست دەبێ کە شتی تر بۆ خەڵکی تر بکەن لە

ڕێگایەکی شـەرعی نەک لە ڕێگای هەڵبژاردن و کارێکی پێچەوانەی قورئان و فەرموودە و وتەی زانایانی پێشین.

- پێغەمبەری پێشـــەواش (ﷺ) فەرموویەتی: **(خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِـهِ، وَأَنَـا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي)**[1]

واتە: چاکترینتان چاکترینتانە بۆ خێزان و منداڵەکانی، وە منیش چاکترینتانم بۆ خێزان و منداڵەکانم.

جا ئەگەر سـەرنجی زۆربەی کاندیدەکان بدەیت بۆت دەردەکەوێ کەوا بەخۆیان و منداڵ و خێزانەکانیان چاک و پاک نین، وە پاپەند نین بە فەرمانەکانی الله و پێغەمبەری پێشـەوا (ﷺ) هەم لە بیرو باوەڕ و الله بە یەکگرتن و کوفرکردن بە طاغوت و دوورکەوتنەوە لە هاوبەشی وە هەم لە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خۆیان و دەوروبەریان وە لەگەڵ چین و تاقم و کۆمەڵەکان وە هەم لە جل و بەرگ و کڕین و فرۆشـــتن و خوێندن و زانســـت و...هتد، زۆربەی جارەکان هیچێک لەوانەیان بە گوێرەی سەد لە سەدی فەرمانەکانی الله تعالی و پێغەمبەری پێشـــەوا (ﷺ) نییە چە ندە ها گو ناح و تاوان و هەڵە و کەم و کورتییان لێ دەبیندرێ.

---

[1] لە سونەنی ئیبنو ماجە (ژ: ١٩٧٧) هاتووە، لە هی ترمزیش (ژ: ٣٨٩٥) هاتووە و سەحیحە.

جا ئەگەر کەسێک بۆخۆی هیچ نەبێ و نەتوانێ کاریگەری لەسەر خۆی و خێزان و منداڵەکان و ئەو تاقم و کۆمەڵەی لە ناویدا دەژی و لەبەر دەستی خۆیدایە هەبێت چۆن دەتوانێ چاکسازی و پاکسازی و ڕێنمووییی خەڵکی بکات؟ ئەوەی دەیڵێن تەنها قسەی خۆش و بەڵێنی ساختە و ناڕاستی و زاق و بریقە بە دڵنیاییەوە بێ بنەمایە، لە ڕابردوو شدا ئەوە تەجروبە کراوە و دەرکەوتووە.

- اللە تعالی سەبارەت بەو بەڵێن و عەهدانەی کە دەدرێ و نایەنەجێ فەرموویەتی: ﴿**وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ وَلَا تَنْقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا إِنَّ اللهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ**﴾ **(النحل : ٩١)**

واتە: بە وەفا و بە ئەمەك بن بۆ ئەنجامدانی پەیمانی اللە کاتێك پەیمان دەدەن سوێند و پەیمان و بەڵێنتان هەڵمەوەشێننەوە دوای ئەوەی کە دووپات کرابۆوە و تەئکیدی لەسەر کرابوو لە کاتێکدا کە ئێوە اللە تان کردۆتە کەفیل و زامن بەسەر خۆتانەوە بێگومان اللە دەزانێت بەو کار و کردەوانەی کە دەیکەن.

- پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: **(آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ)**[1]

[1] لە سەحیحی بوخاری (ژ: ٣٣) و (٢٦٨٢) تۆمارە، وە لە سەحیحی موسلیمیش (ژ: ٥٩) تۆمارە.

واتە: نیشـــانە کانی دوو ڕوو ســـیانن: ئەگەر قســـەی کرد درۆ بکات، ئەگەر بەڵێنی دا نەیهێنێتەجێ، ئەگەر ئەمانەت و ڕاسپاردەی پێ ڕاسپاردرا ناپاکی تێدا بکات.

جا زۆرجار دەڵێن ئەو دەنگدانە شـاهێدییە و نابێ بیشـاریتەوە بە تایبەت سـەرکردەکان و لایەنگرەکان و بەناو بانگخوازەکان کە لەگەڵ ئەو لایەن و تاقم و کۆمەڵانەن یان سۆزدارن بۆیان لە کاتی پڕوپاگەندەکان دەڵێن دروست نابێ تۆ دەبێ شاهێدی بدەی بۆ کەسی چاک ئەگەرنا لە قیامەت لێت دەپرســـینەوە بە پەنجەی شـــاهێدومانی کە ئەوانە هیچیان لەگەڵ قورئان و فەرموودە تێک ناکاتەوە، کە ئەو ئایەتە دەخوێننەوە **﴿وَلَا تَكْتُمُوا الشَّـهَادَةَ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ (البقرة : ٢٨٣)** دەڵێن شـــاهێدیەکانتان مەشـــارنەوە ئەوەی بیشارێتەوە ئەوە دڵی گوناحکارە و نەخۆشە، جا شاهێدی لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەگەر سەرنجی فیقهی ئیسلامی بدەی چوارچێوە و بازنەی بۆ دانراوە چەندین مەرجی هەیە، ئەو کەسە کێ شاهێدی دەدا و لە چ کاتێکدایە وە شاهێدیەکەی چۆن لێ وەر دەگیرێ هیچی تێک ناکاتەوە بە دڵنیاییەوە لەگەڵ پڕۆسەی هەڵبژاردن و دەنگدانی ئەو سەردەمەی خۆمان.

جا هەر خراپە و کارێکی نا شیاو لە ئەندام و لایەنی خۆیان ببینن بە دڵنیاییەوە چاو پۆشی لێ دەکەن و بۆی پینە دەکەن، وە ئەگەر بچوکترین هەڵە و کەم و کورتیش لە بەرامبەرەکانیان ئەوانەی کەوا لێیان ڕازی نین و قسەیان لەسەر دەکەن ببینن ئەوە لێی گەورە دەکەن و پێی

دڵخۆش دەبن و بڵاوی دەکەنەوە و زیاتر بە دوای عەیب و عاریدا دەچن، کە بە دڵنیاییەوە ئەوە تێک ناکاتەوە لەگەڵ ڕێبازی اللە تعالی و پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) و پێچەوانەکەیەتی.

## ٥-بەربژێر کردن و کاندید کردنی ئافرەتان.

بە دڵنیاییەوە لە ئیسلامدا ئافرەت وەکو ئافرەت تەماشا کراوە و کار و ئەرکەکانی بۆ دانراوە و مافەکانی پارێزراوە اللە تعالی ئەوی بەدیهێناوە و بۆی داناوە دەبێ هەم ئافرەتان و هەم پیاوەکانیش پێیوە ڕازیبن و بۆی ملکەچ بن، ئافرەتان بە ڕازیبونەوە جێبەجێی بکەن و تەنها داوای ئەو مافانە بکەن کە اللە پێی داون، وە پیاوەکانیش بە ملکەچ بوونەوە ئەو مافانەی اللە پێی داون بۆیان جێبەجێ بکەن (دەستەبەر بکەن) و مافیان پێشێل نەکەن، وە کاری بەڕێوە بردنی دەسەڵاتی گشتی بە دڵنیاییەوە لەلای زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئیختیلاف و جیاوازیەکی یەکجار کەمی تێدایە ئەویش زانایەکانی تر فەرموو یانە و بەڵگەیان بەهێزترە حیسابیان بۆ ئەو ڕاو بۆچوونە نەکردووە دەڵێن دەسەڵاتی گشتی و ویلایە عامە نادرێتە دەستی ئافرەتان وەکو؛ سەرۆکایەتی و دادوەری و...هتد، چونکە بە دڵنیاییەوە اللە تعالی باشتری زانیوە ئافرەتان ئەو کار و بارەیان تەواو پێ هەڵنەسوڕێ و ئەرکەکە زۆر قورسبێ لە سەریان و ئاسان نەبێ بۆیان.

## بەو بەڵگانە دەسەڵات نادرێتە دەستی ئافرەتان:

١-بە درێژایی مێژووی دە سەڵاتی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و خەلیفە ڕا شیدەکان (رضي الله عنهم) و پێشـــینانی چاک بە تێکڕا (رحمهم الله) کاری گشـــتی و فەرمان ڕەوایەتی گشـتییان بە ئافرەتان نەداوە، کە باشـترین ئافرەتانیشـیان لەناودا هەبووە هەم لە زیرەکی و دانایی و زانستی و عیلم وە هەم لە تەقوا و پاپەندییەوە.

٢- پێغەمبەر ﷺ) دەفەرمووێ: **(لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ امْرَأَةً)**[١] واتە: سـەرکەوتوو نابن ئەو کەسانەی کە ئافرەت دەکەنە بەرپرسی کار و بارەکانیان[٢].

بە دڵنیاییەوە زۆرجار کاندید بوونی ئافرەت و ژنەکان ناکۆکی و کێشـەی خێزانیشـی لێکەوتوەتەوە و دەکەوێتەوە لە وڵاتان و لە شوێن و وڵاتەکەی خۆشیان، مەگەر کەسوکاری ئەو ئافرەتە لایەنگربن یان ئەندام بن لەو کۆمەڵ و پارتەی کە ئافرەتەکە خۆی بۆ یان کاندید کردووە یان لەسەر لیستی ئەوان بەربژێرە.

---

[١] لە سەحیحی بوخاری (ژ: ٤٤٢٥) و (ژ: ٧٠٩٩) هاتووە.

[٢] مەبەست پێی کار و باری گشتییە ئەگەرنا ئافرەت لە ماڵەوە بەرپرسە، الله تعالی بەرپرسی ماڵەوەی پێداوە هی منداڵی هی خۆی هی پیاوەکەی هی ماڵ و سامانی پیاوەکەی و ڕاگرتنی و پارا ستنی، لەوەدا ئەرکی لە سەرە و لە ئەستۆیە و بەرپرسایەتی پێدراوە.

جا بە دڵنیایی زیانی بەد ئابڕویی و بێشـەرمیشـی لێدەکەوێتەوە بۆ ئافرەتەکە، وا دەبیندرێ بەبەرچاوان و دەبیسـتین و جاری وا هەبووە گەنج و هەرزەکاران قسـە و پەلاری ئابڕو بەرانەیان لەو ئافرەتانە داوە، وە ئافرەتەکان ئەگەر بۆ خۆیان بیسـتبێتیان قبوڵیان بووە بە عەلمانی و بەو ئافرەتانەی کەوا ئیسـلامیشـیان وەکو پاشـکۆ بەخۆوە لکاندووە، ئەو کارە بێشـەرعیانە لەو کات و شـوێنانە دەکرێت بەبێ گوێدانە شـەرعی الله تعالی، وە هەندێک جار کاری زۆر ناشـیاو و قێزەون و بێشـەرعیشـیان لێ داوا کراوە بە بەرچاوی خەڵکی لەلایەن خەڵکانێکی هەرزەکار و نێرینە.

بە دڵنیاییەوە خلیسـکان و خراپیەکان زۆرن چەند لێی وردبینەوە زیاترمان بۆ دەردەکەوێت، ئەگەر سـوودی ڕواڵەتی و کەمی وەکو قومار و ئارەق لێی بێتەجێ، ئارەق و قوماریش ئەگەر سـوود و کەڵکی ڕواڵەتی کەمێکی زۆر کەمی تێدابێ بەڵام گوناح و تاوانەکەی یەکجار زۆرتر و گەورەترە، جا لەبەر ئەوە لێرەدا کۆتایی پێدەهێنین و دەڵێین زیان و خراپە و تاوان و خلیسـکانەکان یەکجار زۆرن ئەوە ئێمە تەنها چەند نمونەیەک بوو هێنامانە بەر چاوتان و خستمانە ڕوو بۆ ئەوەی بەڵگە بەدەستبن سوود و کەڵکی لێ وەربگرن ئەوانەی تا ئێستا نەیانزانیووە بیزانن و لێی بگەڕێنەوە ئەگەر بەشدارن لەو شوێنە گوناح و تاوانانە، وە ئەوانەشـی کەوا زانیبویان جارێکی تر حوجەبێ بەسـەریانەوە ئەگەر بیانووی پێدەهێننەوە

بیانووبڕبن، لە پاشـــان ئێمەش ئومێد دەکەین ئەجر و پاداشـــت لەلای الله تعالی پێ وەربگرین و داوای لێدەکەین لێیانی قبوڵکردبێ و قبوڵی بکات، جا ئەو کە سەش کە عیناد و پێداگر دەبێ لەســـەر خراپە و تاوانێک چەند بەڵگەشـــی بۆ بێنیتەوە چەند زۆربێ یان کەمبێ کار ناکاتە سەری و ئەو بڕیاری خۆی داوە هەر گوناح کاربێ و گوناح بکا و تاوان بکا و پێداگربێ لەسەری.

**تەوەری دووەم؛** ئەو خلیســکان و خراپیانەی کە لە ئەنجامی بەشــداریکردن لە پرۆسەی هەڵبژاردن و ئەندامبوونی پەرلەمان.

ئەو خلیسکان و خراپیانەی کە لێی دەکەوێتەوە یەکجار زۆرن و بەرچاویشن وەکو نموونە لە چەند خاڵێکدا دەیخەینە بەرچاوتان:

**١-خاڵی یەکەم لە خلیسکان و خراپیەکان؛** هاوبەشی و شیرکی لێدەکەوێتەوە، ئەو هاوبەشی و شیرکانەی کە لێی دەکەوێتەوە بۆ نموونە؛ شیرکی یاسا دانان و تەشریع کردنی لێدەکەوێتەوە.

لە ڕوانگەی قورئان و فەرمووده یاســا دانان و تەشریع تەنها و تەنها مافی الله تعالی یە بۆ هیچ کەس و شــتێک و لایەنێک نییە ئەو مافە بەخۆیەوە ڕەوا ببینێت، لە چەندین ئایەت الله تعالی ڕوونی کردوەتەوە کە هەر ئەو حاکم و فەرمانڕەوایە و یا سادانەرە، لە بەڵگەکانی ڕای دووەم باسمان کرد و چەندین ئایەتمان هێنایەوە.

- الله تعالی لە چەند سوڕەتێکدا لە سوڕەتی (الأنعام : ٥٧) و لە سوڕەتی (یوسف : ٤٠) و لە سوڕەتی (یوسف : ٦٧) فەرموویەتی: ﴿**إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ**﴾

واتە: حوکم و فەرمان ڕەوایەتی تەنها و تەنها بۆ الله یە و هی ئەوە.

هیچ کەسێک نابێ بیر لەوە بکاتەوە بەشداربێ لەگەڵ الله تعالی لە یاسا دانان و تەشریع کردن، وە هەر یەکێک یاســـا دابنێت الله تعالی بە هاوبەش بڕیاردەر ناوی بردووە و بە هاوبەش ناوی هێناوە لە قورئانی پیرۆزدا.

- الله تعالی دەفەرمووێ: **﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَـــمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ﴾ (الشورى : ٢١)**

واتە: ئەوان هاوبەشـــانێکیان هەیە کە یاســـایان بۆیان داناوە لە ئاین کە الله ئەو مۆڵەتەی پێیان نەداوە.

لە پاشـــان یەکێکی تر لە شـــیرک و هاوبەشـــیەکان شـــیرکی تاعەتە واتە گوێڕایەڵی کردنی ڕەهایی بۆ خەڵک و کەســـانێک کە حەڵاڵ حەرام بکەن یان حەرام حەڵاڵ بکەن یان بێ شەرعی سەد لە سەد ئەنجام بدەن، یان یا سا ڕێژی بکەن ئەویش حەڵاڵکردنی حەرامە بڕاوەکانە وە حەرامکردنی حەڵاڵە بڕاوەکانە ئەوەشیان دووبارە هاوبەشیی و پەرستراوێتییە جگە لە الله تعالی.

- الله تعالی فەرموویەتی: **﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ (التوبة : ٣١)**

واتە: جولەکەکان زاناکانیان و نەسـڕانیەکانیش دێر نشـین و قەشـەکانیان بە پەرسـتراو لە جگە لە الله یان لەگەڵ الله یان داناون.

ئیبن کەسـیر -رحمە الله- لە تەفسـیری ئەو ئایەتە دەربارەی ئایەتەکە گوتوویەتی: **(أَيْ: حَيْثُ عَدَلْتُمْ عَنْ أَمْرِ اللَّهِ لَكُمْ وَشَرْعِهِ إِلَى قَوْلِ غَيْرِهِ، فَقَدَّمْتُمْ عَلَيْهِ غَيْرَهُ فَهَذَا هُوَ الشِّرْكُ)** واتە: کاتێ لە فەرمان و بەرنامەی الله لاتاندا بۆ قسـەی کەسـێ تر بێجگە لەو، دیارە قسەی غەیرەز ئەوتان پێشخستووە ئا ئەوە خۆی شەریک دانانە بۆ الله.

**٢-خاڵی دووەم لە خلیسـکان و خراپیەکان؛** سـوێند خواردن لەسـەر پاراسـتن و پاپەندبوونی دەستور و یاساکان.

دەسـتورەکان چەندین یاسـای بێشـەرعی و بڕگەی پێچەوانەی شـەرعی الله ی تێدایە و حەڵاڵێک کە الله بڕاندویەتیەوە حەرامی کردووە حەرامێک کە الله بڕاندویەتیەوە حەڵاڵی کردووە، یەکەم هەنگاو بە دڵنیاییەوە لای هەموان ڕوون و ئاشـکرایە کە دەبێ ئە ندام پەرلەمـان بینێـت سـوێنـد خواردنە بە هەڵبژاردنی خۆی و بەبێ هیچ زۆرە ملێیەک و ناچاریکردنێک، کە ئەو سـوێند دەخوات لەسـەر ئەوەی کە ئەو یاسـایە بپارێزێ و پێیوە پاپەندبێت و لەگەڵیدابێ، کە زۆرینەی یاسـاکانیش بێشـەرعین و کوفر و شـیرکیشـن، کە دەڵێن سـوێند دەخۆین لە ڕواڵەتدا کە ئەوە ڕاو بۆچوونی هەندێکیان بوو لەوانەی کەوا

ڕێگا یان داوە بە مەرج بچنە ناو پەڕلەمان ئەوانەی پاشــکۆی ئیســلامییان بەخۆیانەوە لکاندووە کە دەڵێن لە ڕواڵەتدا سوێند وا بخۆ لە ناو دڵیشتدا ئەوە دابنێ کە تەنها یا سا و دەستورێک دەپارێزین و ڕێزی لێدەگرین کە پێچەوانەی شەرعی الله نەبێت.

جا ئەوە چەواشــەکارییە بە دڵنیاییەوە لە ئیســلام جێگای نابێتەوە و پێچەوانەی بەڵگە شەرعیەکان و فتوای زانایانی متمانەیە.

## هەندێک لە بەڵگەکان بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو چەواشــەکاریە کە کراوە و دەکرێت:

- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(يمينك على ما يصدقك عليه صاحبك)**[1]

واتە: سوێندەکەت لە سەر ئەوەیە و لەوەیەوە لێت دەکەوێت کە هاوڕێکەت لە سەریەوە بە ڕاستگۆت دادەنێ و پێت بڕوا دەکات.

یەعنی ئەوەی سوێندت دەدا ئەو مەبە ستە وە ئەو بە چ نیەتێک سوێندت دەدات و ئایە بۆچی سوێندت دەدات.

---

[1] لە سەحیحی موسلیم (ژ: ١٦٥٣) هاتووە.

- نیەتی باش کاری خراپی پێ نابێتە باش ئەوە بنەمایەکی زۆر ڕەچاوکراوە لە شەریعەتی ئیسلامدا، ئەوەی بتپەرستبێت بڵێت نیەتم باشە لە بتپەرستیەکەم وە مەبەستم پێی تەنها الله پەرستییە بە دڵنیاییەوە ئەو قسەی لێ وەرناگیرێ، ئەوەی کەوا زینا دەکات بڵێ مەبەستم دڵ ڕاگرتنی ئافرەتێکە داوای لێکردم ئەگەر پیاوە و ئەگەر ئافرەتیشە بڵێ پیاوەکە بۆ ئەوەی تام و چێژ بکات ئەوەم لە دڵدا بووە مەبەستم پێ گوناحەکە نەبووە گوناح و تاوانەکەی هەر لەسەرە هەر لەسەری حیسابە یان ئەوەی حەرامێک بخوا بڵێ مەبەستم پێ خێر و چاکە بووە لێی وەرناگیرێ یان کار و ئیش لە حەرامێکدا بکات بڵێ مەبەستم پێ ئەوەیە بیرێکی پێ لێدەم بە پارە و پولەکەی ڕاستە دەزانم ئەوە حەرامە نیەتم تێیدا باشە لە کۆتا و ئەنجامەکەی دەمەوێ مزگەوتێکی پێ دروستکەم ئا ئەوانە لێی وەرناگیرێ و قبوڵ نییە لە شەریعەتی ئیسلامدا.

لە پاشان ئەو بابەتە کار و قسە درۆی لێ بەرهەم دێت بە گوێرەی شەرعی و لەناو عورفیشدا قبوڵ کراو نییە بۆ نموونە؛ تۆ بە کەسێک بڵێی ئەو شتەم بە قەرز پێبدە بۆ ماوەی ساڵێک سوێندی بۆ بخۆی و بەڵێنەکەشی پێ بدەی کاتێ کەوا کەسەکە مەوعیدی هات لەماوەی ئەو ساڵەدا داوات لێبکات تۆ بڵێی کاکە من لە نیەتی دڵمدا

مەبەستم پێ پێنج ساڵ بوو مەبەستم پێ ساڵێک نەبوو، ئایە لێت قبوڵ دەکا و خەڵکیش لێت قبوڵ دەکەن؟ ئەو قسە وەرگیراوە؟

نەخێر بە دڵنیاییەوە ڕەتکراوەیە بەسەرتدا، پێت دەگوترێت تۆ بە قسە و ڕواڵەتی خۆت وات گووت خۆ ئێمە دڵی تۆ مان لەت نەکردووە بزانین چی تێدایە نیەتی دڵان ناخوا مادەم قسەیەکەت کرد قسە سەر زارەکیەکەت لێ وەردەگیرێ ئەو سوێند خواردنەش هەر وایە.

- گومڕاکردن و چەواشەکاری لێدەکەوێتەوە بۆ خەڵک و جەماوەر چونکە خەڵکی لە ڕواڵەتەکەیاندا ئەوەی لێ ناخوێننەوە ئەوان ئیشدەکەن بە زاهیر **(نحن نحکم بالظاهر والله يتولى السرائر)** واتە: کار دەکەین بە ڕواڵەتیەوە وە الله تعالى نهێنیەکان دەزانێ چی تێدایە.

کەواتە ئەوە ڕەتکراوەیە و قبوڵ نییە سوێندەکە وەکو ڕواڵەتی لەسەری حیسابە لێی دەکەوێ کە دەڵێ من پارێزگاری دەکەم لەو یاسا حەرام و گوناح و تاوانانە، بۆ نموونە؛ پارێزگاری دەکەم لەوەی کە دز بە پێچەوانەی فەرمانی الله دەستی نەبڕێ و با تەنها زیندانی بکرێت الله دەفەرمووێ دەستی ببڕێ ئەو دەڵێ با دەستی نەبڕێ و تەنها زیندانی بکرێ، زیناکار ئەگەر کچ بوو یان کوڕ بوو با جەڵدەی لێ نەدرێ من پارێزگاری

لەوە دەکەم بە پێچەوانەی فەرمانی الله با تەنها زیندانی بکرێ ئەگەر پێکەوەش ڕازی بوون کەس تەداخولیان نەکات کارێکی ئازادانەی سەربەستیانەی مۆدێلی دیموکراسیەت و عەلمانیەتی سـەردەمە، من پارێزگاری دەکەم لەوەی کەوا حەڵاڵ کردنەکانی الله تعالی مافیان هەبێ کەوا حەرام بکرێ و حەرامە کان حەڵاڵ بکرێ، سـوێندەکە وایە یانی پارێزگار دەبم لەوە و داکۆکی لەسـەر دەکەم پێ دادەگرم لەسـەر ئەو کارە شـیرک و هاوبەشی و کوفر و حەرام و گوناح و تاوانانە.

**٣-خاڵی سـێیەم لە خلیسـکان و خراپیەکان؛** هەموو کار و شـتێک لەوێوە ڕێگا پێدراوە کە بدرێتە دەنگدان تەنانەت ئەو کار و شـتە پیرۆز و بەڕێزیش بێت بەلای هەر ئاین و کەسێکەوە.

کەواتە یەکێک لەو کارە بێشـەرعی و نالە بارانەی کەوا لە پەڕلە ماندا ئەنجام دەدرێت یەکلابوونەوەی کار و شتەکانە بە دەنگدان، ئەو کار و شتانەش چەند پیرۆزیش بن چەند موقەدەسـیش بن چەند ڕێز لێگیراویش بن ئاسـاییە دەدرێتە دەنگدان ئەگەر خەڵکانێک پێیوە هەستان و چەند کەسێک هاتن پڕۆژە یاسایەکیان خستەڕوو با بێشەرعی بێ با گوناح بێ با تاوان بێ لەسـەر ئەوەی حەڵاڵێکی بڕاوە کە الله بڕا ندویەتیەوە حەرام بکرێ یان حەرامێکی بڕاوە کە الله بڕا ندویەتیەوە حەڵاڵ بکرێ یان هەر گو ناح و تاوانێکی تر با

بدرێتە دەنگدان ئاســـاییە و دەبێ ســـەرۆکایەتی پەڕلەمان بیداتە دەنگدان ئەگەر مەرج و

یاساکانی پەڕلەمانی لێ هاتبێتەجێ پڕۆژە یاسایەکە ئەو کاتە دەدرێتە دەنگدان.

کە لە ئیسلامدا قەتاوقەت ئەو شتە قبوڵ نییە و ناکرێ نابێ هەموو شتێک بدرێنە دەنگدان

تەنانەت موجتەهید و کۆشـەشـکاری شـەرعیش بۆی نییە کۆشـەش و ئیجتیهاد بکات لە

هەموو کار و بار و ئیشـــێکدا، بەڵکو مرۆڤ دەبێت لە بیروبڕوا و حەڵاڵ و حەرام و خاڵە

یەکلا کراوەکان تەنها مل بدات و تەســـلیمیان بێت بەبێ ئاو ناو دوو دڵیەوە خۆی بکاتە

بەندەی الله تعالی ئاو نای تێدا نەڵێ و ڕەتیان نەکاتەوە.

ئەگەر بمانەوێ بەڵگە کان بهێنینەوە ئەوە تا الله تعالی لە چە ندین ئایە تدا ئەوە مان بۆ

دەسەلمێنێ کە کەس وە تەنانەت موسڵمان و بڕواداریش بۆی نییە بە هیچ شێوازێک بە پێش

ئایەتەکان و فەرموودەکانی الله و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکەوێ و قسە بکات لەو شتانەی

کە بڕاوەتەوە لەلایەن الله تعالی:

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللهَ إِنَّ اللهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ**﴾ **(الحجرات : ١)**

واتە: ئەی ئەوانەی بڕوا تان هێناوە پێش الله و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) مەکەون بۆ بڕیار و

کارەکانتان لە الله بترسن و بەڕاستی الله بیسەر و زانایە.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ (الأحزاب : ٣٦)

واتە: بۆ بڕواداری نێرینە و مێینە نییە ئەگەر الله و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بڕیارێکیاندا سەر پشکبن لە فەرمانەکانیان (واتە بڵێن وەری دەگرین یان ڕەتی دەکەینەوە) دەبێت مل بدەن و ملکەچ بن و وەری بگرن.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (النور : ٥١)

واتە: قسەی بڕواداران ئەگەر بانگ بکرێن بۆلای الله و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) تاوەکو بڕیار بدەن لە ناویاندا لە ناکۆکیەکانیان تەنها و تەنها دەڵێن بیستمان و گوێڕایەڵیمان کرد (واتە جێبەجێی فەرمانەکانمان کرد) ئائەوانەن سەرفرازبوو کە مل دەدەن بۆ بڕیاری الله تعالی و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و تەسلیمی دەبن.

**٤-خاڵی چوارەم لە خلیسکان و خراپیەکان؛** یەکلاکردنەوەی بڕیارەکان بە زۆرینەیە.

بۆ یەکلا کردنەوەی بڕیارەکان ڕێگای دەنگدان دەگرنەبەر و کە زۆرینە دەنگ دەدا یەکلایی دەکاتەوە، لە کاتی دوو ڕایی و ناکۆکی بۆ یەکلابوونەوەی کار و شت و ناکۆکیەکان بە

دڵنیاییەوە لە پەرلەمان ناگەڕێنەوە بۆلای الله تعالى و پێغەمبەر (ﷺ) بەڵکو دەگەڕێنەوە بۆ دەنگی زۆرینە تاوەکو یەکلایی بکاتەوە ئەوەش پێچەوانەی قورئان و فەرموودەیە.

لە ئیسلامدا ئەگەر ناکۆکی دروست بێت دەبێ موسڵمانەکان بگەڕێنەوە لە ناکۆکیەکەیان بۆلای قورئان و فەرمووده سەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و بەڵگەکان یەکلایان دەکاتەوە نەوەک زۆرینە و کەمینە ئەگەر زۆرینەش لە دژی بوەستێتەوە فەرمانەکانی الله بەدواداچوون و لێپرسینەوەی بۆ نییە، کەس بۆی نییە مل نەدات و ڕەخنەی لێ بگرێ و ڕەتیبکاتەوە:

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿**وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ**﴾ **(الرعد : ٤١)**

واتە: هەر حوکم و بریارێ الله دەیدا هیچ کەسێک دەسەڵات و توانای نییە ڕێگری لێ بکات و ڕەتی بکاتەوە.

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿**لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ**﴾ **(النبياء : ٢٣)**

واتە: پرسیار ناکرێت دەربارەی ئەوەی الله تعالى دەیکات بەڵکو بەدیهێنراوەکان پرسیاریان لێ دەکرێت.

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿**وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ**﴾ **(الأنعام : ١٨) (الأنعام : ٦١)**

واتە: الله زاڵ و بەرزە بەســەر بەندەکانی وە مل و دڵەکان بۆی کەچن و دەســەڵاتداران زەلیلن لە بەرامبەر الله تعالی و هیچیان پێ ناکرێ.

• الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**أَفَغَيْرَ اللهِ أَبْتَغِي حَكَمًا**﴾ **(الأنعام : ١١٤)**

واتە: ئایە جگە لە الله مان بوێت بە حاکم و بڕیاردەر لەنێوان ئێمە و ئێوە ئەی هاوبەش بڕیار دەران.

بە دڵنیاییەوە هەر الله حەکەم و حاکمە و کار و بڕیارەکان بۆ یەکلایی کردنەوە دەبێ بگەڕێنینەوە لای ئەو.

• الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**قُلْ أَغَيْرَ اللهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ**﴾ **(الأنعام : ٦٤)**

واتە: تۆ پێیان بڵێ ئەی محمد (ﷺ) ئایە جگە لە الله بە سـەرخەر و پشـتیوان کارم بگرم داوای سەرخستنی لێبکەم الله بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە ئەوە نان و ڕۆزی دەدات و ڕۆزی پێویست نییە لە هیچ کە سێکەوە کەوا پێی بدرێت و الله تعالی بێنیازە لەو شتانە، وە پێیان بڵێ من فەرمانم پێدراوە یەکەم موسـڵمان و ملکەچ بم بۆ الله تعالی و فەرمانەکانی لە هاوبەش بڕیار دەران نەبم.

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿**وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللهِ ذَلِكُمُ اللهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ**﴾ **(الشورى : ١٠)**

واتە: وە هەرشـتێك كە تێيدا جياواز بوون ئەوە بڕيارەكەی بۆ لای الله دەگەڕێتەوە ئەو الله يە پەروەردگاريی منە تەنها پشتم بەو بەستووە وە هەر بۆ لای ئەويش دەگەڕێمەوە.

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿**فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا**﴾ **(النساء : ٥٩)**

واتە: ئەگەر جياواز بوون لە شـــتێک بيگەڕێننەوە بۆلای الله و قورئانەكەی و پێغەمبەری الله (ﷺ) و فەرموودەكانی ئەگەر ئێوە بڕواتان هێناوە بە الله و ڕۆژيی دوايی ئەوە چاكترە و باشترين ئاكامە.

وە ئەو كارەی ئەوان دەيكەن لە ناو پەڕلەماندا هانا بردنە بۆ طاغوتەكان و تەحاكوم كردنە بۆ لای طاغوت و حوكمە طاغوتيەكان و وەرگرتنی ياسـا و ڕێسـاكانی ئەوانەيە كە جگە لە الله تعالى دايدەنێن، چونكە زۆرينەی دەنگ يەكلايی كردوەتەوە و يەكلايی دەكاتەوە، وە الله تعالى ڕازی نييە يا سا و بڕيارێک جگە لە هی الله تعالى كاری پێ بكرێ ئەوە كوفر و طاغوتييە:

- الله تعالى دەفەرمووێ: ﴿**أَلَـمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا**﴾ **(النساء : ٦٠)**

واتە: ئایە نابینی ئەی محمد (ﷺ) وە تەماشـــای ئەوانە ناکەیت کەوا وا دادەنێن ئەوان بڕوا یان هێناوە بەوەی بۆ تۆ دابەزیوە و ئەوەی لە پێش تۆ دابەزیوە لەگەڵ ئەوەشـــدا دەیانەوێت بڕیارەکان بگەڕێننەوە بۆلای طاغوت فەرمان لەوان وەربگرن لە کاتێکدا ئەوان فەرمانیان پێکراوە کوفر بکەن بە طاغوت وە شـــەیتان دەیەوێت کە گومڕا یان بکات بە گومڕاییی یەکی دوور لە ڕاستیەکان.

کەواتە هەموو شـــتێک دان پێدا هێنانەکەی و یەکلایی کردنەوەکەی لەلای الله تعالى یە و زۆرینە یەکلایی بکاتەوە بە دڵنیاییەوە ئەو کارە کارێکی نەفامیە و الله تعالى پێی ڕازی نییە.

- الله تعالى دەفەرمووێ: ﴿**أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَـنُ مِنَ اللهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ**﴾ **(المائدة : ٥٠)**

واتە: ئایە حوکم و فەرمانی نەفامیان دەوێت کێیە حوکمی لە هی الله باشـــتر و جوانتربێت بۆ کەسانێکی ژیر و دڵنیا.

پێشەوا ئیبن کەسیر -رحمه الله- لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا فەرموویەتی: **(ينكر تعالى على من خرج عن حكم الله المحكم المشـــتمل على كل خير ، الناهي عن كل شر وعدل إلى ما سواه من الآراء والأهواء والا صطلاحات ، التي و ضعها الرجال بلا م ستند من شريعة الله ، كما كان أهل الجاهلية يحكمون به من الضـــلالات والجهالات ، مما يضعونها بآرائهم وأهوائهم ، وكما يحكم به التتار من السيا سات الملكية المأخوذة عن ملكهم جنكزخان الذي وضـــع لهم اليســـاق وهو عبارة عن كتاب مجموع من أحكام قد اقتبســـها عن شرائع شـــتى ، من اليهودية والنصرـانية والملة الإســلامية ، وفيها كثير من الأحكام أخذها من مجرد نظره وهواه ، فـصارت في بنيه شرعامتبعا ، يقدمونها على الحكم بكتاب الله و سنة ر سوله - صلى الله عليه و سلم-، ومن فعل ذلك منهم فهو كافر يجب قتاله ، حتى يرجع إلى حكم الله ورسوله -صلى الله عليه و سلم- فلا يحكم سواه في قليل ولا كثير)** واتە: الله تعالى پێناخۆ شی خۆی دەردەبڕێ دەر بارەی ئەوانەی کە لە فەرمانی پتەوی الله دەردەچن کە پڕە لە هەموو چاکەیەک، و ڕێگرە لە گشـــت خراپەیەک و لا یداوە لە هەموو هەوا و ئارەزوو زاراوەیەک، کەســـانێ داینابێ کە بەڵگەیەکی شـــەرعییان بە دەســـتەوە نەبێ لەلایەن الله وە، وەک چۆن خەڵکی سەردەمی نەفامی فەرمانیان بەو گومڕایی و کارە داوە، و بە هەوا و ئارەزووی خۆیان دایان ناوە، هەروەک چۆن تەتارەکان (واتە مەغۆلەکان) حوکم دەکەن بەو سیاسەتە پاشاییەی کە لەلایەن پا شاکەیان جەنگیزخان بۆیان دانراوە ئەو پیاوەی کە (اليساق) ی بۆیان دانا کەوا

بریتییە لە دەســتورێکی تێکەڵ لە ئەحکامی شریعەتە جیاوازەکان، لە دینی جولەکەکان و گاورەکان و ئیســلام، هەروەها ئەحکامی زۆریشــی تێدایە کەوا جەنگیزخان بە بیروڕا و ئارەزووی خۆی دایناون، بەمەش ئیتر بووەتە شــەریعەتێکی شــوێنکەوتراو، بە جۆرێک کە دەیخەنە پێش شــەریعەتی الله و ســونەتی نێردراوەکەی -صــلی الله علیه وســلم-، هەرکەســێکیش لەوانە (واتە مەغۆلەکان) ئەگەر وایکرد ئەوا کافرە و کوشــتنی واجبە، تاوەکو دەگەڕێتەوە بۆ حوکمەکانی الله و نێردراوەکەی -صلی الله علیه وسلم- چونکە هیچ حوکمێ جگە لە حوکمی الله و نێردراوەکەی -صلی الله علیه وسلم- قبووڵ ناکرێ کەم بێ یان زۆر.

**٥-خاڵی پێنجەم لە خلیســکان و خراپیەکان؛** شــەرعییەتدان بە ئەنجومەنی یاســا دانان و جوان و باش نیشاندانی.

بوونی ئەندامێک کە پاشگری ئیسلامییان پێوە لکاوە بە تایبەت ئەگەر پۆشاکی مەلایەتییان لەبەردابێ واتە عیمامە بەسەربن و مەندیل لەسەربن و جوبە لەبەربن یان لە پێشتردا ناویان لە خۆیان نابێ بانگخواز کە خەڵکیان بە حیســاب بانگ کردووە بەرەو ئیســلام و خەڵکیان هانداوە لەسەر کاری چاکە ئەوە بە دڵنیاییەوە خەڵکی زۆری پێ دەخەڵەتێ و خەڵکەکە وا گومان دەبەن کە ئەو جێگایە جێگایەکی زۆر باش و شــەرعییە و دروســتە بەشــداریکردن

تێیدا، لەگەڵ ئەوەدا ئەوە لە ڕوانگەی ئیسـلامەوە خاڵێکی خەتەرناکە بەشـداریکردن لە شوێنە خراپە بێشەرعیەکاندا کە بە بەرچاوی خەڵکیەوە جوان بکرێت تاوانێکی گەورەیە و لە ئیسلامدا جێی نابێتەوە.

ئیبن جەوزی بەغدادی -رحمە اللە- لە پەرتووکە نایابەکەی فەرموویەتی: **(ومن تلبيس إبليس على الفقهاء مخالطتهم الأمراءَ والسـلاطين، و مداهنتهم، وتركُ الإنكار عليهم مع القدرة على ذلك، وربما رخصـوا لهم فيما لا رخصـة لهم فيه، لينالوا من دنياهم عرضا، فيقع بذلك الفساد لثلاثة أوجه:**

**الأول: الأمير، يقول: لولا أني على صـواب لأنكر علي الفقيه، وكيف لا أكون مصـيبا وهو يأكل من مالي؟!**

**والثاني: العامي، فإنه يقول: لا بأس بهذا الأمير ولا بماله ولا بأفعاله، فإن فلانا الفقيه لا يبرح عنده.**

**والثالث: الفقيه، فإنه يفسد دينه بذلك!)** [١]

واتە: لە سەرلێشێواندنەکانی ئیبلیس بەرامبەر بە شەرعزانان: تێکەڵ بە ئەمیر و سوڵتانەکان دەبن، وە موداهەنە کردنیانە (واتە لە ئاین دادەبەزن لەبەر هەندێک لە دونیای خۆیان و لەگەڵیاندا دەبیندرێن و دادەنیشـێن و بەشـدار دەبن)، واز لە نکۆڵیی و قەدەغەکردنیان

[١] لە -تلبيس إبليس- لە داری ئیبن جەوزی چاپکراوە (ل: ١٤٨-١٤٩).

دێنن هەرچەند توانای ئەوەشـیان تێدایە، لەوانەشـە ڕێدانی شـیاوێتی بە ئەنجام گەیاندنی هە ندێ کار یان بۆ بکەن کە لە بنچینەدا ڕێیان پێنەدرابێت بیکەن، بۆ ئەوەی لە دونیادا شتکێیان دەستکەوێت بەوەش لە سێ ڕۆوە خراپە دروست دەبێت:

یەکەم: ئەمیرەکە، دەڵێت: ئەگەر من لەسەر ڕاست نەبم و باش نەبم ئەی بۆچی ئەو شەرع زانە ئەو مەلایە، ڕێگریم لێ ناکا بەرهەڵسـتیم ناکا بەڵێ من پێکاومە ئەگەر وا نەبم ئەی چۆن ماڵ و سامانی من دەخوا؟!

دووەم: کەسـی ئاسـایی، دەڵێت: ئەم ئەمیرە و، ماڵەکەی و، کردەوەکانی چاکن و هیچیان تێدا نییە، چونکە فڵانی شەرعزان بەجێی ناهێڵێت و بەردەوام لەگەڵیدایە.

سێیەم: شەرعزان، بەوە ئاینەکەی خۆی تێک دەدات!

ئەوە ئیبن جەوزی مەبەسـتی پێی هی سـەردەمی خۆیان بووە ئەو دەسـەڵاتدارانەی کەوا موسـڵمان بوونە و حوکمیان بە شـەریعەتی ئیسـلام کردووە بەس ستەم و گوناحیان هەبووە نەک هی سـەردەمانێکی سیسـتەمی عەلمانیەت و دیموکراسـی کە حوکم بکەن بە جگە لە شەریعەتی ئیسلام و طاغوت بن.

- پێغەمبەری پێ شەوا (ﷺ) فەرموویەتی: **(من لزم ال سلطان افتتن زاد وما ازداد عبد من السلطان دنوا إلا ازداد من الله بعدا)**[1]

واتە: هەریەک بێتە دەرگای دەسەڵاتداران تاقی دەکرێتەوە، ئەوەی کەوا نزیک بێتەوە لە دەسەڵاتدار بە دڵنیاییەوە لە الله دوور دەکەوێتەوە.

زانایان فەرموویانە لەبەر ئەوەیە لە الله دوور دەکەوێتەوە ئەگەر بە گوێرەی ویست و مەبەستی دەسەڵاتدارەکە کەسە شەرعزانەکە یان مەلایەکە لەگەڵ ئەو تێکی کردەوە و قسەکەی بە دڵی ئەو کرد ئەوە بە دڵنیاییەوە دینەکەی خۆی خستوەتە مەترسیداری و مەترسیدار دەبێ دین و دینداریەکەی وە پرسیاری دەکەوێتە سەر و لەسەری قەرزار دەبێتەوە، جا ئەگەر پێچەوانەی دەسەڵاتدارەکەش بکات ئەوە گیانی خۆی خستوەتە مەترسی و خەتەریات لەو نزیکییەی کە پێچەوانەی ئەو دەکات کەواتە تووشی بەڵا و تاقیکردنەوە دەبێ[2].

وەرن با ئاگاداری خۆمان بین دینە جوانەکەی خۆمان نەفرۆشین ڕووبکەینەوە الله تعالی بۆچی لە الله دوور بکەوینەوە بە نزیک بوونەوەمان لە کەسانێکی گوناحکاری بێشەرعی

---

[1] لە سونەنی ئەبو داود (ژ: ٢٨٥٩-٢٨٦٠) هاتووە، وە لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەدیش (ژ: ٩٦٨٣) هاتووە.

[2] لە -عون المعبود شرح سنن أبي داود- هاتووە و زانایان لەوێدا بەو شێوەیە ڕاڤەی ئەو فەرموودەیان کردووە و ئەو قسەیان لێکردووە.

کاری کافری موشریکی مونافیقی دوو ڕووی دژ بە الله و بە پێغەمبەر (ﷺ) دین لە دەست بدەین.

بەڵێ ئەوانەی کە ئاوا پاشگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە یان مەندیل بەسەری جوبە لەبەرن یان پێشتر ناویان لە خۆیان نابوو بانگەواز کار یان بانگەواز کاریش بوونە هەندێک جار دواتر لا ڕێ بوونە و بەشداری ئەو بابەتە سیاسەتە سەردەمیانەیان کردووە ئەوە بە دڵنیاییەوە بە چوونیان بۆ ئەوێ و بەشداریکردنیان و پێداهەڵدانیان و هاتوچۆکردنیان و دانیشتن لەگەڵیان دەبنە بۆیەی جوانکاری بۆ دەسەڵاتداران و دەزگاکانیان وە دەبنە بەهاراتی تام و بۆن خۆ شکردنی ڕواڵەتی کوفر و شیرک و بێشەرعی و هاوبە شیەکانیان و دوو ڕوایەتیەکانیان و کارە خراپ و قێزەونەکانیان.

- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(ليأتين عليكم أمراء يقربون شرار الناس ، ويؤخرون الصلاة عن مواقيتها، فمن أدرك ذلك منكم فلا يكونن لهم عريفا ولا شرطيا ولا جابيا ولا خازنا )**[(١)]

---

[(١)] لە موسنەدی ئەبی یەعلا (ژ: ١٠٧٧) هاتووە، وە ئیبن حیبانیش لە سەحیحەکە بە سەنەدی ئەبی یەعلا (ژ: ٤٦٦٩) هێناویێتی، وە پێشەوا هەیسەمی لە -مجمع الزوائد- (٥/ ٢٤٠) گوتوویەتی ئەو فەرموودەیە پیاوەکانی سەنەدەکەی پیاوی سەحیحن واتە (رجاله رجال الصحيح) تەنها (عبد الرحمن بن مسعود) نەبێ ئەویشیان بە سیقە و متهانەیە کەواتە فەرموودەکە سەنەدی سەحیحە و وەرگیراوە.

واتە: کاتێک دادێ ســـەرکردانێکتان دەبن خراپەکان لە خۆیان نزیک دەکەنەوە، خەڵکە خراپەکە دەکەنە دەورووبەر و دار و دەســـتەی خۆیان، وە نوێژەکانیش لە کاتی خۆیدا دوا دەخەن (نەک نایانکەن و قەدەغەی لێدەکەن و لەگەڵیدانین و کافرن)، جا هەر کە سێکتان گەیشت بەو ڕۆژە لە دە سەڵاتی ئەو سەرکردەیەوە با نەبێتە عەریف (عەریف بەو کە سانە دەگووترێ لە زمانی عەرەبیدا کە کۆمەڵە کە سێکی لەبەر دە ستبێ و ئەو بەرپرسیانبێ)، وە با نەبێتە شـــورتە (واتە پۆلیس)، وە با نەبێتە جابی (واتە کۆکەرەوەی پارەو پول بۆی و لەو بوارەدا ئیش بکات)، وە نەبێتە خازین (واتە هەڵگری غەزنەداری پارە و پولی ئەو بابەتە سەرکردانە و تەنها بەکاری بێنێ بە فەرمان و ڕێگا پێدانی ئەوان و لە بەرژەوەندی ئەوان).

پێغەمبەر بۆ سەردەمانێک وای گوتووە کە دە سەڵاتدارانی مو سڵمانان ستەم دەکەن گوناح دەکەن بۆخۆیان پابەند نابن بە هەموو خاڵەکانی شـەریعەتی ئیسـلام بەڵام حوکمی ئیسـلام جێبەجێ دەکەن جەنگ و جیهاد لە پێناو الله دەکەن ئا ئەو نەوعە سەرکردانەیە، جا ئەگەر ئەوە قبوڵ نەبووبێ و نەهی و قەدەغەی لێکرابێ بۆ ســـەرکردە و دەســـەڵاتێک کە حوکم بکات بە ئیســـلام و قورئان و تەنها ســـتەم و گوناحی هەبێ و خەڵکی خراپە کار لە دەورووبەری بێت، ئەی دەبێ چی بگووترێت بەو کەســـانەی کە بەشـــداری دەکەن لە پرۆسەیەکی وا بێشەرعی جگە لە ئیسلام لە عەلمانیەت و دیموکراسیەت کە سەری هەڵداوە

و هەڵقولاوە وە کەسەکانیش هەموویان بۆ خۆیان و دەوروبەریشیان لە کەسە زۆر خراپە گەندەڵکارە بێدینە بێشــەرعیەکانن کە دژن بە الله و بە پێغەمبەر (ﷺ) و بە شــەریعەتی ئیسلام.

**٦-خاڵی شــەشــەم لە خلیســکان و خراپیەکان؛** دۆســتایەتی و ســەرخســتن بۆ دەسەڵاتدارانی بێ بڕوا و ڕێز لێگرتنیانی لێدەکەوێتەوە.

لە ئیسلامدا خۆشویستن و ڕق لێبونەوە سەنگی مەحەکی بیروبڕوان، بە دڵنیاییەوە موسڵمان لە دوو ڕوو کافران لێک جیا دەکاتەوە.

## دۆســتایەتی و دوژمنایەتی بەلای هەندێک لەزانایانی ئەهلی ســوننە و جەماعەوە دوو جۆرە:

١-موالاتی سوغرا (واتە خۆشویستن و دۆستایەتی بچووک).

٢-موالاتی کوبرا (واتە خۆشویستن و دۆستایەتی گەورە).

**١-موالاتی سوغرا:** بریتییە لە ڕێز لێگرتن و ڕوو گەشی و قسە خۆشی و زەردەخەنە بە ڕووی کافرانەوە و ســەلام لێکردنیان خاوەنەکەی لە ئیســلام ناچێتە دەر بەڵام لە گوناحە مەزن و گەورەکان لە قەڵەم دەدرێ مەگەر لە پێناو دەعوە و بانگەوازی بێ بیکەی گوناح و

تاوان نییە یان زۆر لە خۆت بترسێی لە زمان و دەستی ئەو کەسە گومانی زاڵ ئەوەبێ تۆ لەناو ببرێی یان ئەمنیەتت بکەوێتە ترسناکی لەو حاڵەتەش بۆ خۆ قوتار کردن ئەگەر کردت ڕووخسەت و ڕێگا پێدراوی هەیە لە شەریعەتی ئیسلام وە ئەگەر پێشت داگرت و ئەو ڕێزەت لێ نەگرت و سەلامت لێ نەکرد لەسەری هەرچیت بەسەرهات عەزیمەتت نواندوە و ئەجر و پادا شتی زۆرت دەست دەکەوێ ئەگەر ئیخلاص و یەکلابونەوەت بۆ الله هەبێ، وە خۆشویستن و دۆستایەتی بچووک لەبەر ئەوە نییە گوناح و تاوانەکەی بچووک بێ ناوی لێنرابێ بچووک، بەس بۆ ئەوەیە جیا بکرێتەوە لەگەڵ هی گەورە لەبەر ئەوەیە ناوی لێنراوە، وەکو (الشرک الأصغر و الشرک الأکبر) کە موالاتی سوغراش زانایان فەرموویانە لە گوناح و تاوانە هەرە گەورەکانە وەکو شیرکی بچوک بەڵام کەسەکە پێی لە ئیسلام ناچێتە دەر.

**٢-موالاتی کوبرا:** تەوەلییە واتە کەسەکە پێی لە ئیسلام دەچێتە دەر و فڕی بەسەر ئیسلامەوە نامێنێت ئەوەی لێی بێتەجێ، لە ئیسلام دەتباتە دەر چ بە دڵ کافرەکانت خۆشبوێ چ سەریان بخەی بەسەر موسڵمانانەوە بە دڵنیاییەوە ئەوانە لە ئیسلام دەرچوونە.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ**

**فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُــوا عَنْهُ أُولَئِكَ حِزْبُ اللهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللهِ هُمُ الْـمُفْلِحُونَ﴾ (المجادلة : ٢٢)**

واتە: کەســانێک نییە و نابیندرێن کە بڕوایان هێنابێ بە الله و بە دواڕۆژ خۆشــەویســتی و دۆســــتایەتی ئەو کەس و لایەنانە بکەن کە دژایەتی الله و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکات ئەگەر باوک و باپیریشـــیان بن ئەو کەس و لایەنانە یان کوڕ و کوڕەزایەکانیشـــیان بن یان برایەکانیان بن یان هۆزەکانیان بن ئەو بڕوادارانەی ئاوا دۆســتایەتی ئەو کەســانە ناکەن و بەڕائیان لێدەکەن لە دڵەکانیانەوە بڕوا جێگیر کراوە لەلای الله تعالی وە بە بەڵگەی ڕوون و ئا شکرا لەلای الله وە پشتگیری لێکراون وە دەخرێنە ناو بەهە شتانێک کە لە ژێریانەوە ڕووبارەکان دەڕۆن تیایاندا هەمیشــەیی دەبن الله لێیان ڕازی بووە و ئەوانیش لە الله تعالی ڕازی بوون ئەوانەن کۆمەڵی الله ئاگاداربن بەڕاستی کۆمەڵی الله ئەوانن سەرفراز.

- الله تعالی فەرموویەتی: **﴿وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾ (المائدة : ٥١)**

واتە: ئەوەی لە ئێوە ئەوانی خۆش بوێت یان سەریان بخات و وەلائی بۆیان هەبێ بەڕاستی لەوانە (واتە وەک ئەوان کافر دەبێ).

- الله تعالی فەرموویەتی: **﴿وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ (المائدة : ٨١)**

واتە: ئەگەر ئەوان بڕوایان هێنابا بە الله و بە پێغەمبەری الله (ﷺ) بەوەی دابەزیوە بۆی

کە قورئانی پیرۆزە ئەوە کافرەکانیان بە دۆست نەدەگرت.

واتە مادەم کافرانیان بە دۆست گرتووە دیارە بڕوایان نەبووە بە الله و بە پێغەمبەر (ﷺ) و

بە قورئانی پیرۆز.

- پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: **(إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِلمُنَافِقِ: يَا سَيِّدُ، فَقَدْ أَغْضَبَ رَبَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى)**[١]

واتە: ئەگەر پیاوێک بە دووڕوویەک بڵێت: گەورەم، بێگومان پەروەردگاری بەرزی خۆی

توڕە کردووە.

- لە فەرموودەیەکی تر فەرموویەتی: **(لا تقولوا للمنافق سـيد فإنه إن يكُ سـيدًا فقد أسخطتم ربّكم)**[٢]

واتە: بە مونافق و دووڕووەکان مەڵێن گەورەم ئەگەر گەورەشبێ تۆ پێی مەڵێ گەورەم چونکە

ئەو کاتە پەروەردگارەکەت توڕە کردووە.

[١] حاكم (ژ: ٧٨٦٥) هێناویەتی، وە بەیهەقیش لە -شعب الإيمان- (ژ: ٥٢٢٠) هێناویەتی.

[٢] لە سونەنی ئەبو داود (ژ: ٤٧٧٧) بە سەحیحی هاتووە، لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەدیش (ژ: ٢٢٩٣٩) هاتووە.

جا ئەگەر سەرنج بدەین بەهۆی بەشداریکردن لە پرۆسەی هەڵبژاردن ئەو کەس و لایەنانە و ئەندامەکانی کە پا شگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە یان مەلا و بانگخواز بوون لە پێشتردا دەبێ بەڕێزبن لەگەڵ ئەندامەکانی تر و شادی و دڵخۆشییان لەگەڵ دڵخۆشیەکانیان دەرببڕن و دووژمن کارییان نەکەن و بە دۆست و هاوڕێی خۆیانیان بزانن ئەگەر ڕای پێچەوانەشیان هەبێ و ئەگەر ئەندامەکە لەوێ بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کوفر و شیرکیش ئەنجام بدات و دژایەتی الله و پێغەمبەرکەشی (ﷺ) بکات بە دڵنیاییەوە ئەو کەسانەی لەوێدا بەشداری دەکەن دەبێ بەو کەسە کافر و موشریکانە بڵێن گەورەم و فلان و پێشیاندا هەڵبڵێن و ڕێزیان لێ بنێن، کە ئەوانە هەموویان دەبنە ئەو ڕێگایە مەترسیدارانەی لە غەزەبی الله تعالی یان تووش دەکات و جائیز و دروست نییە لە شەریعەتی ئیسلامدا بە دوژمنانی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بگووترێت گەورە و ڕێزیان لێ بگیرێ و پشتگیری لێ بکرێن مەگەر بۆ دەعوە و بانگەوازی ئەو قسە و گووتن و هەڵسوکەوتانەیان لەگەڵدا بکرێت لە پێناو الله تعالی کە ئەویش سنوری خۆی هەیە.

جا کەوابێ بەو بەڵگانەی خستمانە ڕوو ئەو کارە ناشیاو و بێشەرعییەی تێدا دەکرێ هەم خۆشەویستی بۆ دوژمنانی ئیسلام و بۆ شوێنەکە و هەم بەڕائیش لە موسڵمانان چونکە لەوێوە بە دڵنیاییەوە داوات لێدەکرێ تۆ بەڕائەتیش بکەی لە موسڵمانە پابەندە ڕاستەقینەکان

مادەم پەڕلەمان یان یاســای عەلمانیەت یان دیموکراســی لێی ڕازی نییە ئەگەر ئەو کەســە کە سی خواییش بێ پاپەندبێ سەد لە سەد بە قورئان و بە سوننەش دەبێ پشتی تێبکەی! بەڕائەتی لێبکەی! هەتاوەکو پاپەندبی بەیاسا شیرکی و کوفری و بێشەرعییەکانی پەڕلەمان و ئەندامەکانیان و سیستەمی عەلمانیەت و دیموکراسی.

**٧-خاڵی حەوتەم لە خلیسکان و خراپیەکان؛** بەشداریکردنە لە کۆڕ و ئەنجومەنێک کە گاڵتە و گەمە زۆرجار بە الله و بە پێغەمبەر (ﷺ) و بە ڕێبازەکەیان لە پەڕلەمان ندا دەکرێت و ڕێزلێنان و بە گەورە دانانی دووڕو کافرانی پێوە دەستەبەر دەبێت.

ئامادەبوونی هەر کۆڕ و کوبونەوەیەک لە ئیســلامدا کە تیایدا بێڕێزی بەرامبەر بە الله یان پێغەمبەری الله (ﷺ) یان ئاینی ئیسلام بکرێت بەبێ بەرهەڵستیکردنی تەواوی شەرعی بەو ڕێگا و پلانەی کە لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) وەرگیراوە **(من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان)** ئینجا یان دەرچوون و جێهێشتنیان و واز لێهێنانیان ئەگەر هیچت لەگەڵیان پێ نەکرا بە دڵنیاییەوە ترسناکە و کەسەکە کافر دەکات.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ إِنَّ اللهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾ (النساء : ١٤٠)

واتە: بێگومان الله لە قورئاندا بەسەرتانەوە دایبەزاندوە ئەگەر بیستتان لە کۆڕ و دانیشتنێک کوفر بە ئایەتەکانی الله و گەمەیان پێ دەکرێت دامەنیشن لەگەڵیان تاوەکو نەچنە ناو قسە و باسێکی تری جگە لە کوفر و گەمەکردن بە قورئان ئەگەر لەگەڵیان مانەوە لە کاتی کوفر و گەمە کردنەکەیان کەواتە ئێوەش وەکو ئەوانن بەڕاستی الله کۆکەرەوەی دووڕووەکان و کافرەکانە هەموویان بۆ ناو دۆزەخ.

جا لەو کۆڕ و کۆبونەوانەی کە هاوبەشی و کوفری تێدا دەکرێت و گاڵتە بە ئاینی ئیسلام و قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکرێت دەبێ بڕوادار بە دەست بیگۆڕێت ئەگەر بۆی نەکرا بە زمان بیگۆڕێت ئەگەر بۆی نەکرا بە تورەیی هەڵسێ و بڕوات و پشتیان تێبکات و کۆڕ و کۆبونەوە و شوێنەکە بەجێ بێڵێت ئەگەر وا نەکات و گوێیان بۆ بگرێت وەکو ئەوان کافر دەبێت، دیارە ڕازییە بە کوفر و گاڵتە کردنەکەیان.

جا پەڕلەمان بوونی وجودەکەی دژایەتی و بێڕێزییە بەرامبەر بە الله و بە قورئان و فەرموودە و ڕەتکردنەوەیانە، کار و باسەکان کە لە ناویدا باس دەکرێت زۆرجار کوفر و گاڵتە کردنە

بە ئاینی ئیسلام سەرەڕای بوون و وجودەکەی خۆیشی کە بێشەرعی و پێچەوانەی ئیسلامە، جا ئەندام پەڕلەمان بە سنوورداری لە چوارچێوەی یاسا و پەڕلەمان دەبێ شەرمنانە دەستی بەرز کاتەوە ئەگەر ڕێگای پێدرا لە ماوەیەکی کەم و کورتی دیاریکراو ڕەخنە و قسەکانی بکات و لە کۆتاییەکەشدا هەر هاوڕێ و دۆستی ئەندامەکانی کوفریکاربن کە کوفرەکەیان کردووە و دژایەتی الله و پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن، جا ئەوانەی بەرامبەریشیان هەر بۆیان هەیە کوفر و شیرکەکەیان بڵێنەوە و وەڵام و ڕەدیان بدەنەوە.

ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز -رحمهم الله- فەرموویانە: ﴿**إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ**﴾ ئەوەی لە کۆڕ و شوێنی ئەوانبێت بەبێ ئەوەی نا چار کرابێت و ئیکراهی لەسەربێت بە مەرجە شەرعییەکانی ئیکراه لەو کاتەدا کوفر و بێڕێزی کرا بە الله و بە پێغەمبەر (ﷺ) و بە ئاینی ئیسلام بەرهەڵستی بەدە ست ئەگەر نەیتوانی بە زمان نەیکرد و نەڕۆیشت لەوێ و جێشی نەهێشت و بڵێ بەس بە دڵ پێم ناخۆشە لێی قبوڵ نییە و وەرگیراو نابێت و کافر دەبێت[1].

---

[1] بە نموونە؛ بڕوانە تەفسیری قوڕتوبی (٥/ ٤١٨)، ئیبن جەریری تەبەری (٤/ ٣٣٠)، فەتحول قەدیری شەوکانی (١/ ٥٢٧)، ئەوەت بۆ دەردەکەوێت.

ئەگەر سەرنجی یەکێک لە سەر گوزشتەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەکانیشی بدەین ئەوەمان چاک بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەو عوزر و بیانوانە لێیان قبوڵ نابێ کاتێ کەسێک لەو شوێن و جێگایانە دەمێنێتەوە.

لە سەرگوزشتەکەی خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) لەگەڵ مەجاعەی یەمەنی لەکاتی چوونی بۆ یەمامە تاوەکو جەنگی موسەیلەمەی کەزاب بکات و هی هەڵگەڕاوەکان بکات خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) هەندێک خەڵکی لە پێش خۆیدا ڕەوانە کرد کە خەڵکانێکی بۆ بگرن مەجاعەش یەکێک بوو لە سەرکردەکانی بەنو حەنیفە و لە یەمەن گیرا بە دەستی هاوەڵ و سەحابیەکان و هێنایان بۆلای خالیدی کوڕی وەلید، مەجاعە لەو هێنانەیدا گووتی: ئەی خالید تۆ زانیوتە کە من کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیاندابوو هاتمە لای و موسڵمان بووم بەیعەتم پێیداوە ئەمڕۆ من لەسەر ئەوەمە کە دوێنێ لەسەری بووم واتە هەر موسڵمانم!

ئەگەر ئەمڕۆ تەماشایشم دەکەی و گیراوم بە دەستی تۆ لە کاتێکدا کەسێک لەناو ئێمە کوفر و شیرکی کردووە ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿**وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ**﴾ **(فاطر : ١٨)** واتە: هیچ کەس گوناحی هیچ کەسێک هەڵ ناگرێت.

خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) ڕووی تێکرد و فەرمووی ئەوەی دوێنێ لەســەری بوویت ئەمڕۆ وازت لێیهێناوە (لە موســڵمانیەتیەکەت)، ڕازی بوونت بە کار و قســەی ئەو درۆزنە (کە مەبەستی پێی موسەیلەمەی کەزاب بوو) بێدەنگیت لێی کە تۆ بە دەسەڵاتترینی خەڵکی یەمامەی هاتنی منت پێ گەیشــت ئەی نەدەبا بیانووت نەبا و قســەت کردبا؟ وەکو ئەوانەی قسەیان کرد و ڕوبەڕووی بوونەوە وەکو؛ (ثمامة بن أثال و ابن عمر اليشكري) کە ڕوبەرووی بوونەوە و هاتن بۆلای من لەلای من جێگایان بوەوە، ئەگەر بڵێی لە خەڵک و گەلەکەم دەترســام لێم هەڵبســتنەوە ئەی مەجاعە، دەبوایە نوێنەرێکت بۆ ڕەوانە کردبام تا پاڵپشتیم بۆ بناردبای.

واتە خالید لێی توڕەبوو لە قســەکەی ڕازی نەبوو کە مەجاعە ماوەتەوە لەســەردەمی موســەیلەمەی کەزاب و دەڵێ من هەر وەکو دوێنێ بە موســڵمانیش ماومەتەوە و هیچ ئینکاری و ڕێگرییەکیشــی نەکردووە لە قســەکانی موســەیلەمەی کەزاب، دەردەکەوێت کە خالیدی کوڕی وەلید بە بیانووەکانی مەجاعە ڕازی نەبووە و بە بیانووی دانەناوە چونکە لەلای موسەیلەمەی کەزاب ماوەتەوە و بێدەنگ بووە لێی.

ئەوە لە قســەی مەجاعە دەردەکەوێت کە گووتی ئەی کوڕی موغیرە (واتە ئەی خالیدی کوڕی وەلید) ناکرێ لەوانە هەمووی ببور یت، خالیدی کوڕی وەلیدیش فەرمووی لە

خوێنت خۆش بووم (واتە نەم کوشــتی)، بەڵام لە دڵم شــتێک هەیە لە وازهێنانم کە نەم کوشتی (واتە موڕتاح نیم بە نەکوشتنت).

یەعنی دیارە پێی خۆشــبووە بیکووشــتبا چونکە ماوەتەوە لەلای موســەیلەمەی کەزاب و ڕێگری و بەرهەڵستی نەکردووە، کە موسەیلەمە دەیگووت نعوذ بالله من پێغەمبەرم[1].

**٨-خاڵی هەشــتەم لە خلیســکان و خراپیەکان؛** تەواو ڕەشــکردنەوەی جەنگ و جیهاد و خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ و جیهاد (واتە ئیعداد کردن).

وەکو دەڵێن دیموکراســی بریتییە لەوەی کە دەســتا و دەســتی دەســەڵات بکرێت لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە و بردنەوەی زۆرینەی دەنگە کان یان هاوپەیمانێتی لەگەڵ لایەنە کانی تری براوە تاوەکو زۆرینە پێک بهێنن و حکومەتی پێ ڕابگەیەنن ئازادی بیروڕاش یەکێکی ترە لە دروشمەکانی دیموکراسیەت.

نابێ هیچ کەس و لایەنێک هەبێت خۆی ئامادە بکات بۆ جە نگ و جیهاد، ئەوە باوی نامێنێ و حکومەت ســەربازی دەبێت و ســەربازەکانیشــی لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاڵای عەلمانیەت و دیموکرا سیەت و پارا ستنی سیستەمەکەیان و پەڕلەمان و خاک و وڵات و...

[1] لە -مختصر سرة و الرسول- شێخ محمدی کوڕی عبد الوهاب (ل: ٢٥٥) هاتووە، کە ئێمە کورت و پوخت و گوشراوەکەمان هێناوەتەوە.

دەجەنگن و شەڕ دەکەن ئەو دەپارێزن نەوەک لە پێناو بەرزکردنەوەی وشەی (لا إله إلا الله)، لەگەڵ ئەوەدا خۆ ئامادەکردن (ئیعداد) بە هەردوو بەشەکەیەوە مەعنەوی و مادی پێویستییەکی شەرعییە کۆ دەنگی زانایانی لەسەرە و بەردەوامە جەنگ و جیهادیش لەپێناو الله تعالى واجبێکی کیفائی[١]یە بە بەردەوامی، هەندێک جاریش دەبێتە واجبی عەینی[٢].

جا ئەو کەسەی جەنگ و جیهاد نەکات و لەسەری بێ یان ئیعداد و خۆ ئامادەکردن نەکات بۆ جەنگ و جیهاد گوناحبار دەبێ.

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾ (الأنفال : ٦٠)

واتە: ئامادەی بکەن بۆیان ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز وە لە ئەسپی دابەسترا و دووژمنانی الله و خۆتانی پێ بترسێنن.

---

[١] کیفائی ئەوەیە کە بەس بن و بایی ئەوەندە ببن جەنگاوەر و موجاهیدەکان کە ئەرکی شەڕەکە بگرنە ئەستۆ بەرامبەر بە دووژمنان، ئەگەر ئەوەندە نەبوون ئەو کاتە هەتا ئەوەندە دەبن لەسەر موسڵمانانە بەگەڵیان کەون لە پاشان گوناح لەسەر هەمووان لا دەچێ.

[٢] ئەو کاتەی جەنگ و جیهاد دەبێتە فەرزی عەین تاک تاکی موسڵمانەکان هەر هەموو بەردەوام لەسەریان دەبێ، لە باسی جەنگ و جیهاد ئەم خاڵە ڕوونکراوەتەوە و لە پەرتووکە شەرعی و فقهیەکان بڕاندراوەتەوە.

پێغەمبەریش (ﷺ) ڕاڤە و تەفسیری ﴿**قُوَّةٍ**﴾ کەی کرد کە لەو ئایەتەدا هاتبوو دەفەرمووێ: **(ألا إنَّ القوَّةَ الرَّميُ ألا إنَّ القوَّةَ الرَّميُ ألا إنَّ القوَّةَ الرَّميُ)**[1] سێجار فەرمووی ئاگاداربنەوە تیر هاوێژییە سێجاران ئەوەی دووبارە کردەوە، واتە لەو ئایەتەدا مەبەست پێی تیر هاوێژییە نەک هێزی مەعنەوی و هێزەکانی تری نوسین و بابەت و شتەکانی تر.

وە الله تعالی یش سەبارەت بە کوشتارکردن لەپێناو الله تعالی بڕاندویەتیەوە لە قورئانی پیرۆز:

- الله تعالی دەفەرمووێ: ﴿**كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ**﴾ **(البقرة : ٢١٦)**

واتە: ئەی بڕواداران کوشتارتان لەسەر نوسراوە (واتە پێویست کراوە).

زانایانی (أصول الفقه) دەفەرموون ﴿**كُتِبَ**﴾ لە قورئانی پیرۆزدا زۆربەی جاران بە مەعنای (فرض) دێ واتە فەرز کراوە لەسەرتان، هەرچەندە بە سروشتیش پێتان بارگرانییێ و پێتان ناخۆشبێ.

جا ئەو کەس و لایەنانەی پشت لە جەنگ و جیهاد دەکەن و وازی لێدێنن الله تعالی و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هەڕەشەیان لێدەکەن.

---

[1] لە سەحیحی موسلیم (ژ: ١٩١٧) هاتووە.

- الله تعالى فەرموویەتی: ﴿ **قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللهُ بِأَمْرِهِ وَاللهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾ (التوبة : ٢٤)**

واتە: پێیان بڵێ ئەی محمد (ﷺ) ئەگەر باوک و باپیرەتان یان کوڕ و نەوەکانتان یان براکانتان وە هاوسەرانتان هۆزەکانتان وە ئەو پارەی بە دەستتان هێناوە (کۆتان کردوەتەوە) ئەو بازرگانییەی لێی دەترسن زیانی لێبکەوێ (واتە دڵتان پێوەیە) وە ئەو خانوبەرەی لێی ڕازین خۆشەویستر و باشتربێت بەلاتانەوە لە الله و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و جەنگ و جیهاد و کوشتار لە پێناو الله تعالى ئەوە چاوەڕوانبن تاوەکو الله فەرمان و عەزابی خۆی دێنێت الله ڕێنموویی کەسانی لە فەرمان دەرچوو ناکات.

- پێغەمبەری پێشەواش (ﷺ) فەرموویەتی: **(إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ ، وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ ، وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ ، وَتَرَكْتُمْ الْجِهَادَ، سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ ذُلًّا لَا يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ)**[1]

---

[1] فەرموودەکە سەحیحە و لە سونەنی ئەبو داود (ژ: ٣٤٦٢) هاتووە.

واتە: ئەگەر کڕین و فرۆشـــتنتان کرد بە عینە[1]، وە دەســـتتان گرت بە کلکی چێڵ و مانگا، ڕازی بوون بە چاندن و زەڕاعەت، وازتان هێنا لە جەنگ و جیهاد، الله زەلیلی و ژێر دەستەییەکتان بەسەردا زاڵ دەکات لەسەرتان لا نادات تاوەکو نەگەڕێنەوە بۆ ئاینەکەتان.

زانایان دەفەرموون مەبەســـت لێرە ئاینەکە ئەو بەشـــەیە کە جەنگ و جیهادە، واتە تا نەگەڕێنەوە سەر جەنگ و جیهاد و کوشتار نەکەن لەو زەلیلییە ڕزگارتان نابێ.

ئەوە ئەگەر تەنها دونیا و کەسابەت کردن سەرقاڵت بکات لە جەنگ و جیهاد کردن ئەوەیە ئەنجام و دەرهاوێشـــتەکەی، ئەی ئەگەر بڕوات پێی نەمێنێ یان بیگۆڕیتەوە بە سیســـتەمی دیموکراسی؟ ئەوە خاوەنەکەی تەواو قیامەتی لە دەست دەچێ و دونیاشی تەواو پێ دابین نابێ هەر زەلیل و ژێر دەستە دەبێ.

زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە دەفەرموون هەر کەسێک بڕوای بە فەرزیەت و پێویستی جەنگ و جیهاد نەبێ کافر بووە و لە ئیسلام دەرچووە.

[1] بریتییە لەو جۆرە کڕین و فرۆشـــتنەی کە خاوەن شـــتێک بە قەرز بۆ ماوەیەک شـــتێک بفرۆشـــێتە یەکێک و بە حازریش ئامادەبێ لێی بکڕێتەوە بە نرخێکی کەمتر لەوەی پێی فرۆشتووە کە ئەو بابەتە کڕین و فرۆشتنە لەلای زۆرینەی زانایان حەرامە و قەدەغەکراوە.

جا هەڵە و کەم و کورتی و خلیســـکان و خراپیە کانی ئە ندام پەڕلە مان کە دەچێتە ناو پەڕلە مان و تووشـــی دەبێ زۆرن بەڵام لەبەر کەمی دەرفەت و کات هەر بەوە ندە وازی لێدەهێنین و ئەوانەی باسمان کرد پێمان وایە بەسە بۆ هەر کەسێک کە بیەوێ لێی حاڵیبێت و تێی بگات، ئەوەیش کە نایهەوێ لێی حاڵی بێ و تێی بگات، بە دڵنیاییەوە دڵی خۆی قوفڵ دەدات و هەرچی بۆ باس بکەی هەر پشـــتی تێ دەکات و بیانوویەکی تر دەهێنێتەوە و شـــەیتان فێڵی لێ دەکات، کورد گووتەنی ئەوەندە نموونانە مشـــتێک لە خەرمانێکە و هیوادارین خەڵکەکە لێی تێ بگەن و حاڵیبن و بەوەندە ڕاستیەکان ڕوون ببێتەوە.

## ڕەواندنەوەی گومانەکان و ئاشکرا کردنیان:

ئێســـتاش دێینە ســـەر ئەو گومانانەی کە ئەو لایەن و کەســـانە دەیهێننەوە و دەیخەنە بەر گوێچکەی خەڵکی و بڵاوی دەکەنەوە کاتێک کەوا بەو گومانانەوە دەیانەوێ خەڵکەکە قەناعەت پێ بێنن و چەواشـــەیان بکەن لە باس و بابەتەکە تەواو حاڵی نەبن و تێ نەگەن تاوەکو بەشـــداری بکەن و دەنگیان پێ بدرێت یان دەنگ بدەن، جا ئێمە ئەو ڕاســـتیانە و گومانانە دەخەینە ڕوو:

١-ئاشکرایان دەکەین.

٢-دەیان ڕەوێنینەوە هەندێکیان کە زۆر زەق و ئاشـــکران و هەن ئێســـتا لە پڕوپاگەندەکانی هەڵبژاردن دەکرێ بۆ ئەوەی ﴿لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ﴾ **(الأنفال : ٤٢)** تاوەکو ئەوانەی لەناو دەچن و بە هیلاک دەچن و ڕوو ڕەش دەبن ئەوە بە بەیینە و ڕوونکردنەوەوە وە حوجە یان لەســـەر کرابێ، وە ئەوانەی کە دەژین و ڕاستیەکان گوێ لێ ڕادەگرن و کاری پێدەکەن ئەوانەش بە بەلگەوە وابکەن.

## هەندێک لەو گومانانە و ڕەواندنەوەکانیان:

**١-گومانی یەکەم؛** ڕەتکردنەوەی دیموکراسی و هەڵبژاردن قەبوڵکردنی دیکتاتۆریەتە، پڕ بە دەمیان سەرکردەکان بەربژێرەکان دێن ئەوە دەبەخشنەوە بە ناو خەڵکی و بڵاوی دەکەنەوە و بەوە چەواشەیان دەکەن، دەڵێن هیچ ڕێگا چارەی ترمان نییە ئەگەر تۆ بڵێی بە دیموکرا سی و هەڵبژاردن ڕازی نیم کەواتە ڕازیت بە ستەم و دیکتاتۆریەت و قۆرخ کردنی دەسەڵات و پارە و پول لەلایەن تاقم و چە ند کەسێک یان بنە ماڵەیەک، ئەوە لە پڕوپاگەندەکانیان دەردەکەوێ و زۆرجار ئەو قسە دەکەن و ئەوە بە خەڵکی دەفرۆشن وە تۆمەتیش دەبەخشنەوە بۆ ئەو زانایانە و بۆ ئەو کەسانەی کە پەیڕەوی ئەو ڕێگایە ناکەن و پاپە ندن بە قور ئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)، دەڵێن ئا ئەوانە کە دەیکەن بەرگری کردنە لە دیکتاتۆریەت و خەڵکی سارد دەکەنەوە لە هەڵبژاردن و دەنگدان یان دەڵێن ڕاست نییە و دروست نییە، ئا ئەو کاتە بزانن یان نەزانن دەڵێن ئەوانە بەرگری دەکەن لە عەلمانیەت و دیکتاتۆریەت.

## وەڵامدانەوەی ئەو گومانە لە چەند خاڵێکدا دەبێت:

١-ئەوەی وا دەڵێت بە دڵنیاییەوە نە لە ئیسلام گەیشتووە و نە لە ئەو موسڵمانە پاپەندانەی بە ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە مانای الله بەیەکگرتن و ڕەتکردنەوەی هاوبەشی

تێگەیشـــتوون ئەوانەی نە ناســـیوە بە دڵنیاییەوە، چونکە دیموکراســـی و دیکتاتۆریەت هەردووکیان نەفامین و لە ســـەردەمی خۆمان بەرهەمی عەلمانیەتن و دەســـتکردی مرۆڤن و الله تعالی بە هەردووکیان ڕازی نییە و ئەو کەسەی بڕوای بە ڕێی دیموکراسی و هەڵبژاردن نییە بڕوای بە عەلمانیەتیش نییە و بڕوای بە دیکتاتۆریەتیش نییە، هەردووکیان بە حوکم و فەرمانی نەفامی دادەنێ کە الله تعالی فەرمووی: ﴿**أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ**﴾ **(المائدة : ٥٠)** واتە: ئایە ئێوە حوکم و فەرمان ڕەوایەتی نەفامیەتتان دەوێت بەســـەر حوکم و فەرمانی الله تعالی.

کەواتە بۆ موســـڵمانان نەهاتووە و قبوڵ نییە بەڵکو دەبێ بڵێین هەردووکیانمان ناوێت و پێیان ڕازی نین و ڕەتیان دەکەینەوە، تەنها بە ئیســـلام و ڕێبازەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕازین و پیادەیان دەکەین.

٢-دروست نییە بۆ موسڵمان کە بڕوا بێنێت بە بەرنامە و سیستەمێک کە پێچەوانەی شەرعی ئیسلام بێت و دژبێت بە قورئان و فەرموودە بە بیانووی ئەوەی ناچارییە یان هیچ ڕێگایەکی تر نییە و ئیکراە لەسەرمانە، بە یەکدەنگی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعەوە ئیکراە لەسەر دڵدا نییە تۆ بڕوا بێنیت بە دیموکراسیەت و شتێک، تەنها ئیکراە بە مەرجە شەرعییەکانیەوە بۆ ئەو قســـە و گووتنانەیە کە دەیکەی، فعل و کرداریش جیاوازی زانایانی لەســـەرە، کە

هەندێکیان ڕێگای پێدەدەن کاتێک کەوا تووشـــتبێ کە مەرجەکانی ئیکراهی تەواوی لێ بێتەجێ کە چوار تا پێنج مەرجیان داناوە زانایان وە ئیبن حەجەریش لە (فتح الباري) زۆر بە کورتی و پوختی دەیان هێنێتەوە.

کەواتە ناکرێ تۆ بڵێی هیچ ڕێگا چارەیەک نییە مادەم کوفر و شـــیرک لە باوەوە هەیە من دەچم دەســـتی پێوە دەگرم و گوناحەکە ئەنجام دەدەم اللە تعالی ئەو ئەرکەی نەخســـتوەتە سەر تۆ.

- اللە تعالی فەرموویەتی: ﴿**لَا يُكَلِّفُ اللهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا**﴾ **(البقرة : ٢٨٦)**

واتە: اللە تعالی ئەوەی نەخســـتوەتە ســـەر ئەســـتۆی هیچ کەس و فەرد و تاکێک کە لە توانایدا نەبێ.

- اللە تعالی فەرموویەتی: ﴿**فَاتَّقُوا اللهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ**﴾ **(التغابن : ١٦)**

واتە: بە گوێرەی توانـاتـان دینـداری بکەن و خۆ پـارێزکـاربن و فەرمـانەکـانی اللـە و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) جێبەجێ بکەن.

کەواتە ناکرێت بۆ ڕەتکردنەوەی نەفامی و کوفر و شیرکێک کوفر و شیرک و نەفامیەتێکی تر بگرینەبەر و دەســـتی پێوە بگرین هاوشـــێوەی ئەو کوفر و نەفامیەتە هەڵبژێرین، بەڵکو موســـڵمان دەبێ خۆی و خەڵکی پێ بگەیەنێت و پێداگربێت لەســـەر بیروبڕوا و اللە بە

یەکگرتن و کوفرکردن بە طاغوت، ئەگەر ڕێگای نەبوو ئەنجامیان بدات با لەو پێناوەدا کۆچ بکات الله تعالى کاری ئاســـان دەکات، وە لە دەرفەتێکیش هەوڵی ئەوە بدات بە ڕێگای شـــەرعی و ڕێبازەکەی پێغەمبەر (ﷺ) حوکمی الله تعالى بگەڕێنێتەوە و پەیڕەوی بکات لە ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) و چوار خەلیفە ڕاشـیدەکە و سـوودیان لێ وەرگرێ و بە سەرمەشقی خۆیان دابنێ.

٣-نابێ موسڵمان میکافیلیانە بیر بکاتەوە و بڵێ **(الغاية تبرر الوسيلة)** مادەم من ئامانجێکی باشم هەیە بە هەر کەرەستە و ئامرازێک بێت ئەو ئامانجە بەدەست بێنم ئاساییە، بەڵکو لە ئیسلامدا بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکان دەبێ کەرەستەی شەرعی و جائیز و دروست بەکار بهێنرێت و بگرینەبەر و بەدەستیان بێنین.

لە ئیسلامدا ئامرازەکان دەبێ شەرعی و حەڵاڵ بن نەوەک حەرام و بێشەرعی، هەندێک لەوانەی پاشگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە دەڵێن هەڵبژاردن و دیموکراسی وەکو وەسیلە و ئامرازێک بەکاریان دەهێنین و بڕوامان پێی نییە و نایکەینە ئامانج، جا لە ئیسلامدا دروست نییە جادو بە جادو هەڵبوەشێنرێتەوە، وە کەسێک بە ئەنقەست بکوژی بۆ ئەوەی باشیەکی تر لەجێی ئەوەوە لە دەست بگری، وە هەر کارێکی تر بکەی کە حەرام و تاوانبێ، جا ئەی ئەگەر حەرام و تاوانەکە کوفر و شیرک بێ؟ بە هیچ ڕێگایەک ڕێگا نییە و زانایانی

ئیسلام سەد لە سەد و بە کۆ دەنگی قەدەغەیان کردووە و ئایەت و فەرموودەکان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، زانایان (رحمهم الله) ئەوانەیان شیکردوەتەوە و ڕونکردوەتەوە.

وتیان بە ئیمام ئەحمەد: کە ژنێک دەیەوێت لە پیاوەکەی جیابێتەوە و پیاوەکەی دەیەوێت تەڵاقی بدات، بەڵام پیاوەکەی ڕازی نابێت تەڵاقی بدات پاشان هەندێ لە ئەهلی فێڵ و حیلە بە ژنەکەیان وت: ئەگەر مورتەد ببیتەوە لە ئیسلام، نیکاحت لەگەڵ ئەو پیاوە نامێنێ ژنەکە مورتەد بوەوە بۆ ئەوەی لە پیاوەکە جیا ببێتەوە، ئیمامی ئەحمەد (رحمە الله) توڕە بوو فەرمووی: هەر کەسێک فتوای ئەو کارە بدات یان خەڵک فێر بکات یان پێی ڕازی بێت ئەوە کافرە[1].

کەواتە گەڕاندنەوەی حوکمی الله کارێکی چاکە و حوکمێکی شەرعییە و پێویستیشە بەڵام نابێت بە ڕێگای بێشەرعی و شیرک حوکمی الله بێنینەوە و هەوڵی بۆ بدەین، بەڵکو بە ڕێگای شەرعی وەکو پێغەمبەر (ﷺ) کردی.

- الله تعالى فەرموویەتی: **﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (الأنعام : ١٥٣)**

[1] ئیمامی ئیبن القیم لە کتێبی -إغاثة اللهفان- (ل: ٣٧١) هێناوێتی.

واتە: بەڕاستی و بێگومان ئەوەیە ڕێگای ڕێک و ڕاستم کە ئیسلامە شوێنی بکەون و شوێن ڕێچکە و گومڕاییەکانی جگە لە ئیسلام مەکەون کە پەرتەوازەتان دەکات و دوورتان دەخاتەوە لە ڕێگای الله ئەوەیە الله ئامۆژگاریتانی پێ کردووە تاوەکو پارێزکاری بکەن و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن و قەدەغەبن لە قەدەغە کراوەکانی.

کەواتە دوور کەوتنەوە لە هاوبەشی و بە دەستهێنانی الله بە یەکگرتن مسۆگەر کاری تەمکین و گەیشتنە بە حوکم کردنی قورئان و فەرموودە، هەروەکو الله تعالى فەرموویەتی و بەڵێنی داوە بە بڕواداران کە خاوەن تەوحیدن و کوفریان کردووە بە طاغوت و هەوڵیش دەدەن بۆ ئەوەی حوکمی الله بگەڕێننەوە حوکمەکەیان بۆ دەگەڕێنێتەوە و تەمکینیان دەکات و چەسپیو و چەقیو و دیاریان دەکات لەسەر زەوی.

- الله تعالى دەفەرمووێ: ﴿**وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا**﴾ **(النور : ٥٥)**

واتە: الله بەڵێنی داوە بەوانەی کەوا بڕوایان هێناوە لە ئێوە کار و کردەوەی چاکەیان کردووە جێنیشینیان بکات لە زەوی هەروەکو ئەوانەی لە پێش ئەوانی جێنشین کردووە و ئاین و ڕێبازەکەی کە ئیسلامە بۆیان بەرپا بکات و لە دوای ئەوەی ترسیان لەسەر بوو بیانخاتە

ئەمن و ئاسایشەوە و ترسیان لەسەر نەهێڵێت ترسەکەیان بۆ بگۆڕێت بە ئەمن و ئاسایش من دەپەرستن و هیچ هاوبەشیەک و کەسێک لەگەڵم ناکەنە هاوبەش و بۆم ئەنجام نادەن.

کەواتە مەرجی سەرکەوتن ئەوەیە کەوا هاوبەشی بۆ الله بڕیار نەدەی، تەنها الله بپەرستی، کار و کردەوەی چاک بکەی، بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە (ﷺ) پاپەندبی، بە دڵنیاییەوە دەتوانی حوکمی ئیسلام بگەڕێنیتەوە و زوڵم و ستەم و دیکتاتۆریەت و هەر هەموو ئەوانی تر جگە لە ئیسلام ڕەتبکەیتەوە و ڕایماڵی.

**٢-گومانی دووەم؛** دەڵێن مەیدان و گۆڕەپانەکە نابێت تەنها بۆ عەلمانیەکان بێ و بۆیان چۆڵ بکەین و بهێڵینەوە.

جا نەگووتراوە مەیدان و گۆڕەپانەکەیان بۆ چۆڵ بکرێت بەڵکو تەنها گووتراوە بەشدار مەبن لە کار و ڕێگا بێشەرعی و کوفریەکان و مەبنە میکیاجی جوانکاری پرۆسەی عەلمانیەت و دیموکراسی و بەهاراتی تام و چێژ و بۆن بۆ خۆشکردنی تامی پەڕلەمان، لە گۆڕەپانەکە شێرانە بە وریایی و داناییەوە ڕێگای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بگرنەبەر و بە ڕێکوپێکییەوە بە بەرنامەیەکی تۆکمەوە بانگەوازی بکەن بەرەو لای الله تعالی و خەڵکی بانگ بکەن بەرەو الله بەیەکگرتن و دوور یان بخەنەوە لە طاغوت و شیرک و هاوبەشی لە پا شان الله تان خۆ شبوێ و لە پێناو ئەودا هەموو کار و ئیشەکان

بکەن و دژایەتی دوژمنانی الله تعالی بکەن لە پاشـــان دیندار‌بن و وازبێنن لە گوناح و تاوانەکان بە دڵنیاییەوە الله تعالی ئا ئەو کاتە یارمەتیدەر دەبێت و لە پشـــتتان دەبێت و گۆڕەپانەکەش پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەو شێوەیە پڕیان کردوەتەوە و چۆڵیان نەکردووە بۆ ســەر و طاغوت و کوفر و شــیرکەکانی ســەردەمی خۆیان بەڵکو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وازیان دەهێنا و پشتیان دەکرد لە طاغوت و شیرک و هاوبەشی و ڕێبازەکەی ئەوان لە ســەردەمەکانی ئەوان، لەولاشــەوە دەعوە و بانگەوازییان دەکرد بەرەو الله بەیەکگرتن و وازهێنان لە طاغوت و شیرک و هاوبە شی لە کۆتایدا الله تعالی سەری دەخستن.

- الله تعالی دەفەرمووێ پێغەمبەر ئیبراهیم (ﷺ) گوتوویەتی: ﴿**وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ**﴾ **(مريم : ٤٨)**

واتە: من خۆم گۆ شەگیر دەکەم و لێتان دوور دەکەومەوە لە خۆتان و لەوانەی دەیپەرستن بێجگە لە الله تعالی و هاواری لێدەکەن.

ئەوە قسەی ئیبراهیم (ﷺ) بووە و ئەوە ڕێبازەکەی ئەو بووە.

## لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە:

ئایە ئەوانەی پاشــگری ئیســلامییان بەخۆیانەوە لکاندووە بە ئاشــکرا دەتوانن بڵێن ئێمە بڕوامان بە دیموکراسی نییە و دۆستی ئەوانە نابین کە کافر و دوژمنن بە الله تعالی؟

بە دڵنیاییەوە تا ئێستا ئەوەمان نەبیستوە و نەبینیوە و نەخێر ناتوانن و وا شیان نەگوتووە و واش ناڵێن، بەڵکو بڕوایان پێی هێناوە و دۆســتایەتیان دەکەن و لەگەڵیاندا دەبن، مەگەر تەنها گلەیی جێبەجێ نەکردنی یاسا بێدینی و بێشــەرعی و کوفریەکانیان لێ بکەن و بڵێن وەکو ئێمە بە یا ساکانی دە ستکردی مرۆڤ زادە و ئەوەی لە پەڕلەمان دەر دەچێ پابەندین ئێوە ئەی عەلمانی پێشــێلی دەکەن و تەواو پێیوە پاپەند نابن، وەک بڵێ ئەوەی ئێمە خۆمان تەواو گومڕا کردووە ئێوە وەکو ئێمە خۆتان گومڕا ناکەن و شــتی تێدا دەهێڵنەوە، کەواتە بە زمانی حاڵ و گووتن ئەوەیە هەڵوێستیان و وایان لێبینراوە و وایان لێبیستراوە.

کەواتە کورتەی باس و بابەت ئەوەیە کە بانگەوازی بۆلای الله تعالی و خۆ دوور گرتن لە هاوبەشــی و گوناحەکان و خەڵک پەروەردەکردن لەســەر ئەوە لە دەرەوەی پڕۆســەی دیموکراســی و هەڵبژاردن و پەڕلەمان بوونی هەبێ بە دڵنیاییەوە باشــتر و کاریگەرترە لە گۆڕەپانەکە و گۆڕەپانەکەی پێ پڕدەکەیتەوە و ئەو کات بۆت چۆڵ نەکردوون، ئەگەر بۆشت

نەلوا و نەکرا وەکو پێغەمبەر (ﷺ) کۆچ دەکەی بە ئومێـدی ئەوەی جـارێکیتر بێیتەوە گۆڕەپانەکە و پڕی بکەیتەوە وەک الله تعالی بۆ پێغەمبەری (ﷺ) کرد و بۆ ئەو ئەنجامیدا.

**٣-گومانی سـێیەم؛** دەڵێن چەندین چاکە و بەرژەوەندی پێوە دابین دەبێت، لەوانە دەبێتە گۆڕەپان و مەیدانی میمبەری بانگەوازی کردن و پشتگیری کردنی چەو ساوەکان و ڕزگارکردنیان و ماف وەرگرتنەوەیان و گەڕاندنەوەی حوکمی الله تعالی بە قۆناغ بەندی.

١-ئەو بەرژەوەندی و چاکیانە لە ئیسلامدا یا سا و چوارچێوەی هەیە هەر ئاوا بەبێ بەڵگە و لە گومان و هەوا و هەوەسـەوە دیاری ناکرێت، زانایان فەرموویانە بەرژەوەندی و مەسـڵەحەیەک تێ بگیرێت لەگەڵ مەقاسـیدەکانی ئیسـلام چ لەگەڵ هەموویان یان لەگەڵ یەکێکیان ئەوە بە خراپە دادەنرێت[1]، جا لە هەموو بەرژەوەندیەکان چاکتر و لە پێشـتر تەوحید و الله بەیەکگرتنە وە مرۆڤ و جنۆکە لەو پێناوەدا بەدیهێنراون.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ **(الذاريات : ٥٦)**

واتە: من جنۆکە و مرۆڤم تەنها بۆ پەرستشی خۆم و الله بەیەکگرتن بەدیهێناوە.

[1] مەقاسیدەکانی ئیسلام پێنج خاڵە سەرەکیەکەیە: دین و گیان و عەقڵ و وەچە و ماڵ.

کەواتە بەشــداری هەڵبژاردن و پەڕلەمان دژە بە تەوحید و هەڵیدەوەشــێنێتەوە ودانانە بە طاغوتیەت و هاوبەشــیەت و کوفر و شــیرک ئەوە زۆر لێک دوورە و هیچ بەرژەندیەکی پێوە دابین نابێت و لە ئیسلامدا جێی نابێتەوە.

زانایان دەفەرموون نابێ بەرژەوەندی و مەســەڵەحەتەکە تێک بگیرێت لەگەڵ بەڵگەکانی قورئان و فەرموودە، جا لە هێنانەوەی بەڵگەکانی ڕای دووەم باســمان کرد لە ڕابردوودا کە گووتیان هەڵبژاردن و بەشــداریکردن حەرامە و قەدەغەیە و کوفرە و نابێ موســڵمان توخنی کەوێ وە پێچەوانەیە لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) و حوکمی الله تعالی ناچەســپێندرێ بەڵکو هێدی هێدی حوکمەکە لێیان دەســێندرێتەوە، لە جیاتی ئەوەی ئەوان بتوانن کافر و موشریک و عەلمانی و کەسی خراپ بگۆڕن ئەوان کاریگەری زیاتریان دەبێ لە سەری، لە واقیعدا هەر ئەوە بیندراوە و ڕوویداوە.

٢-وەکو زانایانی ئیســلام فەرمو یانە نابێ بەرژەوەندیەکە بەرژەوەندیەکی گەورەتر و پەســەندتر لە دەســت بدات و پێچوێنێت، کە بەرژەوەندی تەوحید و الله بەیەکگرتنە گووتمان ئەو لە دەست دەدات.

٣-نابێ بەرژەوەندی و بانگەوازیەکە کە زۆر باســی دەکرێت و دەڵێن ئێمە دەتوانین لەوێ بیکەین و بەڵگەی بۆ دەهێندرێتەوە وەکو زانایانی (أصــول الفقه) دەڵێن کە هیچێک لەو

خـاڵانەی کە ئەوان دەیڵێن کە ئەوە مەســـڵەحەتی دەعوەیە کـاکە بۆ وا دەکەی ئەوە بەرژەوەندی بانگەوازییە! ئەوەت لەبەر چ وا کرد کاکە مەســـڵەحەتی دەعوە لەوەدایە! کردویانە بە خاڵێک لەو خاڵانەی کە ئەنەهو لە (أصول الفقه) باسکراوە، بەڵگەکان بریتین لە قورئان و لە سوننە و مەسڵەحەتی دەعوە.

نەخێر مەســـڵەحەتی دەعوە قورئان و فەرموودەکانی الله و هی پێغەمبەرە (ﷺ) ئەوان پەیڕەو بکرێ، نەک بە هەوا و هەوەس ئێمە هەر شـــتێک بکەین ئەو بیانوەی بۆ بێنینەوە و پاســـاومان ئەوەبێ ئەوە بەرژەوەندی بانگەوازیەکەی تێدایە، جا بە دڵنیاییەوە بەرژەوەندی بانگەوازی لەو گومان و هەوا و هەوەسانەدا نییە.

- الله تعالى فەرمووی: ﴿**إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنْفُسُ وَلَقَدْ جَاءَهُمْ مِنْ رَبِّهِمُ الْهُدَى**﴾ **النجم : ٢٣)**

واتە: ئەوان ئیلا بە دوای گومانەکان و هەوا و هەوەسەکانی خۆیان و نەفسیان دەکەون جا لە پەروەردگاریانەوە ڕێنمویشیان بۆ هاتووە و پێشێلی دەکەن.

ئەوەتا ڕووداوێک هەیە ئیبن جەوزی بەغدادی -رحمه الله- هێناویەتیەوە:

(عضـد الدولة) کە یەکێک بوو لە ســەرکردە بەناوبانگەکان دەســەڵات و فەرمان ڕەوایەتی موسڵمانانی ماوەیەک گرتبووە دەست کە حوکمی بە قورئان و سوننەش دەکرد بەڵام ستەم و

زوڵم و گوناحیشـــیان هەبوو دەڵێ: لە (عضـــد الدولة)ەوە باســـمان بۆکراوە کە هەواداری کچێک بوو، بیروهۆشی سەرقاڵ کردبوو، ئەوەبوو فەرمانیدا لە ئاودا بخنکێنرێت، بۆ ئەوەی بیروهۆشـــی خەریک نەبێت و ببێت بە هۆکاری باش بەڕێوەنەبردنی موڵکەکەی! ئەمەش ئەوپەڕی شـــێتییە، چونکە کوشـــتنی موســـڵمان بەبێ تاوان حەڵاڵ نابێت، بڕوابوونیش بە شیاوێتی ئەو ڕەفتارە کوفرە، وە ئەگەر بڕوای بە شیاوێتی نەبوو، بەڵام وەکو بەرژەوەندیەک بەدیکرد، ئەوە هیچ بەرژەوەندیەک لەو شتانەدا نییە کە پێچەوانەکاری شەرع بن[١].

**٤-گومانی چوارەم؛** دەڵێن ئەوەی ئێمە کردومانە و دەیکەین بە چاو لێکردنی پێغەمبەر یو سفە (ﷺ) و ئەوەتا پێغەمبەر یو سف (ﷺ) بە شداریکرد لەو حکومەت و دە سەڵاتەی سەردەمی خۆی کە دەسەڵاتی کوفریش بوو وە حوکمیان نەدەکرد بە یاساکانی الله تعالی.

### کارکردنی یوسف لە حکومەتی پاشاکە:

دەڵێین یو سف پێغەمبەر (ﷺ) بە شداریکردنەکەی لە دە سەڵات و حکومەتەکەی هاوبەش بڕیار دەران و کافران بوو، لەســەر داوای خۆشــیەوە بوو چووە ناو ئەو حکومەتە، جا الله تعالی مەتحی یوسـفی کردووە لەسـەری (ﷺ) ئەوە نەبێ قەدەغەی کردبێ لەسـەر ئەوەی کە دەســەڵاتەکەی وەرگرتووە، جا ئەگەر تەواو ســەرنجی ئەوەی یوســف پێغەمبەر (ﷺ)

[١] لە -تلبيس ابليس- (ل: ١٨٨)هاتووە.

بدەین لەگەڵ هی ئەوانەی ئەمڕۆ کە بەو بیانوو گومانەیەوە خەڵکی دەخەڵەتێنن و دەڵێن چووینەتە ناو پڕۆسەی هەڵبژاردن و دەنگدان و دیموکراسی و عەلمانیەتەوە، ئەوە لەو چەند خاڵانە زۆر بە کورتی و پوختی دەتوانین گومانەکەیان هەڵبوەشێنینەوە و بڕەوێنینەوە:

١-یوسف پێغەمبەر (ﷺ) بە مەرج دەسەڵاتەکەی وەرگرت و دەسەڵاتی ڕەهای هەبوو لە دەسەڵاتەکەی خۆیدا، وە بە تەواوەتی دەسەڵاتی ڕەهای پێدرا لەلایەن پاشاکەوە و لە ئایەتەکان دەردەکەوێ و وەکو ڕاقەکارانی قورئانیش وا یان ئایەتەکان تەفسیر و ڕاقە کردووە.

گومانیشمان نییە لەوەی یوسف (ﷺ) پێغەمبەری الله بووە و مەعسوم بووە، لە ڕوانگەی ئەهلی سوننە و جەماعە پێغەمبەران مەعسومن لە شیرک و کوفر و گوناحە گەورەکانیش، هەر هەڵەیەکی تریشیان هەبووبێ بە زووترین کات لێی گەڕاونەتەوە، جا حوکم نەکردن بە یاسا و شەریعەتی الله ش لە کوفر و شیرکەوەیە، کەواتە بە دڵنیاییەوە یوسف پێغەمبەر (ﷺ) دەسەڵاتەکەی بە ڕەهایی وەرگرت و حوکمی کردووە بە شەریعەت و یاسای الله.

- الله تعالی لە قورئاندا فەرموویەتی: **﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ﴾ (يوسف : ٥٦)**

واتە: ئا بەو جۆرە دەسـەڵاتمان دا بە یوسـف و پایەدار و جێگیرمان کرد لە خاکی میسـردا هەر پلە و پایەیەکی دەویست لەو وڵاتەدا دەستی دەکەوت و بۆی ساز دەبوو.

ئەوەتا ئیبن جەریری تەبەری گێڕاویتیەوە لە پێشـەوا سـوودی کە دەربارەی ئەو ئایەتە فەرموویەتی: **(اسْـتَعْمَلَهُ الْمَلِك عَلَى مِصْر ، وَكَانَ صَـاحِب أَمْرِهَا ، وَكَانَ يَلِي الْبَيْع وَالتِّجَارَة وَأَمْرَهَا كُلّه)**[1] واتە: پاشـای میسر کە یوسـف پێغەمبەری (ﷺ) دانا لەسـەری، ئەو بووە خاوەنی هەموو فەرمان و کارەکان، کڕین و فرۆشـتن و بازرگانییەکان هەموو کار و بارەکانی گرتبووە ئەستۆ.

وە پێشەوا بەغەوی فەرموویەتی ئیبن ئیسحاق و ئیبن زەید فەرموویانە: **(وكان لملك مصر خزائن كثيرة، فسـلم سـلطانه كله اليه، وجعل أمره وقضـاءه نافذاً)**[2] واتە: پاشـای میسر چەندین خەزێنەی هەبوو (زۆر بوون)، دەسـەڵاتی هەموو خەزێنەکانی دایە یوسـف پێغەمبەر (ﷺ)، فەرمانی کرد بەسـەر خەڵکەکەدا فەرمان و حوکمەکانی یوسـف دەبێ جێگیربێ و جێبەجێ بکرێت و گوێشی لێ ڕا بگیرێ.

---

[1] ئیبن جەریری تەبەری لە -جامع البيان- (١٦/ ١٥٢) وای فەرمووە.

[2] پێشەوا بەغەوی لە تەفسیرەکەی -معالم التنزيل- (٤/ ٢٥٢) هێناوێتی.

پێشـــەوا قورتوبیش -رحمه الله- فەرموویەتی: **(ولما فوض الملك أمر مصرـ إلى يوســف تلطف بالناس، وجعل يدعوهم إلى الإســـلام حتى آمنوا به، وأقام فيهم العدل، فأحبه الرجال والنســاء)**[1] واتە: لە دوای ئەوەی پاشـای میسرـ دەسـەڵاتی دایە دەسـت یوسف لەگەڵ خەڵکەکەدا نەرم و نیان بوو، بانگی دەکردن بەرەو ئیسلام و الله بە یەکگرتن هەتا بڕوایان هێنا، عەدل و دادپەروەردی لە ناویان بەرپاکرد، تا وای لێهات پیاو و ئافرەتان یوسفیان خۆشویست.

ئەوانە هەمووی ئەوەی سەلماند کەوا یو سف پێغەمبەر (ﷺ) حوکمی کردووە بە ئیسلام و حوکم و فەرمانی ڕەهای وەرگرتووە و شـەریعەتی ئیسـلامی جێبەجێ کردووە و بانگەوازی خەڵکی کردووە و هیچ ڕێگرییەک نەبووە، ئەوەتا لە کۆتاییەکەیدا خەڵکەکە زۆربەی بوونە موسڵمان.

٢-ئەو کارەی یوسف یوسفی نەگۆڕی بەڵکو یوسف ئەوانی گۆڕی و خەڵکەکەی بەرەو الله بەیەکگرتن هێنا و دووری خستنەوە لە طاغوت و شیرک و هاوبەشی و بوونە موسڵمان.

ئەوەتا پێشـەوا بەغەوی فەرموویەتی موجاهید کە پێشـەوای موفەسـیر و ڕاڤەکارانە گەورە تابعییە وە جگە لەویش فەرموویانە: **(فلم يزل يوســـف عليه الســـلام يدعو الملك إلى**

[1] لە -الجامع لأحكام القران- (٩/ ٢١٨) هاتووە.

**الإسلام ويتلطف له حتى أسلم الملك وكثير من الناس)**[1] واتە: بەردەوام یوسف مەلیک و پاشـــاکەشـــی بانگ دەکرد بەرەو الله بەیەکگرتن و ملدان بۆ الله و تەســـلیم بوونی و موســـڵمان بوونی، وە لەگەڵی میهرەبان بوو تا وای لێهات پاشـــاکەش موســـڵمان بوو، وە زۆریش لە خەڵکی موسڵمان بوون.

٣-یو سف پێغەمبەر (ﷺ) لە ورد و در شتەکانییەوە هەموو کارەکانی بە یا سای الله بووە و یاسای غەیری الله تعالی ی ڕەتکردوەتەوە.

ئەوەتا یەکێک لە زاناکانی حەنەفیەکان لە خاوەنی حاشـیە لەسـەر تەفسـیری بەیزاوی کە پێشـەوا موسـاڵەحە دینە دەڵێ: **(أن يكون ﴿إلا أن يشـاء الله﴾ كلمة تأبيد كأنه قيل ما كان ليأخذ أخاه في دين الملك أبدا لأنه جل من ات صف بمن صب النبوة عن أن يحكم بدين الكفار نحو قوله تعالى: {وَمَا يَكُونُ لَنَا أَن نَّعُودَ فِيهَا إِلَّا أَن يَشَـــاءَ اللهُ﴾ لأن عودهم في ملتهم ما أن يشـاؤه الله أبداً)** واتە: ﴿إلا أن يشـاء الله﴾ ئەوە وشـەیەکی تەهید و پاڵپشتی کردنە، لە یاسای ئەو پاشایە نەدەبوایە براکەی گل بدایەتەوە لەوە بەرز و گەورەتر بووە (یوسف) کە کەسێک وەسف کرابێ بە پێغەمبەرایەتی حوکمی کردبێ بە ئاین و ڕێبازی کافرەکان ﴿ڕەوا نییە بۆ ئێمە جارێکیتر بگەڕێینەوە ســـەر ئەو ئاینە﴾ چونکە

[1] لە -معالم التنزيل- کە تەفسیرەکەیەتی (٤/ ٢٥٢) هاتووە.

گەڕانەوەیان بۆ ناو کوفر لە دوای ئەوەی موسڵمان بوون قەتاوقەت الله ویستی لەگەڵ ئەوە نابێ.

کەواتە یوسف پێغەمبەر (ﷺ) سەد لە سەد حوکمی کردووە بە یاساکانی الله تعالی.

ئایە لەگەڵ ئەوەی ئێستا ئەوانە دەیکەن تێک دەکاتەوە؟

ئەوانە سەرەتا پاپەند دەبن بە یا سا بێشەرعی و کوفریەکان و گوناحکردن لە پا شان دەچنە ناوی تەواو خۆ یان ڕەش و پیس دەکەن بە گو ناح و شـــیرک و کوفرە کانەوە، کوفر و عەلمانیەت و دیموکراســـیەت بایی ئەوە لێیان ڕازی دەبن کە بچنە ناو پرۆســـەکە و لەناو پرۆســـەکەش بە شـــەرمنانە هەندێک جار دروشـــمی زەقی ئیســـلام و موســـڵمانان لە پێناو بەژەوەندی و پروپاگەندەی هەڵبژاردن نەوەک هێنانەجێی وەعد و بەڵێنەکان یان لە پێناو الله تعالی دەیکەن و دەیڵێن.

**پرسیار:** ئایە تا چەند دروستە بە مەرج بەشداری بکەی لە سیستەم و دەسەڵاتی زاڵم و ستەمکاران یان تەنانەت هی کوفر و شیرکیشەوە؟

**وەڵام:** ئەوەتا قورتوبی براندویەتیەوە و دەفەرمووێ: **(قالوا بعض أهل العلم في هذه الأية، ما يبيح للرجل الفاضل، أن يعمل عند الرجل فاجر، والسلطان الكافر، بشرط أن يعلم أنه يفوض اليه في فعل لا يعارض فيه، فيصـــلح منه ما شـــاء، وأما إذا كان**

**عمله بحسب اختيار الفاجر وشهواته وفجوره، فلا يجوز ذلك)** واتە: هەندێک لە زانایان لەو ئایەتەوە ئەوەیان وەرگرتووە، کە ڕێگا پێدراوە بۆ کەسێکی بەڕێز و پلەدار (موسڵمان)، کار بکات لەلای کەسێکی گوناحکار، یاخود لەلای دەسەڵاتداری کافر، بەو مەرجەی ئەم کافرە کارەکە بگەڕێنێتەوە بۆ موسڵمانەکە، کار بکات بەو شێوەیەی خۆی پێی باشە، بەڵام ئەگەر بە هەڵبژاردنی خراپە کارەکە بوو تیایدا سوودێک هەبوو بۆ فیسقەکەی و خراپییەکەی، ئەوا بۆی نییە کار بکات لەلای.

کەواتە هەر لێرەوە ئەوانە تێکەوتن و هیچ ڕێگایەک نییە، کەواتە دروست نییە چونکە بە گوێرەی هەوا و هەوەسی ئەوانە، بە گوێرەی کوفر و شیرکی ئەوانە، بە گوێرەی واژووکردنی کۆمیسیۆنە لە خاڵەکانی پێش چوونە ناو پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن تاوەکو ڕازیبن بێنە ناو ئەو پڕۆسەیەوە، دانپێدانانی پەڕلەمان و دیموکراسیەت و عەلمانیەتە، ڕەشکردنەوەی دەعوە و بانگەوازی تەوحید و الله بە یەکگرتنە، دوورکەوتنەوە لە شیرک و هاوبەشی و لە طاغوتیەت و جەنگ و جیهادە.

ئیمامی قورتوبی دەفەرمووێ ڕایەکی تریش هەیە، هەندێکیش لە زانایان فەرموویانە: **(إن هذا كان ليوسف خاص عليه الصلاة والسلام، وهذا اليوم غير جائز)** واتە: ئەوە تایبەت بوو بە یوسف پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام، پێغەمبەری الله بوو الله بە تایبەتی ڕێگای بۆ

ئەو کردەوە و بۆ ئەو سـەردەمە بوو یان ئەوە شـەرعی پێش ئێمەیە لەئێمە و لە سـەردەمی

پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەکراوە ئیش و کاری پێناکرێ.

پێشـەوا قورتوبی دەفەرمووێ بەڵام ڕاکەی یەکەم پەسـەندترە، ئەگەر کەسـەکە زانی ئەو

ئیشـەی دەدرێتە دەسـتی تەواو دەتوانێت چاکسـازی و پاکسـازی تێدا بکات و هیچ

مەرجێکی لە کافر و بێدین و گوناحکارەکان قبوڵ نەبوو ڕەها کرا لەوەی جێبەجێی بکات،

کە ئەوە نییە و نەبووە لەسیستەمی دیموکراتیەت و عەلمانیەت و ئەو سەردەمانەی خۆماندا

دەڵێ ئەو لە پێشتر و لەجێ ترە کە بە مەرج بچێتە ناوی[1].

## ئایە یوسـف پێغەمبەر (ﷺ) کە چووە ناو ئەو دەسـەڵاتەوە، بووە ئەندام لەوێدا یان حوکمی ڕەهایی درایە دەست؟

ڕای زیاتر لەگەڵ ئەوەیە و ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە لە کۆتاییدا یوسـف هەموو پرس و ڕا

و ئەمر و فەرمانەکانی ئەوێی گرتە دەست، وە خەڵکەکە و بە پاشاشەوە هەموویان موسڵمان

بوون و بەرەو لای الله تعالی هاتن، بە پێچەوانەی ئەوانەی ئێستا کەوا هەندێک جار یەک

خاڵی شەرعیشیان پێ جێبەجێ نابێ ئەگەر شتێکی جوزئی کەم بکەن بەڵام لەولاوە شتێکی

گەورەی ئیسلام و درو شمەکان و مەبدەئی لە سەر دادەنێن و لە سەری قەرزار دەبنەوە، بە

[1] لە -الجامع لأحکام القران قرطبي- (٩/ ٢١٥) هاتووە.

پۆشاکەوە دەچنە ژورەوە بە ڕووتی لێی دێنە دەرەوە، بە ڕیشەوە دەچن بە تاشینەوە لێی دەردەچن، بە ناوی دینداربیەوە دەچن لە کۆتاییەکەیدا بە بێدینی لێی دەردەچن.

**٥-گومانی پێنجەم؛** دەڵێن پێغەمبەریش (ﷺ) بە شداری (حلف الفضول)ی کرد و لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای پێغەمبەرایەتی فەرمووی ئەگەربانگ بکرێم بۆ ئەو حیلفە وەکو (حلف الفضول)ی سەردەمی پێش هاتنی پێغەمبەرایەتی بە دەنگیانەوە دەچم و بەشداری دەکەم کە پشتگیری کردنی چەوساوەکان و سەندنەوەی مافەکانیان بوو.

## ڕێکەوتننامەی (حلف الفضول):

(حلف الفضول) بریتی بووە لە کۆبونەوەی بەنو هاشم و بەنو زوهرە و تیەم لە ماڵی کوڕی جەدعانەوە، پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) بەشداری کرد لەو هاوپەیمانێتییە، کە لە نێوان هەندێک لە قورەیشی و تیرەکان کرا لە نەفامیەتدا هاوپەیمانیەکەیان بە ست لە سەر ئەوەی مافی ستەم لێکراوان وەربگرنەوە و پشتگیری کاریان بن، پێغەمبەر (ﷺ) کە بەشداریکرد فەرمووی ئەگەر لە ئیسلامیش بۆی بانگ بکرێمەوە بەشداری دەکەمەوە، دەڵێن چۆن پێغەمبەر (ﷺ) وای گووت و وای فەرموو ئێمەش دەچینە ناو پەڕلەمان و پشتگیری چەوساوەکان دەکەین و مافەکانیان دەستێنینەوە و لەو پێناوەدا بە شداری دەکەین، کە لە باسەکانی ڕابردوو ئەوە بەڵگەیەک بوو لەو بەڵگانەی کە ڕای یەکەم دەیان هێنایەوە و

پشـــتیان پێی دەبەســـت لەوێ هەڵمان وەشـــاندەوە لێرەش بەپشـــتیوانی الله تعالی وەکو گومانێک کە دەیخەنە ڕوو دووبارە دەچینەوە ســـەری و دەڵێین ئێمەش ئەو گومانە بەو خاڵانە دەڕەوێنینەوە:

١-هاوپەیمانێتی لە ئیســـلامدا زانایان هەندێکیان ڕاو بۆچوونیان وایە هەڵوەشـــاوەتەوە و نەسخ بوەتەوە بە ئایەتی سەیف.

- الله تعالی فەرمووی: ﴿**فَإِذَا انسَـلَخَ الْأَشْـهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْـــمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ**﴾ **(التوبة : ٥)**

واتە: ئەگەر مانگە حەرامەکان ڕۆیشتن و تێپەڕین ئێوە کوشتار لەگەڵ موشریکەکان بکەن و بیانکوژن لە هەر شوێنک ئەوانتان بینیەوە.

زانایان کۆمەڵێکی زۆریان دەڵێن جمهور لەســەر ئەوەیە ئەو ئایەتە هاوپەیمانیەکانی نەسـخ کردوەتەوە.

- پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: **(ولا تُحْدِثُوا حِلْفًا في الإسلامِ)**[1]

واتە: باسی هیچ هاوپەیمانیەتیەکی تر مەکەن چیتر لە ئیسلام.

[1] لە سونەنی ترمزی (ژ: ١٢٨٩) ئەو فەرموودە هاتووە.

ئیبن ئەسیر لە پاش ئەو فەرموودانە فەرموویەتی: **(المحالفة كانت قبل الفتح)** واتە: بەڵێن و پەیمانە کان پێش فەتحی مەککە بوون، لە پاش فەتحی مەککە فەرمووی: **(لَا حِلْفَ فِي الْإِسْلَامِ)** واتە: هاوپەیمانێتی نەما لە ئیسلامدا.

٢-لە گریمانەی ئەوەی کە دروســـــت بێ بە مەرج هـاوپەیمانێتی بکرێـت و چوونە نـاو پەڕلەمانیش ئاوابێ، ئێمە دەڵێین زۆر جیاوازە چوونە ناو پەڕلەمان لەگەڵ هاوپەیمانێتی بە مەرج، لەسەر ڕای ئەو زانایانەی کە بە مەرج دروستە:

- (حلف الفضول) لە دەرەوەی سیستەمی پەڕلەمان بوو تەنها چەند سەر و کەسێک لە شوێنێک کۆبوبونەوە پێش هاتنی ئیسلامیش بوو بەڵام هەرچی پەڕلەمانە لەناو بازنە و یاسای کوفر و سیستەمی کوفردایە.
- (حلف الفضـول) تەنها بۆ یەک خاڵ بوو پشـتگیری کردنی چەوسـاوەکان بوو سـتەم لێکراوان بوو وە ماف ســەندنەوەیان بوو بەڵام پەڕلەمان چەندین دابەزین و پاپەند بوونی بە یاساکانی کوفری و بێشەرعیەوە پێوەیە و دەبێ دابەزی لە خاڵە گرنگەکانی ئیسـلام بۆیان، جا ئەگەر بەبێ هیچ باج و دابەزنێک لە عەقیدە و بیروبڕوا لەهەر شـوێنێک پشـتگیری کردنی چەوسـاوان هەبێ ئەوەیان ڕێگا پێدراوە، بەڵام ئەوە لەناو سـیسـتەمی عەلمانیەت و پەڕلەمان و هەڵبژاردن قەت نایەتەدی، بەڵکو سـتەمی گەورە

بەشـــداریکردنە لەویَ، لە چوار چێوەی یاســـا نەبێ قەتاوقەت ڕێگات پێ نادرێت و قســـەکانت ســـەرناگریَ، لە کۆتاییەکەیدا هەر بایی ئەوەندەت پێدەکریَ جەماوەر و خەڵکەکە هان بدەی، ئەوان دەنێریتە پێشەوە و بۆ خۆت ناوێری بچی و بەشدار نابی، ئەوانیش بەشیان دەبێتە لێدان و شەق و پێلاقە و کوشتن و ناموس بردن و گرتن.

- دەســـەڵا تدارە کان خودی خۆ یانن ســـتەمکار و خە ڵک دەچەوســـێننەوە، هەر پەڕلەمانەکەیە هەر حکومەتەکەیە کە ئەو پەڕلەمانە دروستی کردووە و دانی پێداهێناوە هەر سیستەمەکەیە چەوسانەوەی تێیدایە و خەڵکێکی زۆر دەوڵەمەند و پار و چەور دەکات، وە خەڵکێک چەوساوە و ژێر دەست دەکات، جا تۆ لەناو پەڕلەمانەکەدا دەبێ بەگژ دەسەڵات و سەرۆک و حکومەت و ئەوانەدا بچی و نەیان هێڵی، سەرەتا داوای ئەوەیان لێبکەی بەرەو لای الله تعالی بێن و مو سڵمان بن لە پا شان زوڵم و ستەمیش نەکەن و لێیان قبوڵ نەکەی.

**٦-گومانی شـــەشـــەم؛** دەڵێن ئەوەتا ئەبو تاڵیب پێغەمبەری (ﷺ) پەنادا، موتعیمی کوڕی عەدی پێغەمبەری (ﷺ) پەنادا کە لە طائیف هاتەوە ناو مەککە و پێغەمبەر ئەوەی پێ باشـــبوو و پێی ڕازی بوو، جا ئێمەش خۆمان پەنا دەدەین بە ئەندامێتی پەڕلەمان و

چوونە ناو پڕۆسـەی هەڵبژاردن و ئەنجومەنی یاسـا دانان تاوەکو بانگەوازی بکەین وەکو پێغەمبەر (ﷺ) وایکرد.

## ئەو گومانەش بەو شێوەیە هەڵدەوەشێنرێتەوە:

ئایە پێغەمبەری الله (ﷺ) هیچ دابەزینێکی لە پلە بەرزەکانی ئیسـلام و ئیمان کرد بۆ مامی یان بۆ هەر کافرێکی تر یان ڕاشکاوانە بانگەوازیەکەی خۆی دەکرد؟

پێغەمبەر (ﷺ) بە هیچ نەوع و جۆرێک هێچێک لە جارەکانیش بۆ دڵ ڕاگرتنی مامی چ ئەبو تاڵیب بووبێ چ ئەبو لەهەب بووبێ یەک قسـەی لە قسـە شـەرعیەکان و تەنانەت لە کافرکردنی باب و باپیرەکان و قسـە گووتن بە بت و سـەنەمەکان و بە درۆ هێنانەوەیان تەنازولی نەکرد و دانەبەزی و هیچی لێ نەشاردەوە.

- پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای مردنی ئەبو تاڵیب کە ئەبو لەهەب دێ پەنای بدا، ئەو کاتە ئەبو جەهل ئەبو لەهەب دەنێرێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەڵێ بڵێ عەبدولموتەڵیب لە کوێیە، پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ دوو دڵی لە دووەم جار کە ئەبو لەهەب دێتەوە لای دەڵێ ئەوەی عەبدولموتەڵیب لەسـەری مردووە و ئەوەی لەگەڵیشـی لەسـەری مردوون هەموویان لەناو ئاگرن.

ئەو حوکمە شەرعییەی ڕوونکردەوە، ناڵێ لەبەر دڵ ڕاگرتنی ئەبو لەهەب تاخیری بکەم یان دوای بخەم یان نەیڵێم یان لێی دابەزم، کە ئەوانەی پاشـــگری ئیســـلامییان بەخۆیانەوە لکاندووە ئەو دابەزینانە دەکەن بۆ هەڵبژاردن و چوونە ناو پەڕلەمان و لە کاتی ئەندام بوونیشیاندا، هیچیان یەک ناگرێتەوە لەگەڵ هی پێغەمبەر(ﷺ).

جا ئەوان مەرجیان نەبوو لەســـەر پێغەمبەر (ﷺ) لە پەنادانەکەی، وە پێغەمبەر هیچ مەرجێکی ئەوانی قبوڵ نەبوو، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ڕاشـــکاوانە قســـەکانی خۆی دەکرد و لێیان بێ منەت بوو کەواتە ئەوەشیان هەڵوەشایەوە و وەک یەک نین.

**٧-گومانی حەوتەم؛** دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) چوەتە ناو بازاڕ و خەڵک و ماڵ و تەنانەت پەڕلەمان و نادی قورەیشـــیش، ئێمەش ئاوا دەچینە ناوی و بانگەوازی تێدا دەکەین وەکو ئیقتیداکردن بە پێغەمبەر (ﷺ).

پێغەمبەری پێشـــەوا (ﷺ) دانی نەنابوو بە نادی و پەڕلەمانەکەی ئەوان، لە رابردوودا باسـمان کرد کە باوکی وەلید دێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) پێشـنیاری ئەوەی بۆ دەکات بکرێتە سەرۆک پەڕلەمان و هەموو کار و بارەکانی بدرێتە دەست تەنها قسە نەڵێ بەوان و بە بت و ســەنەمەکانیان، پێغەمبەر (ﷺ) ڕەتی کردەوە و ســەرەتای ســوڕەتی فصــلت تا ئایەتی سێزدەهەمی بەسەردا خوێندەوە (لە ڕابردودا تەواو تیشکمان خستەسەر و ڕوونمان کردەوە).

بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) بە ئا شکرایی دەچووە (بازاڕیان، ماڵیان، ڕێگا و بانیان، نادیەکانیان) لە هەر شوێنک ئەوانی ببینایە بانگی دەکردن بەرەو الله بەیەکگرتن و بت و سەنەمەکانی ئەوانی بە درۆ دەهێنایەوە و دەیگووت تەنها الله بپەرستن و دووركەونەوە لە طاغوت و کوفر بکەن بە طاغوت بەو شێوازەی کردووە پێغەمبەر (ﷺ)، بەبێ ئەوەی بچێتە ناو هەڵبژاردن و ئەندامێتی بوون لە پەڕلەمان و دەزگاکانی سەردەمی کوفر و شیرکی قوڕەیشی و ئەبو جەهل و ئەوان و دانیان پێدابنێ و لەگەڵیان لە قاقای پێکەنین دات و دەست لە ملانێ بکات کاتێک هەڵدەستن و دەڕۆن بە دڵنیاییەوە پێغەمبەر (ﷺ) وانەبووە، بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو (لا إله إلا الله) ئەوانی بانگ دەکرد و دەی فەرموو **(قولو لا إله إلا الله تفلحوا)** کارێکی شەرعی و دروستی دەکرد و لە هیچێک لە خاڵەکانی ئیسلام دانەدەبەزی، کاتێک پێیان دەگووت ئەوە چییە تۆ بۆ ئێمەت هێناوە، دەی فەرموو من **(ذبح)**م بۆتان هێناوە، ئەبو جەهل پێی دەگووت دابەزە لەوێ نوێژ مەکە جارێکی تر، دەی فەرموو بەڵێ نوێژ دەکەم و کڕنوش بۆ خواکەی خۆم دەبەم و پەرستراوی ئێوە پەرستراوی نا ڕەوان حەق نین و نابێ بپەرسترێن و نایان پەرستم، بەو شێوەیە بوو پێغەمبەر (ﷺ).

**٨-گومانی هەشتەم؛** محمدی کوڕی مە سلەمە کاتێک چوو کەعبی کوڕی ئەشرەف بکوژێ، پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگای پێدا چەند قسەیەک لەسەر ئیسلام و لەسەر پێغەمبەر

(ﷺ) بکات ئەگەر کوفر و بێشـــەرعیش بن، جا ئەویش وایکرد تاوەکو ئەو بکوژێ، جا

ئێمەش کە دەچینە ناو پەڕلەمان و دیموکراســـیەت و ئەوانە بۆ ئەوەمانە کە خاڵێکی گەورە

وەکو محمدی کوڕی مەسلەمە دابین بکەین و دەسەڵاتی کوفر و نەفامیەت نەهێڵین.

## لەو چەند خاڵانەدا ئەو گومانە دەڕەوێنینەوە:

١-ئەوانە قیاسـیان کردووە لەسـەر محمدی کوڕی مەسـلەمە، قیاسـەکەی ئەوان زۆر زۆر

لێک دوورە و هیچ یەکتر ناگرێتەوە، چونکە پێغەمبەری پێشـــەوا (ﷺ) بۆ کارێکی دیاری

کراوی سەربازی بوو محمدی کوڕی مەسلەمەی نارد ڕێگایدا هەندێک قسە و کار بکات

تاوەکو لە ماوەیەکی کەم و کورتدا کەعبی کوڕی ئەشرەف بکوژێ وەکو فێڵی جەنگ.

- پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دەفەرمووێت: **(الحرب خدعة)**[1]

واتە: جەنگ فێڵە.

ئەو کاتە سەری گرت و فێڵیان لێکرد و کوشتیان و لە بنیان هێنا.

جـا زۆر جیـاوازە لەوەی بچیتە نـاو پەڕلەمـان و دانی پێـدا بنێیـت و کوفر و شـــیرکە

بەردەوامیەکە بکەی، وە ئەگەر دەسەڵاتیشت بدرێتە دەست کە نادرێتە دەستت وە میسر و

[1] لە سەحیحی بوخاری (ژ: ٣٣٠) هاتووە، لە سەحیحی موسلیم (ژ: ٤٣٦٠) هاتووە.

جەزائیر و ئەوانە شاهێدن، ئەگەر ئەوانەی کەوا پاشگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندووە لەو ڕێگـایەدا دەریش چن لێ نـاگەڕێن خێری لێ ببینن و هەر بڕوایـان پێیـان نییە و نەکردووە، بە دڵنیاییەوە ئا ئەو کاتە دەبێ جارێکی تریش دەسـەڵات بدەیتەوە ئەبو جەهل ئاسـاکان و جارێکی تر یاسـای نەفامیەت بێتەوە کایەوە ئەگەر تۆ دەرنەچووی لە خولێکی تردا.

٢-سـەرێکی سـەختی کوفری دژ بە الله و بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پێوە لە ناو برا، ئەو هەڵبژاردن و پەڕلەمانەی کەوا دەکرێت نەوەکو سـیسـتەم و یاسـا و سـەرانی عەلمانی و دیموکرا سی و دوژمنانی الله و پێغەمبەری (ﷺ) پێوە لەناو ناچێت بەڵکو پێیوە چە سپیوتر و جوانتر دەبێت و بە بەرچاوی خەڵکەوە تەواو دەڕازێنرێتەوە و بەردەوامیەتی پێ دەدرێت.

٣-لە ڕواڵەت لادان و هەڵگەڕانەوەی تاکی و فەردی بوو وە چەند قسەیەکی دیاریکراویش بوو وەکو فێڵی جەنگ، بەڵام ئەوەی پەڕلەمان و یاسـای دیموکراسـیەت و عەلمانیەت و چوونە ناو ئەو سـیسـتەمە و هەڵبژاردن بە دڵنیاییەوە کۆمەڵییە و هەڵگەڕانەوە و گۆڕینی پرۆگرامە و پێچەوانەی تەوحید و الله بەیەکگرتن و ئیسـلام و بیروبڕوایە، جا لەبەر ئەوە دروسـت نییە دەسـتگرتن بەو خاڵە و بەو شـێوەیە گومان دروسـتکردن بۆ خەڵکەکە، بێشەرعییە و هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە.

**٩-گومانی نۆیەم؛** نەجاشی لە دوای ئەوەی موسڵمان بووە حوکمی نەکردووە بە قورئان و لەگەڵ خەڵکەکەدا کە نەسرانی و کافر بوون ماوەتەوە، ئێمەش وەکو ئەو دەچینە ناو پەڕلەمان و لەگەڵ ئەو بێ بڕوایانەدا دەژین و گەر پێمان نەکرێت حوکم بە قورئانیش تەواو بکەین بەڵکو لە هەندێک خاڵدا بتوانین حوکم بە قورئان بکەین.

**جا ئەو بەڵگە هێنانەوە و ئەو گومان دروست کردنەشیان بەو چەند خاڵانە دەرەوێتەوە:**

١-هیچێک لەو ڕووداوانە ئایەت و فەرموودە نین و بەڵگە تەنها لە ئایەت و فەرموودەی سەحیحی پێغەمبەر (ﷺ) وەردەگیرێ و هەر ئەوان سەر مەشقن و ئەگەرچی هی نەجاشیش وا نەبووە و ئێستا ڕوونی دەکەینەوە.

٢-نەجاشی پاشایەکی بە دەسەڵات و بەرز بوو بەسەر نەسرانیەکان و فەرمان و بڕیارەکانی سەد لە سەد جێبەجێ دەکرا، بە پێچەوانەی ئەندام پەڕلەمانەکان و ئەوانەی دەچنە ناو ئەو پرۆسەیە و بەژداری دەکەن لە ئەنجومەنی یاسا دانان دەبێ ئەوان ملکەچ بن بۆ سیستەم و یاساکانی پەڕلەمان و کوفر و شیرک و گوناح و تاوانەکان نەوەک ئەوان پاشا و خەڵکەکە بگۆڕن و دەسەڵاتدار بن بایی ئەوەندە.

٣-ئەوانەی ئێستا ناتوانن لە سنوری یاساکانی دیموکراسیەت و پەڕلەمان دەربچن و دەبێ بیپارێزن و جێبەجێی بکەن، بەڵام هیچ بەڵگەیەک بە دەسانەوە نییە کەوا نەجاشی (رحمه الله) یاسای کوفری جێبەجێ کردبێ.

**زانایان دەفەرموون لە دوو ئەگەر بەدەر نەبوو هی نەجاشی:**

- ئەو کات تەوڕات و ئینجیلی لە بواری یاسا و شەریعەتدا جێبەجێ دەکرد، هێشتا هەموو حوکمە کانی ئیسلام تەواو دانەبەزی بوو، وە بەویش نەگەیشتبوو، تێکی دەکردەوە لەگەڵ قورئان و حوکمە شەرعیەکان کە پێغەمبەر (ﷺ) هێنابووی.
- نەجاشی ئەوەی پێی گەشتبووبێ جێبەجێی کردووە بەڵام لەو کاتەی موسڵمان بووە کە جیاوازی لە سەرە دیارە ئەوانی تری هەمووی پێ نەگەیشتووە بیانووی هەبووە کە پێی نەگەیشتووە لەبەر ئەوەیە جێبەجێی نەکردووە.

کەواتە هیچ بەڵگەیەک لە بەر دە ستدا نییە کە نەجا شی حوکمی شەرعی پێ گەیشتبێ و جێبەجێی نەکردبێ و سەرپێچی کردبێت.

٤-مانەوەی نەجاشی وەکو پاشا و کۆچ نەکردنی لەسەر فەرمانی پێغەمبەری الله (ﷺ) بووە و بەرژەوەندی مسۆگەری موسڵمانانی تێدا بووە، کە نزیکەی هەشتا موسڵمانی لە

هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) پێیوە پارێزراو بوون و نەیدانە دەســـتی کافر و موشریکەکانی قوڕەیشی.

جا ئەندام پەڕلەمانەکان و ئەو لایەنانەی کە پاشـــگری ئیســـلامیتان بەخۆتانەوە لکاندووە کاتێک دەچنە ناو پەڕلەمان تەنانەت ناتوانن بەرگری لە ئەندامە فێڵ لێکراوەکانی خۆشتان بکەن کاتێک دەگیرێن و ئازار دەدرێن، ئەوە هیچ کە هەر ناتوانن بەرگری لەوانە بکەن کە خاوەن تەوحیدن و پاپەندن بە ئیسلام یان بیان پارێزن، بەڵکو لە جیاتی پاراستن بۆ دڵخۆش کردنی عەلمانیەت و دیموکراســـیەت تا پێتان بڕوا بکەن ئێوە ڕاســـتگۆن لەگەڵیان هەندێک جار دژایەتیشـــیان دەکەن و حەقتان بەســـەریانەوە نییە و پشـــتگوێیان دەخەن یان یارمەتی دەسەڵات و ستەمەکە دەدەن لە سەریان، جا کەواتە ئەو گومانەش هەڵوەشایەوە.

**١-گومانی دەیەم؛** ئەبو بەکری سدیق هەڵبژێردرا و بە هەڵبژاردن کرا بە خەلیفە یان عومەریش لە دوای ئەوەوە، کەواتە هەڵبژاردن لە سەرەتای ئیسلامەوە هەبووە و لە چاخی پێشینان کاری پێکراوە و دروستە و ڕەوایە.

**جا ئەو گومانەش لەم چەند خاڵەدا هەڵدەوەشێنینەوە:**

١-هەڵبژاردن لە ئیسلامدا لە ئەلفەوە تاوەکو یا ئەوەی سەرنجی بدا و تۆزێک خوێندەواری هەبێ دەزانێ کەوا جیاوازە لەگەڵ هی دیموکراسـیەت و ئەو هەڵبژاردنەی سـەردەم، لە ئیسـلام ئەوانەی بەربژێر دەکرێن کەسـی دیاریکراو و تایبەتن وەکو ئەبو بەکر و عومەر دەبێت چەند سیفەتێکی دیاریکراویان هەبێ، بە عەدالەت و دادپەروەربن، علم و زانستیان هەبێ، کەم و کورتییان نەبێ لە لا شە و جە ستە بۆ خەلیفایەتی، کە سی خراپ و بێ بڕوا بە هیچ نەوعێک کاندید ناکرێ و ئەو مافەی پێ نادرێ.

٢-ئەوانەی دەنگیش دەدەن و ڕایـان لێ وەردەگیرێـت کەسـی دیـاریکراون، کە پێیـان دەگوترێ (أهل الحل والعقد) وە ڕایان لەگەڵ دەگۆڕدرێتەوە و لە دوای ڕا گۆڕینەوە ئینجا بڕیار دەدرێ.

٣-لە ئیسـلامدا هیچ ئەنجومەنێک نییە پێی بگوترێ ئەنجومەنی یاسـا دانان، چونکە یاسـا دانان تەنها مافی الله تعالى یە ﴿**إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّـهِ**﴾ لە سوڕەتی الأنعام و سوڕەتی یوسف.

٤-لە هەڵبژاردنی ئەبو بەکری سـدیق (رضي الله عنه) تەنها ڕاوێژ بوو لە نێوان هاوەڵان کرا، بەبێ بەشـداریکردنی ئافرەتان و خەڵکە گشـتیەکە، ئینجا بڕیار درا ئەبو بەکر خەلیفە بێ و لە پاشان خەڵکی بۆ بانگ کرا و بەیعەتی پێدرا.

جا ئەوانە هەر هەمووی ئەوە دەســەلمێنێ ئەوەی ئەوان دەیڵێن تەنها گومان و چەواشــە کردنە و هەڵوەشــایەوە و هیچ بەڵگەیەک لەوەدا نییە کە پێی بچنە ناو ئەو پرۆســەیە و لە یەک خاڵی بچووکیش تێک ناکەنەوە لەگەڵ هەڵبژاردنی دیموکراســیەت و عەلمانیەتی سەردەم و زۆریش لێک دوورن و نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە.

**١١-گومانی یازدەیەم؛** دەڵێن بەشداری کردنمان ناچارییە و ئیکراهە یان پێویستیە و زەرورەتە چونکە ناچارین ئەگەر وانەکەین ئەنداماکانمان دەگیرێن ڕێگامان پێنادرێ... زەررەتێکی ئێستاشە، کەواتە ئێمە ناچارکراوین بەشداربین لەو پەرلەمان و شوێنەدا یاخود بووەتە زەرورەت.

## لە دوو خاڵی سەرەکیدا ئەو گومانە دەڕەوێنینەوە:

١-لە ئیســلامدا ئیکراه بریتییە لەوەی کە ئیبن حەجەر لە (فتح الباري) دەفەرمووێت: زۆر لیکردن (إكراه) بە زۆر ئیلزام و پێویست کردنی غەیرە بە شتیك کە ئەو نایەویت.

وە مەرجەکانی زۆری کردن (إكراه) چوارن:

١-ئەوەی هەڕەشــە و تەهدیدە کە دەکات تواناى هەبێت، بەســەر جێبەجێ کردنی هەڕەشەکەیدا وە ئەو شتەش کە هەڕەشەی لێکراوە بۆ کردنی بە (ووتە یان کردنی) توانای

ڕەتکردنەوە و بەرگری کردنی نەبێت لە خۆی ئەگەر بەهەڵهاتن و ڕاکردن و فیراریش بێت لە دەستی.

٢-گو مانی زۆری وابێت (غلبة الظن) ئەگەر داواکەی ئە نجام نەدا، هەڕەشـــەکەی لەسەرجێ بەجێ بکات.

٣-دەبێت ئەو هەڕەشــە و تەهدیدەی لێی دەکرێ دەســت بەجێ و فەوری بێت، ئەگەر پێی بلێن ئێستا ئە و کارە نەکەیت، سبەینێ ئاوات لێ دەکەم و هەڕە شەکەت بە سەرا جێبەجێ دەکەم ئەوە ئەگەر کارەکە بکات بە زۆر لێکراو (مکره) ناژمێردرێ، بەڵام ئەگەر هەڕەشـەی کاتێکی کەمی لێکرابوو بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە وە ئەوەی هەڕەشـــەکەی دەکرد کار و عادە تی وابوو کە هەڕەشــەکە جێبەجێ دەکات ئەوە ئەگەر ئەم کارەکەی کرد زۆری کراوە و (مکره).

٤-دەبێت لە ئەو کەسەی هەڕەشەکەی لێکراوە شتانێك دەرنەکەوێ کە بەڵگەبن لەسەر ئەوەی کە بەویستی خۆی ئەو کارە ئەنجام دەدات[1].

---

[1] -فتح الباري- (ج: ١٢، ل: ٣١١).

٥-هەندێکی تر دەڵێن ئەو ئامرازەی هەڕە شەکەی پێدەکرێت کە سەکەی پێ بکوژرێت یان ئەندامێکی پێ لەکار بخات یان لێدانی زۆر و توندبێ یان ئاســـان تەحەمول نەکرێ یان زیندانیکردنی دوروو درێژبێت.

ئەمـە مەرجەکـانی زۆر لێ کردن (إكراه) بوو، کە بە دڵنیـاییەوە هیچیـان لەو کەس و لایەنانەی بەشـــداری هەڵبژاردن دەکەن نەهاتوەتەجێ و نایەتەجێ شـــتەکان زۆر لێک دوورن.

لە گریمانەی ئەوەی کە ناچار بکرێن و بڵێین وابێ و ئیکراهیان لەســەربێ، ئەو کات دەبێ کۆچ بکەن لەو شـــوێنە، نەوەک ملکەچ بکەن بۆ نا چاریەکە یان مادەم دەتوانن ڕابکەن، ئەوانە لەجیاتی ئەوەی ڕابکەن دەڕۆن بەرەو چوونە ناو پڕۆسەکە و خۆیان بەناو ئاگرەکەدا دەدەن.

٢-زەرورەتیش لە ئیسلامدا بریتییە لەوەی دەبێ کەسەکە گەیشتبێتە ئەو ئاستەی کە ئەگەر قەدەغە کراوەکە نەکا و نەخوا لەناو دەچێ یان نزیکە لە لەناو چوون[1]، وەکو کەسێک کە پارویەک لە گەرووی مابێتەوە ئەگەر قومێک ئارەق لەوێ بێ دەستی بە ئاو و هیچ شتێکی تر نەگات ئەگەر فرێکی پێوە لێ نەدا و پاروەکەی پێوە قووت نەدا زەنی غالیب ئەوەبێ کە

[1] ئەم وتەیە هی ئیمامی زەرکەشییە و لە -الدر المنثور- هێناویەتی.

دەخنکێ ئەو کاتە بایی ئەوەندە بۆی دروســـتە، چونکە **(الضرــورات تقدر بقدرها)** بە ئەندازەی خۆی بۆی دروست دەبێت نەوەک بەردەوام بۆی دروستبێ بیکا و بەکاری بێنێت هەر ئەوەندەی کە پێویستێتی ڕێگای پێ دەدرێ.

کەواتە ئەوە گومانێکە نەک زەرورەت نییە و ناچار نەکراون، بەڵکو باوەشیان بۆ کردوەتەوە و کۆمپانیایەکە بەرەو لای دەچن و بژێوی ژیانی دونیایان پێی دابین دەکەن، لەبەر ئەوەیە ئەوەندە قەڵســـن کاتێک کە بەرگری دەکرێ و ڕاســـتیەکان ڕو،ون دەکرێتەوە لەوەی کە بەشداربن لە هەڵبژاردن و لە پەڕلەمان.

**١٢-گومانی دوازدەیەم؛** دەڵێن ئەو باس و بابەتە باس و بابەتێکە کە زانایان قسەیان لێ کردووە و ڕا جیاوازی لێ دروست بووە و کۆ دەنگی لەسەر نییە، کەواتە نابێت ڕێگری بکرێت و ئینکاری لەو شتانە بکرێت کە ئیختیلافی لەسەرە لە پاشان ئێمە بەو ڕایە دەکەین و قەناعەتمان بەو ڕایە هەیە کە دروستی دەکات.

**ئەو گومانەش بەو خاڵانە دەڕەوێنینەوە:**

١-بە گوێرەی هەڵوەشـــاندنەوەی بەڵگەی ئەوانەی خاوەنی ڕای یەکەم بوون کە گووتیان دروســـتە بۆمان دەرکەوت ڕای یەکەم هیچ بەڵگەیەکیان لە دەســـت نەبوو، وە ڕای یەکەم ئەوانە بوون کە یان بە نەزانینەوە بووە و لە ماهیەتی باس و بابەتەکانیان نەدەزانی یان لە

کۆتایدا کە بۆیان ڕوونکراوەتەوە لە فتوا و بۆچوونەکانیان پاشـــگەز بوونەتەوە، ئەگەرنا

ئەوانیش تەنها مرۆڤێکن هەڵەیەکە کردوویانە ئەگەر کەسەکە زاناش بێ بە دڵنیاییەوە هەڵە

دەکات، جا ئەوە ســەنگی مەحەک نییە لە شــتێک کە دەمە دەمی تێدابێ ئێمە قســەی

لێنەکەین و ڕێگری لێ نەکرێ و بە هەریەک لە ڕایەکان بە کەیفی خۆمان بکەین.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا**﴾ **(النساء : ٥٩)**

واتە: ئەگەر ناکۆک بوون لە شتێک بیگەڕێننەوە بۆ لای الله تعالی و قورئانەکەی و بۆ لای

پێغەمبەر (ﷺ) و فەرموودەکانی ئەگەر ئێوە بڕواتان هێناوە بە الله تعالی و ڕۆژیی دوایی.

٢-باس و بابەتی جیاواز دەبێ بەرهەڵســـتی لێ بکرێ و ڕێگری لێ بکرێت، ئەوەتا ئیبن

قەیمی جەوزی (رحمه الله) فەرموویەتی: **(خطأ من يقول لا إنكار في مسائل الخلاف)**[١]

واتە: ئەوە هەڵەیە کە کەســێک بڵێ ئینکاری و بەرهەڵســـتی ناکرێ لە باس و بابەتە

ئیختیلافی و جیاوازیەکان.

٣-باشــە ئەی بۆچی ئێوە وەکو پیرە ژنی دۆ لێ ڕژا و هەر پرتە و بۆڵەتانە، زۆر بە توندی

ڕێگری لەو ڕاو بۆچوونــانە دەکەن کە قەدەغەی هەڵبژاردن و بەشـــداریکردن تێیــدا و

---

[١] لە -إعلام الموقعين- ئیبن قەیم لە (ج: ١، ل: ٣٧٣) هێناویێتی.

دەنگدان و پەڕلەمان دەکەن و بە خاوەنەکانیان تۆمەت دەبەخشنەوە و بێ ڕێزییان بەرامبەر دەکەن، دەڵێن ئەوانە بەرگری کاری عە لمانیەتن! ئا ئەوانە نا یانەوێ حوکمی ئیسـلام بگەڕێتەوە! چەندەها قسـە دروسـت دەکەن و دەیڵێن، چونکە بەڵگەتان لە دەسـت نییە، کەواتە قسەی خۆتان بەڵگەیە لەسەر خۆتان.

دەسـتان گرتووە بە تەنها گێڕانەوەی قسـەی هە ندێک لەوانەی کە گوتوو یانە جائیزە، هە ندێک جاریش کە لێی دەکۆڵیتەوە وانییە، وە بە داخەوە زۆرجاریش مە ندیل لەبەرە جوبە لەبەرەکان ئەوانەی مەیلیان هەیە بەلای یەکێک لە لایەنەکان کە بەلعام ئاسـا ئەمڕۆ عەدەت و ژمارەیەکی زۆریان بەخشراونەتەوە وەکو گۆشـتی خێر، هەر لایەن و کەسـێک بەشـی خۆیانی لێیان بردووە و هەموویان مەلا و مەندیل بەسـەر و جوبە لەبەری خۆیانیان هەیە، کاتێک کە دەڵێن ئەوە پێویسـتییە ئەوەندە سـەد زانایە ئاوایان فتوا داوە و وایان گووتووە برۆ لەگەڵی دابنیشە نە پێنا سەی پەڕلەمان دەزانێت نە دەزانێت زانایەکان کێن نە دەزانێ ئایە ئەوانەی وایان گوتووە ئاسـتیان ئاسـتی ئەوەیە پێیان بگووترێت زانا بە مەرجە شەرعیەکان و زەوابیتەکانەوە وە لە کوێ وایان گوتووە و لە چ سەرچاوەیەکدایە هیچیان بە دەسـتەوە نییە، مەگەر لەناو لایەنەکاندا چەند کەسـێک لە ئەنتەرنێت و شـتی تر هەندێک شـتیان کۆ کردبێتەوە، بەبێ تەحقیق و لێکۆڵینەوە ئەوان دەیکەنە سـەرچاوە و لەسـەری

دەڕۆن، دەبێ لە اللە تعالى بترسن بگەڕێنەوە لای اللە تعالى ئەوانە خۆ یان گومڕان و خەڵکیش گومڕا دەکەن پێغەمبەر (ﷺ) ئێمەی لێ ئا گادار کردوەتەوە کە دەفەرموو ێت: **(أَنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمُ الْأَئِمَّةُ الْمُضِلُّونَ)**[1] واتە: لە هەموو شت و کەسێک زیاتر ئەوەی دەترسێم لەسەر ئومەتەکەم ئەو پێشەوایە گومڕا گومڕا کەرانەن.

**١٣-گومانی سێزدەیەم؛** دەڵێن کاکە دیموکرا سیەت و پەڕلەمان ڕێک وەکو شورای ناو ئیسلام وایە و لە زۆر شت لەیەک دەچن، ئەوەتا لە ئیسلامیشدا ڕاوێژ کردن و شوراکردن هەیە.

## ئەو گومانەش بەو خاڵانە دەڕەوێتەوە:

١-شورا لە ئیسلامدا وشەیەکی عەرەبیە و چەمکێکی قورئانییە، بەڵام هەرچی دیموکراسیەت و پەڕلەمان وشە و چەمکی خۆر ئاوایە و ئەوروپییە.

٢-لە شورادا دەسەڵاتی تەشریعی بۆ اللە یە بەڵام لە پەڕلەمانی دیموکراسیدا دەسەڵاتی تەشریعی بۆ خەڵکە.

[1] ئەبو داود لە سونەنەکەی هیناوێتی (ژ: ٤٢٥٢) فەرموودەیەکی سەحیحە.

٣-شورا تەنها لەو باس و بابەتانە ڕاوێژ دەکات کە ئیجتیهاد و کۆشەش کاری لێ دەکرێت نەک لە دەقە کانی قورئان و فەرمووده ڕاوێژ بکات، بەڵام پەڕلە مان و دیموکراسیەت دەربارەی هەموو باس و کارێک ئەگەر بیروبڕواش بێ و پیرۆزیش بێت قسە دەکات.

٤-شورا تەنها لە نێوان کۆشەش کاران و موجتەهیدەکان و ئەهلی حەل و عەقدە، بەڵام پەڕلە مان لە نێوان هەموو چین و توێژە کانە کافر و مونافق و بێ بڕوا و زانا و نەفام و داوێنپیس و خراپ.

٥-شورا ڕایەکان بەڵگە و دەلیل یەکلایی دەکاتەوە، بەڵام لە پەڕلەماندا ڕایەکان زۆرینەی دەنگ یەکلایی دەکاتەوە.

٦-لە شورادا دەنگدان نییە لە سەر شتێک دەقی قورئان و فەرمودەی لە سەر هاتبێ، بەڵام لە پەڕلەمانی دیموکراسیدا زۆربەی حەرامکراوەکان بە زۆرینەی دەنگ حەڵاڵ دەکرێن.

٧- شورا ئاینی الله یە و دەبێ بڕوامان پێی هەبێت، بەڵام دیموکراسیەت و پەڕلەمان ڕێباز و ئاینێکی عەلمانیەت و مرۆڤ کردە زادەی بیر و هۆشی مرۆڤە، کەواتە پێچەوانەی ئیسلامن و طاغوتن و دەبێ بڕوامان پێیان نەبێ و کافر بین پێیان.

٨-شورا لەسەر ڕای پەسەندی زانایان پێویستە بەڵام پابەند کەر نییە بۆ فەرمان ڕەوای موسڵمانان و خەلیفەی موسڵمانان سەد لە سەد پێیەوە پابەندبێ دەتوانێ لە دوای ڕاوێژ و

شوراکەش ڕەئیەکی تری خۆی هەبێ بەڵگەی لە دەستدابێ و پێی لەسەر دابگرێ و ئەو جێبەجێکات، بەڵام لە پەڕلەمان و دیموکراسیەتدا ئەو یاسایانەی کە لە پەڕلەمان دەردەچێت بە زۆرینەی دەنگ یەکلا دەکرێتەوە کەس و هیچ لایەک بۆی نییە هەڵی بوەشێنێتەوە و پێیوە پاپەند نەبێ، دەبێت شەرعیەتی پێ بدرێ.

ئەوانە هەندێک بوون لە جیاوازیەکانی نێوان شورا و پەڕلەمان، جا تێکەڵکردنیان بە یەکتر بە دڵنیاییەوە ئەوە تێکەڵ کردنی حەق و باطڵە تێکەڵ کردنی نا ڕەوایەتی و ڕەوایەتییە لە یەک کاتدا، وەک ئەوە وایە بڵێی شەو و ڕۆژ وەک یەکە و تێکەڵ یەکن.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَلْبِسُوا الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُوا الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ **(البقرة : ٤٢)**

واتە: ڕاست و ڕەوا تێکەڵ مەکەن بە ناڕەوا و درۆ، حەق و ڕاستی مەشارنەوە لەکاتێکدا کە خۆتان ئەمە دەزانن.

- لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ **( ال عمران : ٧١)**

واتە: ئەی خاوەن نامەکان بۆ پۆشاکی درۆ ئەکەن بەبەر ڕاستیدا، وەڕاستەکە دەشارنەوە لە کاتێکدا خۆشتان ئەمە دەزانن.

جا الله تعالی فەرمانی کردووە بڕوا نەهێنین بە جگە لە ڕێباز و ئاینی الله و کوفر بکەین بە طاغوت، ئینجا ئەوەی وابکات دەســـتی گرتووە بە قوڵپی بەهێزی (لا اله الا الله): ﴿**فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللهِ فَقَدِ اسْـتَمْسَـكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى**﴾ **(البقرة : ٢٥٦)** واتە: ئەوەی کافر بێت بە طاغوت و بڕوا بێنێت بە الله تعالی دەســـتی گرتووە بە قوڵپی بەهێزی ئیسلام کە (لا إله إلا الله) یە.

جا ئەوەی شورا و دیموکرا سی و پەڕلەمان یەکسان بکات وەکو ئەوە وایە کە بەدیهێنەر و بەدیهێنراو واتە خالیق و مەخلوق بە یەکسان.

ئەوەتا لە مەیدانی حەشر و حیساب و قیامەت و جەهەنەمدا لێی پە شیمان دەبێتەوە کە الله تعالی دەفەرموویێت: ﴿**قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِــمُونَ * تَاللهِ إِنْ كُنَّا لَفِي ضَــلَالٍ * نُسَوِّيكُمْ بِرَبِّ الْعَالَــمِينَ**﴾ **(الشعراء : ٩٦-٩٨)** واتە: بت پەرستان لە کاتێکدا لە دۆزەخدا شــەڕە قســە و ئاژاوەیانە (لەگەڵ پەرســتراوەکانیان دا) دەڵێن * ســوێند بە الله ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بووین * کاتێك ئێوەمان دەبردە ڕیزی پەروەردگاری جیهانیانەوە.

جا نابێ پەڕلەمان و یا سای دە ستکرد و دیموکرا سی و عەلمانیەت بێنینە ئا ستی ئی سلام و دینی الله تعالی و قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر نا بەو شێوەیە لێی پە شیمان دەبینەوە و الله تعالی لێمان قبوڵ ناکات.

ئێستاش دێینە سەر ئەوەی بزانین حوکمی بەربژێر و دەنگدەر لە ئیسلامدا و لە ڕوانگەی قورئان و فەرموودە چییە و چییان بەسـەر دێت و وەک چۆن لە قەڵەم دەدرێن و زانایان چییان فەرمووە.

## حوکمی بەربژێر و دەنگدەر

لەو توێژینەوەی کەوا خستمانە بەر دە ستان بۆتان دەرکەوت کەوا دوو ڕا هەبوو، بەڵام ڕای تەواو و دروســـتتر لەگەڵ ڕاو بۆچوونی دووەم دابوو کە قەدەغە و حەرامی کردبوو بە کوفری دەزانی و هەر ئەویشـــیان پەســـەند و تەواو بوو بە هەموو بەڵگەکان کە ڕوونمان کردەوە.

**جا خاوەن ئەو ڕاو بۆچوونەی دووەم ئەوانیش جیاوازن لە حوکمدان بەسەر بەربژێر و دەنگدەر، بەو شێوازەی خوارەوە:**

١-لایەنی کەم ئەو کەسەی کەوا خۆی بەر ژێر دەکات یان دەنگ دەدات و بەشداری ئەو پڕۆسەیە دەکات گوناحبار و تاوانبارە.

٢-هەندێکیشـــیان دەیگەیەننە ئەو ئاســـتەی کە دەڵێن کافر دەبێت، بەس بە ڕەهایی کوفرەکەیان بەسەردا دەگوترێت و بە تەعین و دیاریکراوی کافر ناکرێن.

٣-هەندێکی تریشیان دەڵێن نەخێر بە تەعین و دیاریکراویش کافر دەکرێن، بەڵام هەندێک ڕوونکردنەوە و دوور و درێژی هەیە بۆ ئەو کەسەی کە دەنگدەرە، بەڵام بۆ ئەو کەسە نییە کە خۆی بەربژێر کردووە.

جا ئەوانەی کە خۆیان بەربژێر کردووە یان ئەوانەی بە تەمان دەنگ بدەن یان دەنگیان داوە و دەدەن با ئاگاداری خۆیان بن و لە الله بترسن و بگەڕێنەوە و ئەو حوکمە شەرعیانە لە خۆیاندا نەهێننەجێ.

## بەربژێر دوو ڕای سەرەکی لەسەرە:

١-کارەکە کوفرە و بە ڕەهایی کافر دەکرێن، بە تەعین و دیاری کراویش دەبێ درێژەیان پێ بدرێت، بەو شێوازی داهاتوو کە باسی لێوە دەکەین.

٢-کارەکەی کوفری گەورەیە، دەربچێت یان دەرنەچێت بە کافر دادەنرێت و لە ئیســـلام دەردەچێت و بە دیاریکراوی و تەعینی کافر دەبێ و بیانووی نەفامی و عوزر بە جەهل یشی بۆ نییە.

## درێژەی ڕای یەکەم لەسەر حوکمی بەربژێر (المرشح):

ڕای یەکەم ئەوانەی کە دەڵێن کوفری ڕەهایە و دەبێ درێژ بکرێتەوە و تەعین ناکرێ و دیاری ناکەین بە دیاریکردن کەسەکە پێی کافربێ، بەو دورووو درێژیە قسەی لێدەکەن.

**هەنـدێـک لە زانـایـان بەربژێر دەکەنە چوار جۆر ســـەبارەت بە حوکمـدانی شەرعی لەسەریان:**

**١- جۆری یەکەم؛** ئەگەر چووە ناو پەڕلەمان یاسـایەکی دانا کە پێچەوانەی شـەریعەتی ئیسـلام بوو یان ڕێککەوت و ڕازی بوو لەسـەر یاسـایەکی پێچەوانەی شـەرع یان دەنگی بۆدا، ئەوە هاوبەش بڕیار دەر و موشریک و کافرە، بیانووی نەزانین و نەفامی و عوزر بە جەهل و تەئویل کردن یان بەرژەوەندی بۆ نییە.

- الله تعالى فەرموویەتی: **﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَـمْ يَأْذَنْ بِهِ اللهُ﴾ (الشورى : ٢١)**
- یان فەرموویەتی: **﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لله﴾ (يوسف : ٦٧)**
- یان فەرموویەتی: **﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾ (الكهف : ٢٦)**

**٢- جۆری دووەم؛** ئەندام پەڕلەمان ئەگەر بچێتە ناو پەڕلەمان و سـوێند بخوات لەسـەر ڕێزگرتنی دەسـتوری کوفری، زانابێت بەوەی لەناو دەسـتورەکەدا هەیە لە پێچەوانەکانی شـەرعی الله، ئەوە کوفر و هەڵگەڕانەوەیە (واتە مورتەد دەبێ و کافر دەبێ ئەگەر پێشـتر موسـڵمان بووبێ)، جا بە جدی بێت یان جگە لە جدیەت، بە چاکی دانابێ یان نا، بێگومان کوفری کردووە بە زانایی و بە ئەنقەست بە هەڵبژاردنی خۆی، وەکو ئەوە وایە کە سوێندی

لەســەر ڕێز لێنانی لات و عوزا خواردبێت، یان ســوێندی لەســەر ڕێز لێگرتنی یاســاكانی قوڕەیشــی ســەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) خواردبێت، واتە وەكو ئەوە وایە بڵێ ســوێند دەخۆم لات و عوزا بەڕێزن! دەیان پارێزم! بەرگرییان لێ دەكەم! لە بتەكان، لە ســەنەمەكان، لە كوفرەكان، لە شیركەكان! وایە.

جا دەڵێن ئەوەشــیان هەر كوفرە بە كوفری گەورە بە دیاریكراوی كافر دەبێ و لە ئیســلام دەردەچێ و هەڵدەگەڕێتەوە عوزر بە جەهل ی بۆ نییە.

**٣- جۆری سێیەم؛** ئەم بەشەیان یەكێك لە زانایان كە هێناویێتیەوە (شیخ علي خضير) ە ڕەنگە نە هەبووبێ و نە بشــهێتەجێ ئاســان یانی وەكو گریمانەیەك دانراوە، دەڵێ گەر ســوێندی نەخوارد لەســەر ڕێز لێنانی دەســتور و یاســا دانان، وە بەشــداری نەكات لە یاساكانی پێچەوانەی شەریعەت، بەڵكو ڕەتی بكاتەوە و دەنگی لە دژ بدات، ئەوە هەڵەیە و گومڕاییە و پێچەوانەی ڕێبــازی پێغەمبەری كردووە (ﷺ) بۆ چــاكســــازی و گۆڕین و بەرپاكردنی دەوڵەتی ئیسلامی، بەڵام كافر نییە ئەگەر ڕێگای گومڕایی و هاوبەشی گرت بە ڕێگا بۆ بانگەوازی و بۆ گۆڕین و چاكسازی.

- الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ**﴾ **(یونس : ٣٢)**

واتە: لە دوای حەق و ڕەوایەتی هیچ ڕێگا و شتێكی تر نییە جگە لە گومڕایی.

کەواتە لێرە ئەو مەبەســـتی ئەوەیە دەڵێ گوناحبارە تاوان بارە گومڕا بووە بەس نەچووەتە بازنەی کوفر و پێیەوە کافر نابێ، لەو کاتەدا کە هیچ سوێندێک ناخوا لەسەر دەستورەکە و هیچ یاسایەک دەر ناکات و دەنگیشی بۆ نادات کە پێچەوانەی ئیسلام بێ بەڵکو دەبێت لە دژیشی بوەستێتەوە.

جا ئەوە نییە و لێی قبوڵ ناکرێ هەر لە سەرەتاوە، بەڵام دەڵێ لەبەر ئەوە گوناحبارە چونکە ڕێگایەکی جیای لە ڕێگای پێغەمبەر (ﷺ) گرتوەتە بەر بۆ چەســپاندنی حوکمی ئیســلام و گۆڕانکاری و چاکسازی و بە حیساب پاکسازی.

جا ئەگەر سەرنجی ئەو جۆر و بە شەی سێیەم بدەین بە دڵنیاییەوە تاوەکو ئێستا نە بوونی هەیە و نە بە ئاســـانیش دێتەجێ، کە بتوانێت ســـوێند نەخوات و لەگەڵ یاســـاکانی دژ بە ئیسلام نەبێت و بە ئا شکرا ڕەتیان کاتەوە و لە دژیان بوە ستێتەوە، بە دڵنیایی سەرۆکایەتی پەڕلەمان و ئەندامەکانی تر و ســـیســـتەمەکەش ئەوەی لێ قبوڵ ناکات، ئەوە تەنها ئەگەر دانانێکە.

**٤- جۆری چوارەم؛** لە خاوەن ئەو ڕایانە بەربژێر دەکەنە دوو جۆر:

- **جۆری یەکەم؛** هەر کەس و لایەنێک کە موســڵمان بێت و ئیســلامیانە بیر بکاتەوە و گومان و تەئویلاتی زۆر و بەناو بەڵگەی هەبێت و سەری لێ شێوابێت، ئەوە ڕێگاکە و

کارەکەی کوفرە، بەڵام بە دیاریکراوی کافر نابێت، تاوەکو بیانووی نەبڕێت و حوجەی لەسەر نەکرێت و گومانەکانی نەڕەوێنرێنەوە.

- **جۆری دووەم؛** ئەوەی زاڵبێت بەسەر خلیسکان و هەڵەکانی و گومان و تەئویلاتەکان و بەڵگەکانی لەلابێ بە دیاریکراوی کافرە و تەعین دەکرێ، چونکە مەوانیع و قەدەغەکانی کافر کردنی تێدا نەهاتوەتەجێ و مەرجەکانی کافر کردنیشی لێ هاتوەتەجێ.

## ڕاو بۆچونی زانایان لەسەر حوکمی دەنگدەر (الناخب):

دەنگدەریش بەڕێزان خەتەر ناکە ئاگاداربن ئەوانەی بەشداری دەکەن و بە تەمان دەنگ بدەن یان دەنگتان داوە بزانن دەنگدەر یەعنی (الناخب) زانایانی خاوەنی ڕای دووەم دەنگدەر بۆ دوو جۆر دابەش دەکەن:

**١-جۆری یەکەم؛** ئەوەی تێی گەشتبێ و بەشداری هەڵبژاردن بکات و دەنگ بدات بە نوێنەرێک و لە جیاتی خۆی ڕەوانەی بکات بۆ ئەوەی یاسا دابنێت یان دەنگ بدات و ڕازی بێت لە سەر یا ساکان کە دژ بە ئیسلامن، ئەوە کافر دەبێت و لە ئیسلام دەردەچێت، مەگەر ناچار کرابێ و ئیکراهی لەسەر بێت بە مەرجەکانی ئیکراه و ناچارییەوە، یانی کەسێک گیرابێ تفەنگی لەسەر ڕاگیرابێ بڵێن ئەگەر بەشداری ئەو دەنگدانە نەکەیت و وا

نەڵێی و وا نەکەی ئێمە دەتکوژین، کە ئەوەشـــیان ئاســـان نییە و نەبووە، خەڵکەکە بە هەڵبژاردنی خۆی و بە دڵی خۆی دەچێ.

جـا دەڵێن ئەگەر ئیکڕاهی تێـدا نەبوو بە مەرجەکـانی ئیکڕاهەوە، ئەو کەســە بزانێ هەڵبژاردنەکە بە مانای ئەوەیە ئەندامێک بۆ پەڕلەمان هەڵدەبژێری کە یاســای دژ بە ئیسـلامی تێدایە و بڕیار دەدرێ، ئا ئەو کەسـە کە دەنگیدا پێیوە کافر دەبێت و لە ئیسـلام دەردەچێت.

**٢-جۆری دووەم؛** نەیزانیبێت کە بەربژێرەکە دەبێتە ئەندام پەڕلەمان و یاســا دادەنێت پێچەوانەی ئیسلام یان بە یا سایەک ڕازی دەبێت و دەنگی لە سەر دەدات کە پێچەوانەی شەرعی ئیسلامە، بەڵکو وا تێگەشتووە لەبەر خزمایەتی دەنگی پێدەدا یان لەبەر ئەوەی کە واتێگەیەندراوە کە خزمەت گوزاری بۆ دابین دەکات ڕێگا و بان جادە مەعاش و فلان شـــتی بۆ چاکدەکات، ئەوە لەبەر نەزانین و شـــارەزا نەبوونی بە کاری پەڕلەمان و حاڵی پەڕلەمان و یاســاکان و پرۆســەکەیەوە نەک لەبەر نەزانین و عوزر بە جەهل بەوەی کەوا شـیرکی کردووە و شـیرکی نەناسـیووە ئێمە موشریک و کافری ناکەین، بەڵکو ئەو زانایانە دەڵێن لەبەر ئەوەی ئەو حاڵی پەڕلەمانەکەی نەزانیوە و حوکمەکەی نەزانیوە و کارەکەی نەزانیوە، بەخۆی کەســەکە موسـڵمان بێ تەوحیدی هەبێ و کافر نەبووبێت، ئەوە تەنیا

گو ناحی تووش بووە، ئەگەر لەو پێناوەدا وایکرد و دەنگەکە یدا و بەشـــداری کرد، وە ڕا ستیەتی ئەنجومەنی یا سا دانانی بۆ ڕوون نەبوو بوویەوە، بەڵام لە دوای ئەوەی کە سێک بۆی ڕوونکردەوە و تەواو حاڵی کرد و تێی گەیاند و بەڵگەکانی بۆ هێناویەوە کە کاری یاسا دانان و دژ بە ئیسلامی تێدایە، ئەوە ئەو کات ئەگەر هەر پێداگیری کرد لەسەر دەنگدان و بەشداری کردن، بە دەنگدان و بەشداری کردنەکەی کافر دەبێت و لە ئیسلام دەردەچێ.

**پرسـیار:** ئایە ئەوانەی دەبنە ئەندام پەڕلەمان و دەر دەچن و لەو دەزگایانەی هەن، جائیز و دروســـتە ها نا یان ببردرێتە لای، لە دوای دەرچوونیان بەبێ ئەوەی دەنگت پێ دابن و بڕوات پێ هێنابن و لەگەڵیاندا بووبیت، بۆ کار و باری مو سڵمانێک کە گیرابێ یان ستەمی لێکرابێ تاوەکو ئەو ستەمەی لەسەر لا بچێت؟

**وەڵام:** زانایان فەرموویانە ئەگەر داننەنێت بە ئەندامێتی و کوفر و گوناحەکانیەوە و هیچ مەرجێکی لەســـەر نەبێت و دانەبەزێت لە بیروبڕوا و عەقیدەکەی تەنها بۆ ئەو داواکارییە بچێتە لای کە ستەمەکە و گوناحەکەی لە سەر لابدات یان بەری بدات مو سڵمانەکە، ئەوە دەڵێن جائیز و دروســـت و ڕێگا پێدراوە، هەرچەندە هەندێکیشـــیان دەڵێن چاکتر وایە ئەوەش نەکرێ، با کەسەکە تەرجیح نەبێ و کەیفی بەخۆی نەیەت و نەیکاتە پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن، لەو کاتەدا کەوا جارێکیتر بەشداری دەکات و هەڵدەبژێردرێتەوە.

## ڕای پەسەند لەسەر حوکمی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن:

ڕای پەسـەند لە هەردوو ڕایەکان کە لە سـەرەتا گووتمان ئایە دروسـتە بەشـداریکردن یان نادروسـتە، کە ڕای یەکەم ڕێگایان پێدا و هەندێک پێیان واجب و دروسـتیش بوو، ڕای دووەم قەدەغەیان کرد و پێیان کوفر و شیرک بوو، لەو دوو ڕایانە دەڵێین ڕای دووەم ڕاست و دروسـت و پەسـەندە کە گووتویانە حەرامە و قەدەغەیە و کوفر و شـیرکە هەڵبژاردن و دەنگدان بۆ ئەنجومەنی یاسا دانان، لەبەر ئەو خاڵانەی کە ئێستا دەیخەینە بەر دەستتان:

١-ڕای یەکەم بەڵگە هێنانەوە کانیا نمان هێنایەوە بە ئایەت و فەرموودە کانیشـەوە کە کردبوویانە بەڵگە زۆر لاواز و بێجێ بوون، پشت بەستن پێیان بەڕاستی تەواو نەبوو، تەنها ئەوەندەیان هەبوو کە بڵێن بەرژەوەندی و زەروورەتە، بەرژەوەندی و زەرورەتیەکەشـیان بە تەواوەتی پوچەڵ کردەوە و هەڵمان وەشاندەوە، هیچ بەرژەوەندی و هیچ زەرورەتێک گرنگتر نییە لە تەوحید و الله بەیەکگرتن، کاتێک کە ڕێگای شیرک بگریتە بەر بۆ بەرژەوەندییەکی کەم دروست نابێ.

٢-ئەو خراپیانەی ژماردمانن لە کۆتایدا و خلیسکانەکان لە ئەنجامی بە شداری پرۆ سەی هەڵبژاردن و دەنگدان و ئە ندامێتی پەرلە مان کە دەکەوێتەوە، زۆر گەورە بوون و تەنها یەکێکیان بەسە بۆ ئەوەی لێی دوور بکەویتەوە و بڵێی حەرامە و قەدەغەیە و نابێ بکرێت.

٣-لەبەر ئەوە ئەو ڕایە مان پەســـە ند کرد و پێمان وایە هەر ئەوە دروســـتە، بەڵگە زۆر و بەهێزەکانی ڕای دووەم بوو، کە ڕا شکاوانە ڕوونمان کردەوە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە ســـەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و ســـەلماندنی واقیعی خراپی کارەکە و ئەنجامی خراپی.

## ڕای پەسەند دەربارەی بەربژێر و دەنگدەر:

١-بەربژێر کافر دەبێ و لە ئیســـلام دەردەچێت دەربچێت بۆ ئە ندامێتی پەڕلە مان یان دەرنەچێت، مادەم دانی ناوە بە یاساکانی کۆمیسیۆن و دیموکراسی و بڕوای پێیان هێناوە و لە پڕۆسەکەدا بەشداری کردووە.

٢-دەنگدەریش ئەوە ڕای پە سەندە ئەوەی تێی گە شتووە بەبێ حوجە لە سەر کردنیش ئەوە کافر دەبێت کە بە شداری بکات و دەنگ بدات، وە ئەوانەی نەزان و غەریب حاڵیشن، بە ڕاســـتی نازانن پەڕلەمان و یاســـا دانان چییە و لە دۆڵێکی تر دەژین لەو دونیایەدا ناژین و شارەزا نین کە یا سای دژ بە شەریعەتی ئیسلامی لێ دەردەچێ و کاری سەرەکی پەڕلەمان بریتییە لە یا سا دانان و تەشریع کردن کە ئەوەش تەنها مافی الله تعالى یە، بە ق سە زاق و بریقە کانی کاتی پڕو پاگە ندەی هەڵبژاردن خەڵە تاوە یان بە ڕیش و بە مە ندیل و جوبەی کاندیدەکان و ئەو خەڵکانەی کە پشـــتگیرییان لێدەکەن خەڵەتاوە یان بە حیجابی ئەوانەی

کەوا خۆیان هەڵبژاردووە لە ئافرەتان و پاشگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندووە و خۆیان کاندید کردووە خەڵەتاوە یان بەو پڕو پاگەندانەی کە دەڵێن خزمەتتان دەکەین، ئەوانە بەڕاستی لە دوای ئەوەی ڕوونکردنەوەیان بۆ بکرێ و بیانووبڕ بکرێن و حوجەیان لەسەر بکرێ ئەو کات پێیان دەڵێین ئەوە ڕاجیح و پەسەندە کافر دەبن و ئەگەرنا لە پێشتردا پێیان ناڵێین کەوا بە دیارکراوی کافرن و کافر دەبن.

## نامەیەکی کراوە و چەند ئامۆژگارییەک بۆ بەربژێر و دەنگدەران:

ســـەرە تا ڕوو یان تێ دەکەین و دەڵێین گوێی خۆ تان بکەنەوە و دڵی خۆ تان بکەنەوە بۆ چاکەی خۆتان هەســـتی لێ ڕابگرن و ڕووتان تێ دەکەین و پێتان دەڵێین لە دوای ئەوەی کەوا ئەو باس و بابەتەمان بە ڕێکوپێکی لە دیدگای قورئان و فەرموودە و بە هێنانەوەی وتەی زانایان بە تێگەیشـتنی سـەلەفی ئوممە بۆتان باسـکرد، ئێسـتا داواتان لێ دەکەین گوێیان بۆ بگرن بۆ چەند ئامۆژگارییەک و ئەو نامەیە، بەڵکو ســـوود و کەڵک و قازانجی قیامەتتان پێش دونیا لێی وەربگرن، نامەکەمان سەرەتا بۆ بەربژێرە و دواتر دەنگدەران.

## چەند ئامۆژگارییەک بۆ بەربژێر:

ئەی ئەو کەســـەی کەوا خۆت هەڵبژاردووە و ئەو کەســـەی کەوا خۆت پاڵێوراو کردووە گوێیان لێ ڕابگرە، چەند گرنگە مرۆڤ کاتێک تەرخان بکات بۆ لەخۆپرســـینەوە و بەســـەر خۆدا چوونەوە، تاوەکو هەڵە و کەم و کورتیەکانی بۆ دەرکەوێت و وازیان لێبێنێ و بە چاکە شوێنیان پڕ بکاتەوە، وەک پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب فەرمووی: **(حا سبوا أنف سكم**

**قبل أن تحاسـبوا)**[1] واتە: لێپرسـینەوە لەگەڵ خۆتان بکەن پێش ئەوەی کە لێپرسـینەوەتان لەگەڵ بکرێت.

پێش ئەوەی لە دەسـتت بچێت و الله تعالی لە مەیدانی حەشر و حیسـاب ڕات بگرێت و بفەرموو یت: ﴿**وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْـئُولُونَ**﴾ **(الصـا فات : ٢٤)** واتە: ڕا یانگرن ئەوان بەرپرسن لەوەی کردوویانە و گوتوویانە لە ژیانی دونیایاندا.

بە قەد خەم خۆریت بۆ ژیانی دونیات و سیا سەت و حیزب و لایەن و کۆمەڵەکەت، ژیانی دواڕۆژ و قەبر و قیامەتت بێنە بەرچاوت و خەمی لێ بخۆ، خۆت بوەسـتێنە و خێرا مەبە لە بەشـداریکردن و ئەنجامدانی ئەوەی دێتە پێشـت و بۆت دەڕەخسـێت، تاوەکو نەزانی ئایە کارەکەی تۆ کە دەیکەی با شە و سوودی قیامەتی هەیە و ڕوو سوری بۆ قیامەتت؟ یان بە پێچەوانەکەیەتی و هەم لە دونیاشـدا ڕوو ڕەشـییە و لە قیامەتیشـدا بەدبەختییە و بەرهەمی چوونە دۆزەخە.

چەندێک گەڕام و هەوڵم دا دڵنیابە ئەی بەربژێر لە پێناو الله تعالی و دڵسـۆزانە بۆت کە ڕێگایەک بدۆزمەوە بۆ ئەوەی دەر بازت بکات، لە دواڕۆژ وەڵامت بە دەسـت بێت لە مەیدانی حەشر و حیساب و لایەنی کەم مۆڵەت و ڕووخسەت بێت بۆ کاری بەربژێریت و

[1] -کنز العمال- (ژ: ١٤١١٤)

بوونت بە ئەندام پەرلەمان نە لە قورئان و نە لە فەرمووده سـەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و نە لە تێگەیشـتن و بیرکردنەوەی پێشـینانی چاک و سـەلەفی صـاڵح و ڕێگای ئەو زانایە بەڕێزانەی کە فتوایان هەیە لە زانایانی متمانەی پا شین و خەلەف هیچێکم دە ست نەکەوت بۆت، کە ڕێگات پێ بدات ئەو کارە بکەیت، بەڵکو هەمووی ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە کارێکی یەکجار ترسناکە دە ستت داوەتێ و خۆت بۆ هەڵبژاردووە و بۆ دواڕۆژ و قیامەتت تیا چوونی لە دوایە.

دە ژیرانە ورد بەوە و بزانە ئەوەی تۆ بە تەمای و دەتەوێت ئەنجامی بدەی ئایە بریتی نییە لەوەی سیفەتی یا سا دانان لە الله تعالی بسێنیتەوە و بیدەیتە ئەنجومەنی یا سا دانان؟ واتە نەهێڵی الله تعالی تەشریع بکات و بڵێی قبوڵم نییە و یاسا دانان و تەشریع کردنی پەرلەمانم قبوڵە، بە دڵنیاییەوە وایە.

با بەیەکەوە بڕوانینە مادەی ژمارە پێنجی دەسـتوری عێڕاقی بزانە چیمان بۆ دەردەکەوێت لە دەسـتوری عێڕاقی مادەی پێنج هاتووە دەڵێ: **(السـيادة للقانون، والشـعب مصـدر السـلطات وشرعيتها، يمارسـها بالاقتراع السري العام المباشر وعبر مؤسـسـاته الدستورية)** واتە: سەروەری بۆ یاسایە، گەلیش سەرچاوەی دەسەڵات و شەرعیبوونیەتی،

کە بەهۆی دەنگدانی ڕاستەوخۆ و نهێنیەوە لە ڕێی داموو دەزگا دەستووریەکانەوە ئەنجامی دەدات.

کەواتە ئەوە ڕاشـــکاوانە ســـیفەتی یاســـا دانان لە الله تعالی لادەدات و دایداتە دەســـتی ئەنجومەنەکە و گەل پەنا بە الله تعالی.

جا بتەوێت یان نەتەوێت ئەوە بەر بەرەکانێ کردنی ڕاستەوخۆی الله تعالی یە لە یەکێک لە سیفەتە تەواو و سەرەکیەکانی، جا بزانە ئەوەی ئاوا دەکات بە دڵنیاییەوە عەزابی الله تعالی مســـۆگەر دەکات بۆ خۆی و ئەو کاتە ئەو ئایەتە دەیگرێتەوە، گوێ بگرە الله تعالی چیت پێدەڵێت: **﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَـــمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ﴾ (الشـورى : ٢١)** واتە: ئاخۆ ئەو (بێ باوەڕ) انە هاوبەشـــانێکیان هەیە ئاینێکیان بۆ داناون کە الله ڕێگەی پێ نەداوە.

گوێ بگرە دەرگای دڵت بکەرەوە و ســـەرنج بدە دەزانی مانای چییە و دەبیتە چی؟ مانای ئەوەیە تۆ لە ئەنجومەنەکەدا کە ئەندامی دەڵێی من ئەو یاســـایەم دەوێ کە دژە بە قورئان و فەرموودەکانی الله تعالی.

بۆ نموونە ڕیبا کە الله تعالی حەرامی کردووە ئەوانیش ڕیبا دەدەنە دەنگدان و تۆ تەنها ئەوەت بۆ هەیە دەســـت بەرزکەیتەوە و لەگەڵیدابیت کە ڕیبا نەبێ وەکو الله تعالی دایناوە

یان ئەو کاتە ناڕەزاییەکی ڕواڵەتی دەربڕی و لە کۆتاییەکە شیدا بە دەنگی زۆرینە کە یەکلا دەبێتەوە تۆش دەبێ جێبەجێیکە یت و لەو کۆڕ و مەجلیســە ئامادەی کە ئەو حەڵاڵ و حەرامانەی تێدا دەکرێ بە پێچەوانەی حەڵاڵ و حەرام کردنەکانی الله تعالی.

الله تعالی فەرموویەتی دەستی دز ببڕێت و زیناکەری نێر و مێ ئەگەر هاوسەرگیرایەتیان نەکردبوو جەڵدەیان لێبدرێت، بەڵام ئەنجومەنەکە کە تۆ بە تەمای بچیتە ناوی یاساکان کە دادەنێ لە بری یاســا کانی الله تعالی ســزا و یاســا بە دڵی خۆیان بۆی دادەڕێژن و دەیچەسپێنن بەسەر خەڵکی، ئەی ئەوە بەر بەرەکانێی الله تعالی و سیفەتی تەشریعی الله تعالی نییە کە هەر ئەو مافی تەشریعی هەیە؟

ڕەنگە نەفس و شــەیتان ئەوەت بۆ بڕازێنێتەوە و پێت بڵێت ئەگەر تۆ بە کردار لەوێدا پشتگیری یا ساکان نەکەیت و پێچەوانەی شەرعی الله نەکەیت سیفەتی تەشریع و یا سا دانان ناتگرێتەوە، بزانە ئەوە فێڵی شــەیتانە و گوێی پێ مەدە ورد بەوە، تۆ مادەم دانت ناوە بەوەی پەڕلەمان باشــە و گرێبەســتی ئەوەت کردووە کە ئەندامبیت لێی، ئەوە بە دڵنیاییەوە ســیفەتی یاســا دانانت پێدراوە، هەر چوونت بۆ پەڕلەمان دانپێدانانی ئەوەت بۆ مســۆگەر دەکات، تەماشای هەنگاوەکانت بکە دەزانی و دەردەکەوێت کە یەکەم هەنگاوی کرداریت لە دوای دەرچوونت و بوونت بە ئەندام پەڕلەمان یەکەم پەیژە کە لێی ســەردەکەویت بۆ

ئەنجومەنی یاسا دانان سوێند خواردنە لەسەر ڕێزگرتن و پاراستن و پاپەند بوونی دەستور و یاساکان، چ دەستورێک؟ چ یاسایەک؟ ئەو دەستور و یاسایانەی کە زۆرینەیان کوفر و شیرکن لایەنی کەم ڕێگا خۆشکردنە بۆ گوناح و تاوان و فاحیشە.

جا سەرنج بدە و بزانە سوێند خواردن لەسەر گوێڕایەڵی و بەیعەتدان بە سەرۆکی پەڕلەمان و سەرۆکی وڵات ئەگەر پاپەند بوون بە دەستور و یاسا لە چوار چێوەی دەستور و یاسای عەلمانی و دیموکراسی و پەڕلەمان ئا ئەوانە هەموویان دژن بە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرمان (ﷺ) کەواتە تۆ دەبیتە یەکێک لە دینگە و ئەستوندەکانی ڕاگرتنی سەقف و بینای عەلمانیەت و دیموکراسی و دەستور و یاساکانی بێشەرعی و دژ بە الله و پێغەمبەر (ﷺ) و قورئان و فەرموودە.

نەکەی گوێ بدەی بە فێڵی شەیتان نەفست بیانووت بۆ بێنێت و پێت بگرێت، من بە نیاز و نیەتی باش چووم و بەرگری لە ئاینی الله تعالی دەکەم لە خودی خۆم باشم و ئەوەتە دەبینی چەندین کەسی باش مەندیل بە سەر و جوبە لەبەر و ڕیشدار و ویندار بە ڕواڵەت تیایدا ئەندامە.

بزانە دەست هەڵبڕینت و هاتوو هاوارت لە دژی کار و یاساکانی پێچەوانەی شەرع، تەنیا جوانکاری و بەهارات پیاداکردنی دیموکراسی و ئەنجومەنی یاسا دانانە، تۆ وەکو بیبەری

تیژ وای لەسەر سفرە و خوانی خواردن، کاتێک کە کەسێک بیبەری تیژ دادەنێ، ڕاستە کەم و کورتە بیبەری تیژ زۆر نایەتە بەر چاوان، تیژیشە و ناخۆشە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا کە دایدەنێن بۆ ڕازاندنەوەی سفرەکانە، کاتێک بیبەرەکەش دەخورێ ڕاستە ئەو کاتە تامی تیژایەتی بەو کەسانەی کە دەیخۆن پێیان دەگات، هەر بەخۆشیان لەسەر سفرەیان دانابوو بەڵام ئەوەندەی بیبەرە تیژەکە زەرەر دەکات کاتێک دەخورێ و لەناو دەچێ، ئەو کاتە ئەوانی تر تام و بۆنی خواردنەکانی خۆیانیان پێ خۆشکردووە و هیچ زەرەر و زیانێکی ئەوتۆیان لێ نەبینیوە تەنها سوود و قازانجیان لێ بینیوە بۆ ئەوەی کە کارە کوفر و شیرک و عەلمانیەت و دیموکراسیەتەکەی خۆیانی پێوە بڕازێننەوە.

بزانە و سەرنج بدە الله تعالى چی بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی دەفەرمووێ: ﴿**لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ**﴾ **(الزمر : ٦٥)** واتە: تۆ ئەی محمد (ﷺ) ئەگەر شیرک و هاوبەشی بکەی بە دڵنیاییەوە عەمەل و کردەوەکانت هەر هەمووی هەڵدەوەشێنینەوە تۆ لە زەرەر بارانی.

تۆ چی؟ ئەی هاوار بە ماڵمان دۆڕان بۆ ئەوانەی بە سادە و ساکاری دەڕواننە کار و شتە هاوبەشییەکان و شیرکییەکان، ئەگەر پەروەردگار وا هەڕەشە لە خۆشەویسترین کەس

بکات بە لایەوە، دەبێ چی بەسەر خەڵک و کەسانی تر بێنێت؟ با تا زووە بەخۆمان بگەین

و هەڵەی وا نەکەین.

پێم بڵێ چۆن شـــەو و ڕۆژ لە یەک کاتدا کۆ دەبێتەوە؟ ئەندامیەتیت بە زمانی حاڵ بە

خەڵکی دەڵێیت من سەرمەشقی کۆ کردنەوەی دژ و پێچەوانەکانم، شیرک و ئیسلام پێکەوە

کۆ دەکەمەوە! چاکە و خراپە پێکەوە دەهێنمەجێ! من پێشـــەوا و پێشـــەنگی بیانوو و

هەنجەتی گووتن و کردنی قەدەغەکراو و حەرام کراوەکانم کە حەڵاڵ دەکرێن.

بشزانە کۆبونەوە و دانیشتنت لەگەڵ هاوبەش بڕیار دەرانە و لەگەڵ ئەوانەیە کەوا پیسن و

گوناحکارن، گوێگرتنە لێیان و بە هاوڕێ دانان و برادەرایەتی ئەوانە، بزانە بە دەمیانەوە

پێدەکەنی دڵت پێیان خۆشدەبێ، لەگەڵیان هاوتا دەبی بزانە ئاگاداربە هەندێک جار دەچیتە

ســـەر ڕێگا و ڕێبازی ئەو، جا بزانە و تەماشـــا بکە الله تعالی فەرموویەتی: **﴿وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ (الأعراف : ٢٨)** واتە: وە کاتێ کردەوەیەکی زۆر بەد و ناشرینیان

دەکرد دەیان وت: لە باو و باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە وە الله فەرمانی ئەو (کردەوە) ی

پێ داووین (ئەی موحەممەد(صـــلی الله علیه وســـلم) بڵێ بێگومان الله فەرمان نادا بە

کردەوەی بەد و خراپ ئایا بەدەم الله وە شتێ دەڵێن کە نایزانن و بێ ئاگان لێی؟

جا ئەوەی لەو ئەنجومەنە دەكرێت سەرنج بدە و تەماشا بكە تۆ باشتریش لە من دەزانی شیرک و کوفرە یان گوناح و تاوانە یان ڕێگا خۆشکردنە بۆ گوناح و تاوان و شیرک و کوفر و فاحیشە و خراپە.

بزانە دۆستایەتی و دوژمنایەتی دەبێ بۆ الله بێ لەبەر خاتری الله بێ، كە هەر ئەوەشە سەنگی مەحەک بۆ تیاچوونت یان بۆ بردنەوەت لە دواڕۆژدا، كە بە ئەندامیەتیت لە ئەنجومەنی یاسا دانان خۆشەویستیت بۆ الله دەبێتە خۆشەویستی بۆ پەڕلەمان بۆ سەرۆکی وڵات بۆ دەستور و یاسا بۆ وڵات و خاک بۆ گەل و ئاڵا و پەرچەمی عەلمانیەت و دیموکراسیەت، لە بری برایەتی و دۆستایەتیت بۆ موسڵمانانی دەست بە دەستنوێژی خاوەن تەوحید و دیندار برایەتی و دۆستایەتیت دەبێت بۆ کافر و هاوبەش بڕیار دەران و دووڕوان و تاوانبار و گوناحکاران.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(أوثق عرى الإيمان : الحب في الله والبغض في الله عز وجل)**[1] واتە: پتەوترین قوڵپی ئیمان و بڕوا خۆشەویستییە لە پێناو الله و تورەبوونە لە پێناو الله.

[1] زانایان دەفەرموون ئەم حەدیسە زەعیفە بەڵام ماناکەی سەحیحە.

بزانە و سەرنج بدە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(الرجل على دين خليله، فلينظر أحدكم من يخالل)**[1] واتە: پیاوان لەســەر ئاین و ڕێبازی برادەر و هاوڕێیەکانن، ســا بڕوانن هەر یەکێک لە ئێوە دۆستایەتی و هاوڕێیەتی کێ دەکات.

الله تعــالى یش بڕانــدویەتیەوە و فەرموویەتی: **﴿وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾** **(المائدة : ٥١)** واتە: ئەوەی دۆستایەتی و پشتیوانی کافر و جولەکە و نەسڕانیەکان بکات ئەوە لەوانە.

جا بەڕائەت و دوژمنکاریت بۆ کەســـانی پابەند بە ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) و بانگخواز بۆ الله و الله بەیەکگرتن و تێکۆشەر و جەنگاوەر لەپێناو الله تعالى کە دەیانەوێ وشەی (لا إله إلا الله) سەر بخەن و بڵندی کەن و بەرزی بکەن، بزانە ئەوەی وابێت خاک بەسەری! خاک بەســەری و هاوار بە ماڵ و حاڵی! بۆ ئەو ڕۆژەی الله لە دونیادا ئاینی خۆی ســەر دەخا و الله بەیەکگران تەمکین دەکا و بەرز و بڵند و چەقیویان دەکا و پشتگیرییان دەکات لە دونیادا، لە دواڕۆژیش ڕووبەڕوو بوونەوەی پرسـیار و وەڵامەکانی حەشر و حیســاب و دادگای الله تعالى و عەزاب و ئاگری دۆزەخ.

---

[1] لە سونەنی ئەبو داود (ژ: ٤٨٣٣)، لە ترمزی (ژ: ٢٣٧٨).

ئەوەی دەستنیشانم کرد و نوختەم تیایاندا خستەسەرپیت تەنها چەند نموونەیەک بوو، ئەی بەربژێر ئەی ئەوەی کەوا دەتەوێ ببیتە ئەندام پەڕلەمان ئەوە بۆ بەرچاو ڕوونکردنەوە بوو هەڵوەشاندنەوەی فێڵ و تەڵەکەی شەیتان بوو، وە هەڵوەشاندنەوەی بیانووە ئارەزوەییەکانی نەفس بوو بۆ بەشداریکردن و ئەندامێتی بوونت لە پەڕلەمان.

جا ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی ژیانی قیامەتت و خۆ شکردنی ناو گۆڕ و بەڵگە بە دە ستیت بۆ مەیدانی حەشر و حیساب بە هیچ کار و پلە و پایەیەکی دونیا مەیگۆڕەوە هیچت بە کەڵک نایەت لە هانات نایەت.

ئەگەر الله تعالی تۆی بە تاک و تەنیایی و ڕووت و قوتییەوە وەستاند و پێت بڵێت بۆچی مافی یاسا دانانت بە من ڕەوا نەبینی؟ کە تەنیا من شایستە بووم یاسا دابنێم، بۆچی لە جیاتی من ئەو مافەت بە ئەنجومەنی یاسا داناندا و تیایدا بووی بە ئەندام؟

بڕوانە لەو ڕۆژەدا ڕا ستیەکان نا شاردرێنەوە، ئەندامەکانی مرۆڤ دەبنە شاهێد بە سەریەوە لەناو ئەو هەموو خەڵکە بە دیاری پێغەمبەر (ﷺ) و فریشتەکانەوە ناتوانی ڕا ستی نەڵێیت یان ڕاکەیت و خۆت بشاریتەوە، چۆن و بە چ وەڵامێک وەڵامی الله تعالی ی بەدیهێنەری خاوەن دەسەڵاتی بەرزی مەزن دەدەیتەوە؟ ئای لەو ڕۆژە ترسناک و سامناکە کە بەسەرماندا دێت.

ئەگەر بە ملی پێشـــەوا گومڕایە گومڕا کەرەکانیشـــدا بیهێنیت یان ســـەرکردە و فەرمان ڕەوایە کانت: **﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا وَرَأَوُا الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ * الَّذِينَ اتَّبَعُوا لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا مِنَّا كَذَلِكَ يُرِيهِمُ اللهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ وَمَا هُمْ بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ﴾ (البقرة : ١٦٦-١٦٧)** واتە: کاتێک کە پێشەواکان یەخە هەڵئەتەکێنن لەوانەی (لە دونیادا) دوایان کەوتوون وە سزایان (بەچاوی خۆیان) بینی وە هەموو پەیوەندییەکیان بچڕایەوە * وە ئەوانەی کە دوایان کەوتبوون وتیان خۆزگە ئێمە بگەڕاینایەتەوە (بۆ دونیا) تا یەخەمان لێ هەڵبتەکاندنایە هەر وەک(ئەوان) یەخەیان لە ئێمە هەڵتەکاند ئاوا الله کردەوەکانیان نیشاندەدا و دەبێتە کۆڵ و کەسەر بۆیان وە ئەوان دەرچوونیان نیە لە ئاگر.

لە ڕۆژی دوایدا ئەوانەی کەوا سەرپەرشتیارن و پێشەنگن و سەرکردەن، لەگەڵ ئەوانەی بە دوا یان کەوتون و هەڵخەڵە تاون لە جە ماوەر و خەڵکەکە ئەگەر ئە ندام پەڕلە مان و بەربژێر و ســەرکردە و پێشــەوا یان ئەوانەی کەوا مەندیل بەســەرن و جوبە لەبەرن هەڵیان خەڵە تا ندوی ئا لەو کاتە و لەو مە یدانەدا تەبەڕات لێدەکەن بێ بەرایەتی خۆ یان لە تۆ ئاشکرا دەکەن ئەو کاتیش هیچ دەسەڵاتێک و سەبەب و هۆکارەکان نامێنێن ئەو کاتە پێتان دەڵێن ئێمە نەبووین ئێوە بەخۆتان هەڵتان بژارد.

ڕاســـتە ئەو کات ئێوە دەڵێن ئای ئەگەر ڕۆژێکی ترمان هەبوایە بگەڕابواینەوە دونیا چۆن ئەوان بێ بەرایەتی خۆ یان لە ئێمە ڕاگەیاند ئێمەش بەو شـــێوەیە لێیان بێ بەری دەبین جارێکی تر بە قســـەیان ناکەین و ناخەڵەتێین و خۆمان بەربژێر ناکەین و ئەو کارە ئەنجام نادەین بەڵام هەی هاتە هەی هات! ئەوەت بۆ نییە اللە تعالی تۆڵەت لێ دەســـتێنێتەوە و حیسابت لەگەڵ دەکات و ئا ئەوەیان تۆ و ئەوان تووشی ئاگری دۆزەخ دەکات.

سەرنج بدە و تەماشا بکە ئەگەر اللە تعالی پێت بڵێ بۆچی سوێندت خوارد لەسەر ڕێزگرتن لە پاراســتن و پاپەندیت بە دەســتور و یاســاکانی زادەی مرۆڤ و هەوا و هەوەســەکانیان، باشـــە پێغەمبەرم بۆت نە ناردبوو قورئانم بۆ دانەبەزا ندبوو؟ هەموو بیانوە کانی ئێوە یان نەبڕیبوو؟ فەرمانم پێتان نەکردبوو کە شوێن موحەمەد و (ﷺ) قورئانی پیرۆز بکەون؟ ئەوم دانەنابوو وەک سەرمە شقێکی چاک بۆتان و هەموو ڕا ستیەکانتان تێ بگەیەنێت و تێ شی گەیاندن؟

وەڵامت چی دەبێت بۆ ئەو پرسیارە لەو ڕۆژەدا؟ تەنها ئەوەت دەمێنێ کە بترسی و شەرم و شـــەرمەزاری و ترس دات بگرێ، بۆچی ڕێزت لە اللە تعالی و پێغەمبەرەکەی و ڕێبازەکەی نەگرت؟ بۆ هەوا و هەوەس و پۆســـت و دونیا و پارە و پولت بە پێش ئەوانەوە خســـت؟ دە تامکە عەزابەکەم بچێژە ئازار و ئەشکەنجەکان.

بۆچی پێش بڕیار و فەرمانەکانی من و پێغەمبەرەکەم کەوتی؟ بڕیار و فەرمانی جگە لە هی ئێمەت پێش خست و دە ستت پێیانەوە گرت، ئەی بۆم نەناردبووی و داوام لێ نەکردبووی کە الله تعالی دەفەرمووێ لە قورئاندا دام بەزاندبوو: ﴿**وَمَا كَانَ لِــــمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَىـ اللهُ وَرَسُـولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ**﴾ **(الأحزاب : ٣٦)** واتە: بۆ هیچ پیاوو ئافرەتێکی باوەڕدار نییە کاتێ الله و پێغەمبەرەکەی بڕیاری هەر کارێکیان دا (بۆیان نییە) کە سەرپشك بن لە کارەکەیاندا وە هەر کەس سەرپێچی الله و پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بە گومڕا بوونێکی ئاشکرا.

دەبێ چ وەڵامێکت هەبێ و چ ترسێک داتبگرێ، چۆن ئارەقەی شەرمەزاری بیارێنی و بڕێژیت، کە هیچت بۆ ناکرێ، مەگەر خۆزگەی گەڕانەوە بۆ دونیا و دژایەتی کردنی کوفر و شیرک و گوناح و تاوان و بەرهەڵستی و ڕێگری بکەی لە هەڵبژادن و ئەندامێتی بۆ چوونە ناو پەڕلەمان و دوورکەوتنەوە لێیان، بەڵام هەی هاتە هەی هات! ئەوە نایەتە جێ و دار و درەختی خۆزگە بە دڵنیاییەوە بەرناگرێت.

الله تعالی دەفەرمووێ: ﴿**حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْـمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ * لَعَلِّي أَعْمَلُ صَـالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِـــمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ**﴾ **(المؤمنون : ٩٩-١٠٠)** واتە: ئەو کاتەی دەگەنە سەرە مەرگ (گوناحکار و تاوانکار و

بەربژێر و ئەوانەی کە کوفر و شیرکیان کردووە یان نیفاق و دەغەڵی و دووڕوییان کردووە لە سەرە مەرگدا لە کاتی گیان کێشان و ڕۆح کێشان) دەڵێن ئەی پەروەردگارم بمگێڕەرەوە بۆ دونیا * بەڵکو کردەوەی چاك بکەم (لە بری ئەوەی نەمکردووە) لەو تەمەنەی لەدەستم چوو نەخێر بێگومان ئەمە (ی دەیڵێ) تەنها قسەیەکە ئەو دەیڵێ (ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ دونیا هەروەك جاران دەبێت) و لە بەردەمیاندا بەرزەخێك (بەربەستێك) هەیە تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێنەوە.

بزانە الله تعالی فەرموویەتی: ﴿**لِلَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمُ الْحُسْنَى وَالَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُ لَوْ أَنَّ لَهُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لَافْتَدَوْا بِهِ أُولَئِكَ لَهُمْ سُوءُ الْحِسَابِ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ**﴾ **(الرعد : ١٨)** واتە: بۆ ئەوانەی وەڵامی بانگەوازی پەروەردگاریان دایەوە (پاداشتی) هەرە چاك (بەهەشت) هەیە ئەوانەش وەڵامی بانگەوازی (پەروەردگار) یان نەدایەوە ئەگەر هەرچی وا لە زەوی دا هەمووی هی ئەوان بێ ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێت دەیدەن لە بریتی و بەدەڵی سزای ڕۆژی دوایی ئەوانە بۆیان هەیە لێپرسینەوەی سەخت و خراپ و جێگایان دۆزەخە ئای کە چەند شوێنێکی خراپە.

تاوەکو نەمردوویت ئەی بەربژێر ئەو ڕۆژەت بەسەردا نەهاتووە فریای خۆت بکەوە بگەڕێوە بۆلای الله تعالی پەشیمان بەوە ڕێگا و ڕێبازی تەواوی پێغەمبەر (ﷺ) بگرە بەر، نەوەک لە

ڕۆژێکدا کە مردیت ئەو کۆشک و تەلار و ڤێلا و ئۆتۆمبێل و زێڕ و زیو و مرواری و زەوی و کۆمپانیاکان کە پەیدات کردووە بە ڕێگای بێشـــەرعی بە مەعاش و پارە و پولی خەڵکی یان بە پەڕلەمان و بە پۆستەکان لەسەر حیسابی دین و الله تعالی و ئاینی ئیسلام ئەوە ئەو کاتە هیچ سوودیان نابێ و هەر بیبەخشە و بیکە فیدا تەنیا عەزاب و ئە شکەنجەکان بۆت زیاتر و زۆرتر دەکات.

ئەوە بە گشـتی بۆ هەموو بەربژێرەکان بوو، ئێسـتاش دێینە سـەر چەند ئامۆژگارییەک بۆ مەندیل بە سەرە جوبە لەبەرەکان، ئەوانەی کەوا لە ئامۆژگارییەکانی ڕابردوو با سمانکرد بە دڵنیاییەوە پێویستە بۆ ئەوانەش کەوا مەندیل بە سەرن جوبە لەبەرن یان خۆیان ناو ناوە بە بانگخواز کە دەچنە ناو ئەو پرۆسانە یان خەڵکی هان دەدەن بۆ بەشداریکردن.

## چەند ئامۆژگاریەک بۆ مەندیل بەسەرە جوبە لەبەرەکان:

پێتـان دەڵێین بەربژێرە مەنـدیـل بەســـەرە جوبە لەبەرەکـان ئەی ئەوانەی لە ڕێگـای بانگخوازییەوە خۆتان بە خەڵکی ناساند، تەماشا بکەن ئێوە لە ڕێگای بانگەوازی و مینبەر و میحراب خۆتان ناسـاند بە خەڵکەکە و سـەرنجی خەڵکیشـتان ڕاکێشـا، بەبێ پارە و پول سەرفکردن و بەبێ ماندوو بوونێکی زۆر ئێوە کرانە پێشەنگ ناسران و ناوبانگتان دەرکرد، جا بزانن گوناحتان مەزنترە تاوانتان گەورەترە ئەگەر ئەو کار و ئیشـــە و بانگەوازیەی کە

کردتان بۆ الله تعالی نەبووبێ و تەنها بۆ ئەوە بووبێ پۆستی پێ بە دەست بێنن و خەڵک دەنگتان پێبدا، سەرنجی ئەو خاڵانە بدەن:

١-خەڵک و جەماوەر بۆ ئەوە بە دواتان کەوتووە تاوەکو ڕێگای ڕاستیان پیشاندەن و پێشەنگی چاکبن بۆیان و سەرمە شقایەتیان بۆ بکەن، نەوەک ببنە تۆڕی ڕاو بۆ لایەنێک و کۆمەڵێکی سیاسی داوی دەنگ و زۆربوونی جەماوەر و شوێنکەوتنیان بۆ بنێنەوە.

٢-وەک ئەوە دێنە بەرچاو کە شوفێری نەفەر هەڵگر یان شەمەندەفەرێکبن خەڵکی بانگ بەوەی دەیانبەنە بەهەشت و لە دۆزەخ دووریان دەخەنەوە، خەڵکەکە بە دواتان دەکەوێ و سواری بارهەڵگرەکەی ئێوە یان شەمەندەفەرەکە دەبێ لە ناوەڕا ستی ڕێگادا سوکان بەرەو پەڕلەمان بەرەو پۆ ست و سیا سەت بەرەو پارە و پول بەرەو بەرژەوەندی کە سی و لایەنی دە سوڕێننەوە و ئەوان و خۆ شتان تووشی خراپە دەکەن، کە بەخۆتان ڕێگاتان لێ ونبووە و گومڕابوون خەڵکیش گومڕا دەکەن.

سەرنج بدەن پێغەمبەر (ﷺ) پێتانی فەرمووە: **(إنما أَخْوَفُ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي الأَئِمَّةَ الْمُضِلُّونَ)**[١] واتە: لە هەموو شت و کەسێک زیاتر ئەوەی دەترسێم لەسەر ئومەتەکەم ئەو پێشەوایە گومڕا گومڕا کەرانەن.

---

[١] ئەبو داود لە سونەنەکەی هیناویتی (ژ: ٤٢٥٢) فەرموودەیەکی سەحیحە.

ئایە نەتان بیستووە لە پەرتووکە شەرعیەکان و فیقهیەکان کاتێک زانایان قەدەغەی ئەوەیان کردووە دینداری نیشـان بدرێت بە ڕواڵەتی و قورئان بخوێندرێت لەو شـوێنانەی کە کڕین فرۆشـتنی لێدەکەن تا خەڵک سـەرنجیان ڕابکێشرێ بێن شـتەکان زیاتر لە ئێوە بکڕن و متمانەتان پێ بکەن، ئا ئەوانە قەدەغەیە چونکە لە پەنای دین نابێ دونیا بخورێ.

ئایە نەتان بیسـتووە پێشـینانی چاک کاتێک کە دەچوونە بازاڕ لە کاتی کڕین و فرۆشـتنی شت و مەکەکان و لە کاتی مەعامەلەی دونیا ئا ئەو کاتە ئەگەر کە سێک کەمتر شتێکیان دا بانێ و بە نرخی کەمتر بۆیان حیسـاب کردبان ڕەتیان دەکردەوە و دەیانگووت با ئەوە لەبەر ئەوە نەبێ کە ئێمە دیندارین یان زانای ئاینین، نەوەک بەوە حیساب بکرێ لە پەنای دین و بە ناوی دین شتمان وەرگرتووە و دونیامان خواردووە.

ئێوە دەبێ لە دەرەوەی پرۆ سەی سیا سی سەردەم و هەڵبژاردن و دیموکرا سیەت بێن ببنە سـەرمەشـقی چاک بەناو خەڵکیدا بسـوڕێنەوە وەکو پێغەمبەری پێشـەوا (ﷺ) بوێرانە ڕاشـکاوانە هەموو لایەن و کەسـەکان بدوێنن و پێیان بڵێن **(قولوا لا إله إلا الله تفلحوا)** نەوەک پێیان بڵێن وەرن دەنگمان پێبدەن بمان نێرنە ناو پەرلەمان پارەی زۆر و پۆستی چاک وەربگرین و بۆ خۆمان لە دونیای خۆمان بە کاری بێنین و ئێوەشـی پێوە هەڵخەڵەتێنین، هەموو پۆست و دەسەڵاتێک ڕەتبکەوە نەتهەوێ وەکو پێغەمبەر (ﷺ) مەبە ئەندام لە دەزگا

و شوێنەکان، نەک ئەوانەی کە ئەبو جەهل ئا سا لەو سەردەمەدا هەڵسوکەوت دەکەن بە گەڵیان کەوی.

چاوەڕوانی هیچ پادا شت و پۆست و دراوێک مەبن لە بەرامبەر بانگەوازیەکەتان، خەڵکی فێری الله بەیەکگرتن و دوورکەوتنەوە لە هاوبەشـــی بکەن، ڕەوشـــتی جوانیان فێر بکەن کاری با شیان پێ نیشاندەن حەڵاڵ و حەرامەکانیان پێ بنا سێنن بیریان بخەنەوە لە پێشی پێشـــەوەبن بۆ فەرمـان بە چـاکە و ڕێگری لە خراپە و بەرپـاکردنی حوکمی قورئـان و فەرموودە کانی پێغەمبەر (ﷺ) و ڕز گار کردنی چەوســـاوە کان و وەرگرتنەوەی مافە زەوتکراوەکانیان لە ستەمکاران، نەوەک ببنە دار و دە ستە و ئەندامی لایەنێکی دیاریکراو بەلعام ئاسا لایەک سەربخەن بە سەر لایەکەی تر یان بە سەر موسڵمانان و دۆعای چاکیان بۆ بکەن و دۆعای خراپیش لە بەرامبەرەکانیان بکەن.

ئێوە خۆتان تەنیا بە الله بفرۆشن و پاداشت لەو داوا بکەن وەکو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والســلام) کردوویانە، بە دڵنیاییەوە لە هەموو لایەکەوە بۆتان باشـــترە و قســـەشـــتان چاکتر دەڕوا و ڕەخنەکانیش گوێی لێدەگیرێ و الله تعالی ش پشـــتگیری کارتان دەبێ و ئەو کاتە بە دڵنیاییەوە پۆستی میراتگرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە هەموو پۆستێک گەورەترە بە هیچ شتێکیت نەگۆڕیوەتەوە و ئەو کاتە تۆ شوێنکەوتەی پێغەمبەری (ﷺ).

خاک بە سـەرمان! لە دواڕۆژ باری قورسـایی گوناحەکانی خۆمانمان پێ هەڵناگیرێت نەوەک هی خەڵکیشـمان بێتە سـەر کەسـانێک بێن ڕێگامان پێ بگرن بڵێن ئێوە پێشـەنگی خراپ بوون بۆمان و بۆچی واتان لە ئێمە کرد.

با چاو بکەین لە پێشـەنگە چاکەکانمان ئەوانەی زانابوون دانابوون چۆن لەگەڵ سـەرکردە موسڵمانەکان هەڵسوکەوتیان دەکرد کە گوناح و تاوان و ستەمێکیان لێیان دەبینی.

سەرنج بدەن کاتێ کەوا (أبو عوثمانی الوا سطي) ئەو زانا پیاو چاکە بە ڕێزە لە سەردەمی نورەدین مەحمود زەنکی چ شـعرێکی بۆ دەخوێنێتەوە و چۆن نورەدین مەحمود زەنکی لە یەکێک لە هەڵەکان و گوناحەکان پاشگەز دەکاتەوە کاتێ پێی دەڵێ:

**(مثل وقوفك أيها المغرور**

وێنەی وەستانت بکێشە ئەی لە خۆبایی

**يوم القيامة والسماء تمور**

لە ڕۆژیی قیامەتدا کە ئاسمان دەجوڵێ

**إن قيل نور الدين رحت مسلما**

گەر گوترا ڕووناکی ئاین موسڵمانت حەسانەوە

**فاحذر بأن تبقى وما لك نور**

وریابە لەوەی بمێنیتەوە و ڕووناکیت نەبێ

**أنهيت عن شرب الخمور وأنت في**

کۆتات هێنا بە مەی خواردنەوە تۆ لەناو

**كأس المظالم طائش مخمور**

کاسی چەوسانەوەدا سەرەڕۆ و سەر خۆشی

**عطلت كاسات المدام تعففا**

لە کارت خست کاسەکانی مەی بەخۆ پاککردن

**وعليك كاسات الحرام تدور**

کاسەکانی حەرام بەسەرتەوە دەسوڕێ

**ماذا تقول إذا نقلت إلى البلى**

چ دەڵێیت ئەگەر گوزرایەوە بۆ ڕزین

**فردا وجاءك منكر ونكير؟**

بە تەنیایی مونکەر و نەکیرت هاتنێ؟

**ماذا تقول إذا وقفت بموقف**

چ دەڵێیت ئەگەر لە جێگەی وەستان وەستای

**فردا ذليلاً وحساب عسير؟**

زەلیل و تەنیا بووی لێپرسینەوەت توند و گرانبێ؟

**وتعلقت فيك الخصوم وأنت في**

دژەکانت پێتەوە نوسابن و تۆش لەناو

**يوم الحساب مسلسل مجرور**

ڕۆژی لێپرسینەوە ڕاکێشراوی زنجیر کراوی

**وتفرقت عنك الجنود وأنت في**

سەربازەکانت لێت جیابونەوە تۆش لەناو

**ضيق القبور موسد مقبور**

تەنگەبەری گۆڕەکان ڕاکشاوی ژێر گڵ کراوی

**وودتت أنك ما وليت ولاية**

خۆزگە دەخوازی هیچ فەرمان ڕەوایەتیەکت نەبا

**يوماً ولا قال الأنام أمير**

ڕۆژێ ئادەمیزادیش پێیان نەگوتبای ئەمیری

**وبقيت بعد العز رهن حفيرة**

لە دوای شکۆ مایەوە کەوتیە قۆرتێ

**في عالم الموتى وأنت حقير**

لە جیهانی مردندا تۆ کەم و هیچی

**وحشرت عرياناً حزيناً باكياً**

زیندوکرایتەوە بە ڕوتی و خەمباری و گریان

**قلقا وما لك في الانام مجير**

و شپرزەییەوە کەسێک نییە لە ئادەمیزادان پارێزەرتبێ

**أرضيت أن تحيا وقلبك دارس**

ڕازیت تۆ بژیت و دڵیشت پوکانەوە

**عافى الخراب وجسمك المعمور**

و وێرانی بۆ هاتبێ و جەستەشت ئاوەدانی و نوژەنبێ

**أرضيت أن يحظى سواك بقربه**

ڕازیت جگە لە تۆ نزیکبونەوەی لێ

**أبداوأنت معذب مهجور**

بەشی هەتا هەتایی بێ تۆش سزادراوبی جێهێڵراوبی

**مهد لنفسك حجة تنجو بها**

بەڵگەیەک ئامادەکە پێیەوە ڕزگارتبێ

**يوم المعاد ويوم تبدو العور**

ڕۆژی گەڕانەوە و ڕۆژی دەرکەوتنی کەم و کورتی**)**

کاتێک نورەدین مەحمود زەنکی ئەوەی بیست و گوێی لێ ڕاگرت چاوەکانی فرمێسکی کرد و زۆر بە توندی گریا، دەست بەجێ فەرمانیدا گومرگ باج لەسەر خەڵکەکە هەڵبگرێ.

بزانە نورەدین مەحمود زەنکی ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزە بوو کاتێ (عمر الملا مصلي) نامەی بۆ نووسی هەندێک هەڵە و کەم و کوڕی پێ ڕاگەیاند و پێشنیاری بۆ کرد، ئەویش لە وەڵامیدا ئەو نامەیەی بۆ نووسی: **(إن الله خلق الخلق وشرع لهم شريعة، وهو أعلم بما يصلحهم، ولو علم أن في الشريعة زيادة في المصلحة لشرعها لنا، فلا حاجة بنا إلى الزيادة على ما شرعه الله تعالى، فمن زاد فقد زعم أن الشريعة ناقصة، فهو يكملها بزيادته، وهذا من الجرأة على الله وعلى ما شرعه، والعقول المظلمة لا تهتدي، والله سبحانه يهدينا وإياك إلى صراط مستقيم)** واتە: بەڕاستی اللە

بەدیهێنراوانی بەدیهێناوە و ڕێباز و بەرنامەی بۆیان وەکو یاسـا داناوە، ئەو زاناترە چی بۆ ئەوان با شە، ئەگەر بیزانیبا شتێک چاکترە لە بەرژەوەندی و مە سڵەحەتی ئێمە وەکو یا سا زیادی دەکرد، ئێمە پێویستمان بەوە نییە و نەماوە کە شـتێک زیاد بکەین لە شـەریعەت و یا سای الله تعالی، ئەوەی شتێک زیاد بکات لە شەریعەتی ئیسلام و یا ساکانی ئەوە وای دا ناوە شـەریعەتی الله کەم و کورتە، ئەو بەو ز یادەکردنە تەواوی دە کا، ئەوە جورئەد بەخۆدانە و بێئەدەبییە بەرامبەر بە الله و لەسـەر شـەرعی الله، جا عەقڵە تاریکە کان ڕێنموییان نابێ، الله ئێمە و تۆ ئەی (عمر الملا) ڕاستە ڕێ بکات بۆ ڕێگای ڕاست.

ئینجا ئەوەی پێدەگووترا کە حوکمی دەکرد بە قورئان و بە ئیسلام و جەنگی دەکرد لە پێناو الله، نەک وەکو عەلمانی و دیموکراسی و ئەوانەی بەرین لە دینی الله تعالی دەسەڵاتداربن دەبێ چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەین.

## چەند ئامۆژگارییەک بۆ دەنگدەران:

ئەی جەماوەر و خەڵکی بە گشـــتی زۆرجار ئێوە دەهێندرێن و فێڵتان لێ دەکرێت، کاتێک کاریان پێتانە لایەن و ســـەرکردەکان و ســـیاســـیەکان چەواشـــەتان دەکەن، بە هەموو لایەنەکانەوە بە عەلمانی و ئەوانەی پا شگری ئیسلامیشیان بەخۆیانەوە لکاندووە، زۆرجار ئێوە بە ســـەماوەر ناو زەند دەکەن و پێتان دەڵێن جەماوەر ســـەماوەرە، ئەگەر ئاگری تێ هەڵبگرێ گەرم دەبێ و ئاگری لێ بکرێتەوە دەکوژێتەوە، لە جەنگ و لە هەڵبژاردن و لە ناخۆشیەکان پشکی زۆر بەبەر ئێوە دەکەوێ، لە قازانج و خۆشیەکان و ڕابواردنی دونیا بە دڵنیاییەوە ئێوە لە پشتی پشتەوەن و دوا دەخرێن و سەرکردەکان و ئەوانەی کە بەربژێرن و سـیاسـین و گەورەن ئەوان بەشـی شـێر دەبەن و لە پێشـی پێشـەوەن بۆ وەرگرتنی تام و چێژەکانی دونیا.

یەکێک لەو کار و شـتانەی سـەردەم کە بەربژێر و کاندیدەکان دەسـەڵاتی دونیای پێوە بەدەست دەهێنن هەڵبژاردن و دەنگدانە کە ئەستونگەی بەهێزی سەرەکی ڕاگری ئەو کارە و ئەو سەقفە و ئەو بینایەش جەماوەرە و دەنگدەرە کە دەنگیان پێدەدەن.

جا ئاگاداربن لێرەوە پێتان دەڵێین نەکەن قەتاوقەت قیامەتی خۆتان بۆ دونیای خەڵکی بچوێنن، ئەوەیان زۆر ترسناکە نابێ بۆ دونیای خۆشت قیامەتی لەسەر دابنێی، ئەی ئەگەر قیامەتت بۆ دونیای خەڵکی بچوێنی؟

ئەمڕۆ دونیایە و بەیانی دواڕۆژ مردنیش پردی پەڕینەوەیە لە نێوان هەردووکیاندا، ئەوەی بشمرێ قیامەتی داهاتووە و دەستی لە دونیا بەربووە.

پێویستە بیربکەنەوە ئەی خەڵکە دەنگدەرەکە ڕێگای ڕزگاری ڕاستەقینە بۆ قیامەت و دەرباز بوونتان لە ناخۆشی و عەزابی الله تعالی لە کوێوەیە، مێشک و دڵت بکەرەوە و هەستت ڕابگرە لەو چەند خاڵانە تاوەکو کار لە کار نەترازاوە و ژیانت لە دەست دەرنەچووە سوودیان لێ وەرگرە و لە گوناح و هەڵەکانت بگەڕێوە و ڕووبکە الله تعالی و چیتر بە قسە و گووتەی هیچ کەسێک مەخەڵەتێ، بزانە ئەوەی ئامۆژگاریت دەکات بە حیسابی خۆی پزیشکە یان چاکەی بۆت دەوێت و دەیهەوێ چارەسەری دەردەکانت بکا، یان لێی وردبەوە بزانە دزە دەیەوێ ڕێگای دزیەکەی خۆش بکا بە ناوی ئەوەی ئامۆژگاریت دەکات تا تۆ دەرگای ماڵەکەت واڵا بکەیت و ڕێگای دزیکردنەکەی ئاسانتر ببێ، وەرەوە سەر خۆت، ئاگاداری خۆتبە، با دزەکان دزیت لێ نەکەن و فێڵیشت لێ نەکەن و نەبنە ئامۆژگاری کارت.

- **خاڵی یەکەم؛** گوێم لێ ڕابگرە ئەنجومەنی یاســـا دا نان ناوەکەی بەخۆیەوەیە، یاساکان دادەڕێژێت تەشریع دەکات ئەو کارەش بۆ کەس نەهاتووە بیانکا تەنها مافی الله تعالی یە، جا بە دەنگدانی تۆ بۆ بەربژێرێک ئەو ماف دانەی الله تعالی لە الله زەوت دەکەیت، شایستەی دەبینی بۆ کە سێکی تر جگە لە الله، کە الله تعالی ئەوەی قبوڵ نییە فەرموویەتی: ﴿**أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَـــــمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ**﴾ **( الشوری : ٢١)** واتە: ئاخۆ ئەو (بێ باوەڕ) انە هاوبە شانێکیان هەیە ئاینێکیان بۆ داناوون کە الله ڕێگەی پێ نەداوە.

- **خاڵی دووەم؛** دەنگدان یارمەتیدان و پشـــتگیری کردنە بۆ بەربژێر و لایەنەکە، لایەنەکە چ عەلمانی بێ و چ دیموکراســی بێ و چ ئیســلامی بەخۆیەوە لکاندبێ، کەواتە ئەو دەنگدانەت ئەو یارمەتیدانەت بۆ سیستەمی عەلمانیەت و دیموکراسیەتە کە ئەوانەش جگە لە ئیســلامن، الله تعالی یش بڕاندویەتیەوە کە جگە لە ئیســلام هیچ شـتێکی تر لە بە ندە کانی قبوڵ ناکات بیکەنە ڕێباز و بەرنامە و ئاین فەرموویەتی: ﴿**وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ**﴾ **( ال عمران : ٨٥)** واتە: هەر کەسـێک دوای دینێک بکەوێت جگە دینی ئیسـلام ئەوە لێی وەر ناگیرێ وە ئەو لە ڕۆژی دواییدا لە زەرەرمەندانە، وە بزانە یارمەتیدان و کۆمەکی کردنە لەســـەر گوناح و

تاوان لەســـەر شـــیرک و کوفر الله تـعالی پێی فەرمووی: ﴿**وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ**﴾ **( المائدة : ٢)** واتە: نەکەن یارمەتی و کۆمەکی یەکتر بکەن لەســەر تاوان و گوناح و دوژمن کاری الله تعالی.

- **خاڵی ســێیەم؛** ئەی دەنگدەر نەکەی قیامەتی خۆت بچوێنی، جگە لەوەی کە ئەوە گوناحێکی گەورەی تێدایە و شیرک و کوفرە وەکو بۆمان ڕوونکردیتەوە، بۆ دونیاش هیچ ســـوودێکی نەبووە و نییە، تەنها بەڵێنی زاق و بریق و ڕێز لێنان تاوەکو پڕوپاگەندەکان تەواو دەبن بۆئێوەیە لەلایەن ســـەرکردە و لایەنەکانەوە لەلایەن دەســـەڵاتەوە، بەڵام ئەو کاتەی دەسەڵات دەگرنە دەست یان دەردەچن ئێوەیان لە بیر دەچێتەوە چەواشەکاریەکان کە کردبوویان بۆ ئێوە دەردەکەوێ هەر تەنها قســـەی زاق و بریق بووە و هیچی تر ئەو کات ئەوانەیان لەبیر دەچێ و ترساندنتان کوشتنتان ئەشکەنجەدانتان دوور خستنەوەتان دەرگا بەســـەردا نەکردنەوەتان هەڵنەگرتنی مۆبایل و تەلەفۆنەکانیان لەســـەرتان دەبێتە بەشتان.

ئەوانەی پاشگری ئیسلامییان بەخۆیانەوە لکاندووە هیچیان پێ ناکرێت ئەگەر بێو لەوێ بن و دەســـەڵاتدارانی کە دەســـەڵات لە عەلمانیەکان دەگرنە دەســـت واتان لێبکەن، تەنها ئەوانیش ئەوەیان بۆ دەمێنێ بە قســـە هانتان بدەن، هەندێک جاریش بە کوشـــتنتان بدەن

ئەشـــکەنجەتان پێ تام بکەن یان بێ مەعاشـــتان بکەن یان ئەو کاتە لە مەیدانەکاندا هەر ئەوەتان بۆ بڵێنەوە بڵێن ئافەرین شـــتێکی باشـــی کرد بوێر بوو، کە ئەوە هیچ نرخ و قیمەتێکی نابێ سەرەڕای ئەو گوناح و تاوانە گەورەی تووشی خۆشت کردووە.

ئەوەتا میسری دوێنێ شاهێدە کاتێ کەوا حوسنی موبارەک لادەدرێ و لە کۆتاییەکەی مورسی دێتە سەر حوکم چی لێ کەوتەوە؟ هەر ئەوەبوو کوشتنی چەن هەزار نەفەرێک ناموس بردنیان ئەشـکەنجەدانیان دوورخسـتنەوەیان، لە کۆتاییەکەشـدا هیچ بە دەسـت هیچ لایەکەوە نەماوە، سەرباری ئەوەش ڕوو ڕەشی و قیامەت و حەشر و حیساب لای الله تعالی.

کەواتە نە دونیا و خۆزگە و ئومێدەکانی دونیات دێتەجێ و قیامەتیشـت پێوە دۆڕاندووە، بە دڵنیاییەوە ژیر ئەو کەسـەیە قیامەتی دابین دەکات و دونیای دەکاتە کێڵگەی دواڕۆژ، ئاگاداربە تۆ وابکە.

کردەوە باشەکان لە دونیادا؛ عیبادەت و پەرستشی الله تعالی و دووركەوتنەوە لە شیرک و هاوبەشـــی و کوفرکردن بە طاغوت و بڕواهێنان بە تاکایەتی الله تعالی و الله بەیەکگرتن، بەڵکو لە قیامەتدا بەرو بومەکەی بدوریتەوە: ﴿**فَمَنْ زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ**﴾( **ال عمران : ١٨٥**) واتە: هەرکەس

دوورخرێتەوە لە ئاگری دۆزەخ و بخرێتە بەهەشـــتەوە ئەوە بەڕاســـتی ئەو کەســـە سەرکەوتووە ژیانی دنیاش هیچ شتێک نییە بێجگەلە بەهرە و ئارەزوویەکی فریودەر.

کەواتە ئەوپەڕی نەزانینە قیامەتت بدۆڕێنی بۆ دونیای خەڵکی و کەســێکی تر جگە لە خۆت.

بڕوانە دیمەنەکانی حەشر و حیســـاب و قیامەت لەو چەند ئایەتانە بزانە چۆن ئەوانەی دەنگیان پێ دەدەیت بەسەرکردەیان دەزانیت لەو مەیدانەدا قەرزار بارت دەکەنەوە، خۆیان بەری دەکەن لێت گوناحەکان و خراپەکانیان دەخەنە ئەستۆی ئێوە بەڵام لەوێ چونکە الله تعالى یەکی دادپەروەر هەیە ئاگادارە بە هەموو نهێنیەکان و بە ئاشـــکراکانیش ئا لەوێوە زوڵم و ستەم نییە: ﴿**لَا ظُلْـــمَ الْيَوْمَ**﴾ **( غافر : ١٧ )** واتە: ستەم لە کەس ناکرێ ئەمڕۆ، لەوێدا الله تعالى بڕیار دەدا حیساب بۆ قسەکانی ئەوان ناکا ئێوە و سەرکردەکان دەنگدەر و بەربژێرە کان بە دڵنیاییەوە ئەوەی مردبێ لەســـەر ئەو حاڵە و تۆبەی لێ نەکردبێ و گەڕابێتەوە لای الله تعالى هەردووکیان عەزاب دەدا و تووشی ئاگری دۆزەخیان دەکات.

گوێت شـلکە و دڵت بکەوە سـەرنجی ئەو ئایەتانە بدە کە الله تعالى دەفەرمووێ: ﴿**وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَنْ نُؤْمِنَ بِهَذَا الْقُرْآنِ وَلَا بِالَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّالِـــمُونَ مَوْقُوفُونَ عِنْدَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ الْقَوْلَ يَقُولُ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ**

**اسْـتَكْبَرُوا لَوْلَا أَنْتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِين * قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْـتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْـتُضْـعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَـــدَدْنَٰـــــكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ * وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰـــــلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ (سـبأ : ٣١-٣٣)** واتە: وە ئەوانەی بێ باوەڕ بوون وتیان ئێمە هەرگیز باوەڕ ناهێنین بەم قورئانە و بەو کتێبانەش پێش ئەم (قورئانە) هاتوون خۆزگە دەت دی کاتێ ئەو ســتەمکارانە ڕادەگیرێن لە بەردەم (دادگای) پەروەردگاریاندا قســە و تاوان ئاڕاســتەی یەکتر دەکەن لاواز و ژێر دەســتە کراوان دەڵێن بەوانەی خۆیان بە گەورە دەزانی (ئەوانەی ســەرکردەبوون و بەربژێر بوون ئەوانەی جەماوەرن یان دەنگیان پێیان داوە پێیان دەڵێن) ئەگەر ئێوە نەبان خۆ ئێمە بڕوادار بووین (ئەگەر ئێوە نەبان ئێمە گوڕا نەدەبووین ئەگەر گومڕایی و چەواشــەکاریی ئێوە نەبا ئێمە نەدەهاتینە دەنگدان دەنگمان بۆتان نەدەدا بەڵام بە ڕیشی درێژتان بە سمێڵی قووت کراوتان بە مێزەری بەســەرتان بە جوبەی لەبەرتان بەو قســە زاق و بریقانەی کە فێری بوو بوون ئایەتتان بەگەڵ دەخســت فەرموودەتان بۆ دەهێنایەوە دەتان گووت فڵان زانا وا دەڵێ فرمێســکی چاوانتان دەهێنا پەنجەی (لا إله إلا الله) تان بە ئێمە پیس دەکرد ئەگەر ئێوە نەبان ئێمە وا گومڕا نەدەبووین و بڕوادار دەبووین ڕێگای ڕا ستمان دەگرتە بەر) * ئەوانەی

خۆیان بە گەورە دادەنا دەڵێن بەوانەی ژێر دەستە و لاواز کرابوون (بەربژێر و سەرکردەکان دەڵێنە جەماوەر و دەنگدەرەکان) ئایا ئێمە بەرگریمان کردن لە ڕێنموونی دوای ئەوە بۆتان هات (نەخێر وانییە) بەڵکو خۆتان تاوانبار بوون * ژێر دەســـتە و چەوســـاوەکان دەڵێن بەوا نەی خۆ بەزلزان بوون ( نەخێر وانییە) بەڵکو پیلانی (ئێوە) بە شـــەو و بە ڕۆژ (چەواشەی کردین) کاتێ فەرمانتان پێ دەداین کە بێ بڕوا بین بە الله و وێنە و هاوبەشانی بۆ دابنێین (ئێوەبوون کەوا پڕوپاگەندەتان دەکرد و دەتان ڕازاندەوە دەتان گووت وەرنە ناو پڕۆســـەکە دەی دەنگ بدەن ئەوە حەق و ڕەوایەتییە ئێمە مافەکانتان دەســـتێنینەوە ئەوەی دەنگ نەدا گوناحبار دەبێ لە حەشر و حیســـاب یەخەی پێدەگرین فێڵتان لە ئێمە کرد بە ڕیشی درێژتان بە سمێڵی قوت کراوتان بە مێزەری بە سەرتان بە جوبەی لەبەرتان بە دیمەن و ڕواڵەتییە زاهیریە دینداریەکەی خۆتان کە نیشانتان دەدا ئێمەتان توو شی دۆزەخ کرد لە پاشـــان الله تعالی دەفەرمووێ) هەموویان پەشـــیمانی دەشـــارنەوە کاتێ کە ســـزای دۆزەخ دەبینن وە زنجیرو تەوقمان کردە گەردنی بێ باوەڕان ئایا تۆڵەیان لێ ئەســـەنرێ جگە لەوەی دەیان کرد (ئیلا بەوەی کەوا کردویانە و ئەنجامیان داوە کە بەشداری سیستەمی کوفرییان کردووە پشـــتگیری ناحەقی و ناڕەوایەتییان کردووە پەنجەی شـــایەتومانییان داناوە لەناو پڕۆسەی دیموکراسیەت و عەلمانیەت و هەڵبژاردن بۆ ئەوەی یاسا دانان بڕیار بدەن بیدەنە

دە ستی مرۆڤەکان لە الله تعالی ی بستێننەوە ئا ئەوانە بەو کار و کردەوەیان ئێستا تۆڵەیان

لێ دەکرێتەوە و سزا دەدرێن).

وەرەوە سەر خۆت ئاگاداربە ئەوان ئاوا لێت بێمنەت دەبن نەکەی دەنگ بدەی بە شداری

نەکەی الله تعالی لە خۆت تورە نەکەی خۆت دووچاری عەزابی الله نەکەی، باشە وەڵامت

چی دەبێ لەو کاتەدا؟ بزانە ئەگەر بێو هەر واتکرد و پێداگیریت لەســەر کرد بە دڵنیاییەوە

تووشی عەزابی الله دەبی.

ئەگەر الله تعالی لە دوای مردنت پرســیاری لێ کردی چۆن جورئەتت کرد ئەی دەنگدەر

هاوبەشم بۆ بڕیار بدەیت و بەربژێرەکان هەڵبژێریت بۆ ئەوەی یاسا دابنێن و باسی حەڵاڵ

و حەرامەکان بکەن و باســی ناموســەکانتان بکەن و ئەو هەموو شــتانە بڕیار بدەن لە

پەرلەمانەکەیەوە، بە دڵنیاییەوە بەشــت هەر شــەرمەزاری و ترس دەبێت، هیچت دەســت

ناکەوێت مەگەر عەزابی الله تعالی و ئاگر جێگات بێ.

تا زووە بە دەســتی خۆت وا بەســەر خۆت مەهێنە و بە پڕوپاگەندەکان بڕوا مەکە و بەو

کەســانە بڕوا مەکە کەوا مەندیل بەســەرن جوبە لەبەرن، کاتێک ڕێت لەبەر بزر دەکەن

وەحی الله تعالی دەگۆڕن، الله تعالی دەفەرمووێ کاتێ کەوا کافر و موشریکەکان لە

پێغەمبەریان داواکرد (ﷺ) پشت بکاتە ئەوانەی کەوا پلە دار نەبوون لەناو قورەیشیەکان

و تازە بوو بوونە موسڵمان و ڕوو بکاتە سەرکردە کافرەکان قسەکان لەوان وەربگرێ لە کۆڕ و مەجلیسەکان الله تعالی دەفەرمووێ: **﴿وَإِنْ كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ وَإِذًا لَاتَّخَذُوكَ خَلِيلًا * وَلَوْلَا أَنْ ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدْتَ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلًا * إِذًا لَأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا﴾ الإسراء : ٧٣-٧٥** واتە: وە بەڕاستی نزیك بوو ئەوانە لات دەن لەوەی کە نیگامان کرد بۆت بۆ ئەوەی جگە لە قورئان شتێك بەدەم ئێمە هەڵبەستیت (ئەگەر گوێڕایەڵیان بوویتایە) ئەوە لەو کاتەدا دەیان کردیت بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان * خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان دامەزراو نەکردایە بەڕاستی نزیك بوو تۆ کەمێك بەلایاندا بچی * جا بێگومان ئەوکاتە پێمان دەچە شتی دوو بەرانبەر ( سزای) ژیان دوو بەرانبەر ( سزای) مردن پا شان دە ستت نەدەکەوت یارمەتی دەرێك بەرانبەر بە ئێمە (کە بەرگری ئەو سزایەت) لێ بکات.

ئەگەر بە پێغەمبەرەکەی وا بڵێ (ﷺ) لە سەر داوایەکی وا بچوک کە نە کوفرە و نە شیرکە پێغەمبەر جێبەجێی بکات (ﷺ) بۆ کافر و موشریکەکان ئەی دەبێ چی بەو سەرکردە و مەندیل بە سەرە جوبە لەبەرانە بڵێ کەوا دەچنە ناو پرۆ سەکان و تەواو دەچنە باوە شیان و تەواو پشت دەکەن لە موسڵمانانی الله بەیەکگر و ئەوانەی کوفریان کردووە بە طاغوت، جە ماوەر و خەڵکە چەوساوەکە جێ دەهێڵن خۆ یان دەچنە ناو ئەو بازنەیە، هە ڵت دەخەڵەتێنن پێیان هەڵمەخەڵەتێ، ئەوان مەکە پەرستراوێک لە جیاتی الله تعالی کە الله

تعالی دەفەرموویت: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللهِ﴾ **(التوبة : ٣١)**

واتە: جولەکەکان زاناکانیان و نەسرانیەکان دێر نشین و قە شەکانیان گرتبوو بە پەرستراو بێجگە لە الله تعالی کاتێک فەرمانیان دەردەکرد سەد لە سەد جێبەجێیان دەکرد و بە قسە یان هە ڵدەخەڵە تان و حەڵاڵیان بۆ حەرام دەکردن و حەرامیان بۆ حەڵاڵ دەکردن ئەوانیش جێبەجێیان دەکرد.

زانایان گوتوویانە ئەوەی پێچەوانەی فەرموودەکانی الله تعالی بکات، هەموو قسەیەک سەد لە سەد بەبێ ئاو ناو بۆ بەبێ بەڵگە بەبێ تێگەیشتن، لە سەرکردەیەک یان لە زانا و مەلایەک وەربگرێ ئەوە ئەوی پەرستووە[١].

جا بزانە ئەوانە ئەمڕۆ لە کاتی پڕوپاگەندەی هەڵبژاردندا کە هەڵت دەخەڵەتێنن تۆیان بە پێش خستووە ئەو کاتە دەڵێن خەمخۆری تۆین بەڵام کاتێک شەڕ و جەنگ هەڵدەگیرسێ بۆ شەڕ و جەنگ خۆیان ناوێرن تۆ دەنێرن لە وەرگرتنی پۆست و پارە و چەورایەتی و دونیاشدا ئەوان لە پێشی پێشەوەن تۆ بە پاش دەخەن و تۆیان بە بیر نامێنێت و لە بیرت دەکەن.

[١] واتە حەڵاڵ و حەرامەکان لێیان نەپێچێتەوە لە بەڵگە و دەلیلەکان وەکو ئەوەی جولەکەکان و نەسرانیەکان کردیان.

تاکەی وانە وەر ناگریت ئەی فەقیر حاڵ؟ بۆچی قیامەتی خۆت لە دەســـت دەدەی لە دونیاشدا هیچ بە دەست ناهێنی؟

وە بزانە ئەگەر الله پرسیاری ئەوەت لێبکا بۆچی یارمەتیت دا لەسەر گوناح و هاوبەشیەکان و بویتە پشــتیوانیان ئایە ئایەتی ﴿**وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ**﴾ م بۆت ڕەوانە نەکردبوو؟ تۆ بۆچی بەگەڵیان کەوتی و لەگەڵیان بووی؟ ئا ئێستا تۆ هاوبەشــی لە گوناح و تاوان و شــیرک و هاوبەشــی و هەرچی کردویانە، تۆ ئەوانت گەیاندە ئەو پلە و پایە تۆ بووی شـــایەتیت بۆ دان پەنجەی شـــاهێدومانی کە پەنجەکەتم پێدابوو ڕای بکێشی (لا إله إلا الله محمد رسول الله) ی پێ بڵێیتەوە و بیسەلمێنی نەک بۆ ئەوەی بە مرەکەبی پیسی دانگدان پیسی بکەیت و یارمەتیدەری ئەو کەسانەبی، شەریک و هاوبەشی لە هەڵە و تاوان و گوناحەکانیان.

ئایە هیچ وەڵامێکت دەبێت؟ ئەگەر هەرچی بڵێیت هەر نابێتە مایەی ئەوەی الله لێت ببورێت، بۆچی وا لە خۆت دەکەی؟

مالیکی کوڕی دینار (رحمە الله) فەرموویەتی: **(رحم الله عبدا قال لنفســـه: ألســـت صاحبة كذا؟ ألست صاحبة كذا؟ ثم ذمها، ثم خطمها، ثم ألزمها كتاب الله تعالى،**

**فكان لها قائدا)**[1] واتە: ڕەحمەتی الله لە بەندەیەک بێت کە بە نەفسـی خۆی بڵێت تۆ خاوەنی ئەو تاوانە نیت؟ وە خاوەنی ئەو تاوانە نیت؟ پاشان سەرزەنشتی نەفسی بکات و بیشـکێنێت پاشـان پابەندی بکات بە کتێبی الله تعالی وە، وە بیکات بە پێشـەوایەک بۆ خۆی.

لە کۆتایی ئەو چەند ئامۆژگاریەدا پێت دەڵێین ئەی دەنگدەر قیامەتی خۆت مەدۆڕێنە ڕووبکە الله تعالی کێ دەڵێ لەسـەر سـندوقی دەنگدانەکان یان ئەو ڕۆژەی بۆی دەچی هێشـتا تۆبەت نەکردووە بەو پەنجە شـاهێد و مانیەی کە پیسـت کردووە بە مرەکەبی عەلمانیەت و دیموکراسیەت و سیستەمەکە کە دەنگت پێداوە ملک الموت لێت میوان نابێ؟ چ جوابێکت پێدەبێ بۆلای الله تعالی؟ یان بەبێ تۆبە لەسـەری بمری ئەو پرسـیارانەت لێدەکرێ و بێنە پێش چاوت و قیامەتی خۆت مەدۆڕێنە بۆ دونیای خەڵکی.

ئێمە ئەی الله تعالی ئەوە بکەیتە بەڵگەیەک بە دەستمانەوە و لێمانت قبوڵ کردبێ کە ڕوومان کردە ئەو خەڵکە و داوامان لێکردن ئەی قەومەکەمان وەکو ئەو بەندە چاکە پێیان دەڵێین:

**﴿وَيَا قَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ * تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِاللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَأَنَا أَدْعُوكُمْ إِلَى الْعَزِيزِ الْغَفَّارِ * لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِي**

---

[1] اعتلال القلوب للخرائطي (٣٨).

**إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُ دَعْوَةٌ فِي الدُّنْيَا وَلَا فِي الْآخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَا إِلَى اللَّهِ وَأَنَّ الْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَابُ النَّارِ * فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ ۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾ (غافر : ٤١-٤٤)** واتە: ئەوە چییە ئێمە ئێوە بانگ دەکەین بەرە و ڕزگاربوونتان لە دۆزەخ و چوونتان بۆ بەهەشـــت لە دونیادا ڕوو ســووربن پشــتیوانی الله بە دەســت بێنن ئێوەش ئێمە بــانــگ دەکەن بەرەو ئــاگر (بەشـــــداریکردنی پرۆســـەی هەڵبژاردن و دیموکراســـیەت) * (ئێوە) بانگم دەکەن بۆ ئەوەی بێ باوەڕ بم بە الله وە شـــتێ بکەمە هاوبەشـــی الله کە هیچ زانیارییەکم لێی نیە لە کاتێکدا من بانگتان دەکەم بۆ لای الله ی بەدە سەڵاتی لێبوردە * ڕا ستە و گومانی تێدا نییە ئەوەی ئێوە منی بۆ بانگ دەکەن شیاوی بانگکردن نییە نە لە دونیا نە لە دوارۆژدا وە بەڕاســـتی گەڕانەوەمان هەر بۆ لای الله یە و بێگومان زیادە ڕەوانن هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ * بە بیرتان دێتەوە و بە بیرتان دەهێنینەوە ئەگەر لە دونیاش نەبێ لە قیامەتدا ئەوانەی کەوا پێمان گوتن بۆچیبوو وە لەبەر چیبوو وە ڕا ستیەکان لە کوێ بوو بۆتان دەردەکەوێ وە من کاری خۆم بە الله دە سپێرم بەڕا ستی الله بینایە بە بەندەکانی (کە چی دەکەن و چییان دەوێت).

بە دڵنیاییەوە لەو قسەو گوتنانەمان پێتان دەڵێین وەکو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە قەوم و گەلەکەی خۆیانیان گوتووە: **﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ (هود : ٨٥)** پێتان دەڵێین ئەوەی دەمانەوێ تەنها

چاکسازییە چاکسازی لە شیرک و هاوبەشی و لە کوفرەوە گەڕانەوە بەرەو تەوحید و الله بەیەکگرتن و موسڵمان بوونەوە، چاکسازی لە هەڵە و کەم و کورتی و فاحیشە و گوناحەکان بەرەو ڕەوشت بەرزی و ڕێکوپێکی و تەواویەتی و بەدەستهێنانی سەرکەوتن و سەرفرازی هەم لە دونیا و هەم لە دواڕۆژدا بەپێی توانامان، ئەوەی پشتگیری کردنیشە تەنها لە الله وەیە بە دڵنیاییەوە تەنها پشت بە الله دەبەستین و گەڕانەوەشمان هەر بۆلای ئەو دەبێ.

## ڕێگا چاره و بەدیل لە جیاتی ئەو دیموکراسی و هەڵبژاردنە:

ئێمە ئەم باســـە دەکەینە دوو خاڵی زۆر کورتی پوخت بەڵام دەبێ موســـڵمان پێش هەموو شـــتێک پێش ئەوەی هیچ ڕێگایەک بگرێتەبەر لەســـەریەتی کەوا وەکو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دوور بکەوێتەوە لە بت و سەنەمەکان لە شیرک و هاوبەشی و کوفرەکان وەکو ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کەوا بە قەوم و گەلەکەی خۆی گووت: ﴿**قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْـــوَةٌ حَسَـــنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْـــتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللهِ مِنْ شَيْءٍ رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْـــمَصِيرُ﴾ (الممتحنة : ٤)** واتە: بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە ســـەر مەشـــقێکی جوان و چاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت بەڕاســـتی ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شـــتانەش کە دەیان پەرســـتن لە جیاتی الله ئێمە باوەڕمان نییە بە (ئایینی) ئێوە وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بە الله ی تەنیا دەهێنن جگە لەو قسەیەی ئیبراهیم کە بە باوکی وت بێگومان داوای لێخۆش بوونت بۆ ئەکەم وە من هیچم بەدەســـت نییە لە بەرانبەر الله دا بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان تەنها پشـــتمان بە تۆ بەســـتووە وە هەر بۆ لای تۆ گەڕاوینەتەوە سەرئەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە.

**1-ڕێگای یەکەمیان؛** بە دیل بە ڕێگایەکی کورتی پوخت بەبێ زەحمەتیەکی زۆر ئەویش بریتییە لەو ڕێگایەی کە زۆرینەی خەڵکی لە الله ناســی تێگەیشــتبێ و موســڵمانبن و الله تعالی بە تاک و تەنیا بپەرســتن و دوورکەونەوە لە شــیرک و هاوبەشـــی و لە گوناح و خراپەکانیان بە یەکجاری سەرەتا ئەو خاڵانە جێبەجێ بکەن.

ئەوەشــیان ســەرچاوەکەی ئەوەیە کە پێشــینانی چاک هەندێکیان وایان کردووە و وایان فەرمووە لەوانە حە سەنی بەسری ( رحمە الله) گەورە تابیعی کاتێ کەوا پرسیاری لێکرا لە ســەردەمی خۆی لەســەر زوڵم و ســتەمەکانی حەجاجی کوڕی یوســفی ســەقەفی و هاو وێنەکانی بە خەڵکەکەی فەرموو ئەگەر دەتانەوێ زوڵم و ســتەمی ئەوانتان لەســەر نەمێنێ ڕێگا چارە تەنها ئەوەیە **(اتقوا الله، وتوبوا إليه يكفيكم جوره)**[1] ئێوە لە الله ترســبن تەقوا بە دەســت بێنن بگەڕێنەوە لای الله تعالی بە تەواوەتی، الله تعالی بەســە بۆ ئەوەی زوڵم و ستەمەکەی ئەوانتان لە سەر لابدا، یان ئەوەیە زاڵم و ستەم کارەکە لە ناو دەبا یان ئەویش تەوبەی بە نســیب دەبێ و ڕێنمویی و هیدایەتی دە کات، ئەو کاتە بە هەردوو سەرەکە ئێوە دەحەسێنەوە و لە دەستیان ڕزگارتان دەبێ.

---

[1] لە کتێبەکەی ئیبن جەوزی -آداب الحسن البصري- (١/ ١١٨) هاتووە.

الله تعالی فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ ۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ﴾ (الرعد : ١١) واتە: بەڕاستی الله (بار و حاڵی) هیچ گەلێك ناگۆڕێ هەتا ئەوان خۆیان (بار و حاڵی) خۆیان نەگۆڕن وە کاتێك الله بیەوێ هۆزێك توو شی بەڵا بن هیچ بەرگرێکی بۆی نییە و جگە لەو (الله) هیچ یارمەتیدەر و پشتیوانێکیان نییە.

سەرەتا دەبێ زۆرینەی خەڵکەکە و جەماوەر ئەوها تێبگەیەنرێ کەوا سەرەتا غوسڵی تەوبە بکەن، هەموویان خۆیان بشۆن وەک لە فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە[1]، بە نیەتی تەوبەکردنێکی تەواو خۆیان بشۆن، لە پاشان دەستنوێژێک بگرن و دوو ڕکاعەت نوێژی تەوبە بکەن، لە پاشان لە دوای نوێژکرنەکە بە دڵێکی پاک و بێگەرد بە ئیخلاسەوە لەبەر الله بپارێنەوە بە ناوە زۆر جوانەکانی بە سیفاتە بەرزەکانی، وە بڵێن الله تعالی ئێمە شەرمەزارین گوناحکارین گەڕاینەوە لەوەی شیرک و هاوبەشییە لەوەی گوناح و تاوانە

[1] (عَنْ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ قَالَ : أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُرِيدُ الإِسْلاَمَ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ) (سنن أبي داود، برقم: ٣٥٥).

واتە: لە قەیسی کوڕی عاسمەوە هاتووە، کە گوتوویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گوتم: دەمەوێت موسڵمان ببم، فەرمانی پێ کردم کە بە ئاو و مۆرد (سدر) خۆم بشۆم.

بۆلای تۆ بەرەو چاکە و الله بەیەکگرتن و دوور کەوتنەوە لە شیرک و هاوبەشی و گوناح و تاوان.

ئەگەر ئەو تەوبە ڕاستەقینەیان کرد بە تەواوەتی ئینجا بەردەوامبن لەسەری و ڕوو بکەنە الله و بیسەلمێن تەوبەکەیان ڕاستە ئینجا زۆر دۆعا بکەن و لەبەر الله تعالی بپاڕێنەوە بە دڵنیاییەوە ئەو ئایەتە و ئەو وتەی حەسەنی بەسری دە یان گرێتەوە ئەوکاتە الله تعالی گۆڕانکارییان بۆ دەکات، ئەگەر سەرکردەی کافر و زاڵم هەبێ دەیگۆڕێ الله تعالی، یان ئەوەیە تەوبەی بە نسیب دەکا و ڕێنمویی دەکا، دەبێتە چاکەکار و دادپەروەر و کار دەکات بە حوکمی الله تعالی و بە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) یان ئەوەیە ئەو لەناو دەبا و لا یدەدا، کەسێکی چاکی پاک کە حوکم بکات بە قورئان و بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆیان دەهێنێ.

**٢-ڕێگای دووەم؛** ڕێگا تەواترەکەی تریش کە ڕێگای پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) بەوە دەبێت کە ئینسان ڕێبازی پێغەمبەر بگرێتە بەر (ﷺ) ئەوە بە دیلە، دوو شت بوو ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) (الإعداد والجهاد) ئەو دوو خاڵە ئەوە سەرباسەکەیە، (الإعداد) یەعنی خۆ ئامادەکردن، (الجهاد) یەعنی جەنگ و تێکۆ شان و کو شتار لە پێناو

الله تعالی، (الجهاد) بە مانای بانگەوازی و دەعوە کردن، (الإعداد) بە هەموو مانا فراوانەکەیەوە.

الله تعالی دەفەرمووێ: ﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ﴾ **( المائدة : ١٠٥)** دەبێ لە خۆمانەوە دەست پێ بکەین، خۆمان دڵمان مێشکمان بەتاڵ کەینەوە لە شیرک و هاوبەشی و گوناح و تاوانەکان و ئارەزووە بێشەرعیەکان، ئینجا پڕی بکەینەوە شوێنە بەتاڵەکەی بە الله بەیەکگرتن و عیبادەت و پەرستشی الله تعالی و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی الله تعالی.

لە پاشان بێین دەوروبەرمان وەکو الله تعالی دەفەرمووێت: ﴿قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾ **(المائدة : ١٠٨)** ئێوە خۆتان و دەوروبەر و خێزان و منداڵەکانتان و عەشیرەت و هۆزەکانتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ بەوەی فێرە تەوحید و الله بەیەکگرتنیان بکەن وە بەوەی دووریان بخەنەوە لە شیرک و هاوبەشی و کوفریان بە طاغوت پێبکەن بەوەی کەوا فەرمانەکانی الله تعالی جێبەجێ بکەن و دوور بکەونەوە لە قەدەغەکانی.

لە پاشان: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾ **( الشعراء : ٢١٤)** دەبێ هۆزەکە و خزم و کەسەکانی تر ئەوانەش ئاگادار بکەینەوە بەپێی توانا لەوەی کەوا وازبێنن لە شیرک و

هاوبەشی و بێنە سەر تەوحید و الله بەیەکگرتن و پەیڕەوی بکەن لە ئاینی ئیسلام و وازبێنن لە خراپە و تاوانەکان، ئینجا بانگەوازی خەڵکانی تریش بکەین.

بەوە دەگووترێ بانگەوازییەکی گشــتی و خۆ پێگەیاندن، واتە ســەرەتا پاکســازی و چاکســازی لە خۆمانەوە دەســت پێبکەین ئینجا دەورووبەرە نزیکەکانمان هێواش هێواش هەتا فراوان دەبێت، لە پاشـــان وا بکەین کەوا ئامادەبین بۆ الله تعالی، ئەوە ڕێگای پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام).

## پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر دوو ئاست کار و ئیشی کردووە:

١- خەڵکێکی لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم لە شــوێنە تایبەتەکان تێدەگەیاند و حاڵی دەکردن کە دەبوونە موســڵمان فێرە تەوحیدی دەکردن فێرە الله بەیەکگرتنی دەکردن فێرە ســەبر و ئارامی دەکردن فێرە ســەباتی دەکردن و دەیگووت خۆتان ئامادە بکەن بۆ ڕۆژێک کە هەم لە دونیا ســەردەکەون هەم لە قیامەتیش ڕوو ســوور دەبن، دڵی دەدانەوە، عیزەتی پێدەبەخشین، ورەی بەرز دەکردنەوە، بەو شێوەیە ئامادەی دەکردن.

٢-بانگەوازێکی گشــتیشــی دەکرد، بە ماڵ و بازاڕەکاندا دەســوڕایەوە ڕوو بەڕووی کافر و موشریکەکــان بەبێ ترس و شــەرم لە دەرەوەی پەرلەمــان و ئەو پڕۆســەیەی کــافر و موشریکەکان کە لەو ســەردەمەدا هەیان بوو پێی دەگووتن ئێوە بڵێن هیچ پەرســتراوێکی

حەق و ڕەوا نییە جگە لە الله سـەرفراز دەبن، واز بێنن لە لات و عوزا و مەیپەرسـتن ئەوە شـــیرک و هاوبەشـــییە، ئەوانە هیچیان پێ ناکرێ بۆتان وەرنە لای الله تعالی، پێغەمبەر (ﷺ) بەو شێوەیەی دەکرد و بەو شێوەیەی دەفەرموو.

لە پاشان الله تعالی دەفەرمووێ: **﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُ﴾ (الأنفال : ٦٣)** واتە: ئەی بە ندە کانی من ئەی بڕوا دارە کان ئامادەکەن لە هێز و تواناتان وە لە بەسـتنەوەی وڵاخ و ئەسـپە کانتان تاوەکو دوژمنانی الله و دوژمنەکانی خۆتانیان پێ بترسێنن.

(إعداد)یش بریتییە لەوەی لە مەعنەویدا بە مەعنای ئیمان و بڕوا و پەروەردەیەکی چاک و ڕێکوپێکی تاکە کان و خێزان و کۆمەڵگا بکەی، لە پاشـــان (إعداد) بریتییە لە هێز و قووەتیش کە پێغەمبەر (ﷺ) لە حەدیسـی سـەحیحدا هاتووە فەرموویەتی: **(أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ)** واتە: بزانن هێز بریتییە لە تیر ئەندازی، بزانن هێز بریتییە لە تیر ئەندازی، بزانن هێز بریتییە لە تیر ئەندازی.

کەواتە لەو بوارەش دەبێ موسـڵمان خۆی و منداڵی و دەوروبەری و خەڵکە کان بەهێزبن تێیان بگەیەنێ پێیان بگەیەنێ، خۆیان هەڵبگرن بۆ ڕۆژێک تاوەکو شـەڕ و جەنگی بەدریان

لێ دادێ، کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە ڕێبازەکەی بووە کە الله تعالی لە کۆتایدا سەرکەوتنی بۆ هێنا.

هەرکاتێک ئەو ئیش و بانگەوازیەت سەری نەگرت و ڕێیان پێ دەگرتی، دەبێ لە پێناو الله تعالی هیجرەت بکەی وەکو هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە ڕێگای پێدان هیجرەتیان کرد بەرەو حەبەشە، یان وەک پێغەمبەر (ﷺ) کە ڕۆیشت بەرەو یەسریب بە چوونی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ یەسریب بووە شاری پێغەمبەر (ﷺ) و ڕووناک بوەوە، بووە (مەدینة المنورة) واتە شارێکی ڕووناک.

ئەگەر ئەوەشت بۆ نەکرا و شوێنی باشتریشت دەست نەکەوت دەبێ سەباتت هەبێ، پێداگربی لەسەر عەقیدە و بیروبڕوا و دینداریەکەت، لە پێناو الله تعالی هەرچیت بەسەربێ ئەو کاتە تەحەمول بکە الله لەگەڵتدا دەبێ سەبر و ئارامت هەبێ الله پشتگیریت دەکات و ڕۆژێک هەر دێت سەر بکەوی لە دونیا و لە قیامەتیشدا، بە دڵنیاییەوە بەسەر فرازی دەچیتە بەرامبەر الله تعالی و پاداشت بەدەست دەهێنی.

## ئەنجامی توێژینەوەکە لە چەند خاڵێکدا:

١-یەکێک لەو باس و بابەتانەی سەردەم کە خەڵکەکە بە گشتی سەرنج ڕادەکێشرێ بۆی و زۆربەی خەڵک و ماڵەکانی گرتوەتەوە کە ئەوە عەزابێکی الله تعالی یە ئەویش مەسـەلەی دیموکراسیەت و هەڵبژاردنە.

٢-بۆمان دەرکەوت ڕازانەوە و گومانی زۆری لە پێناودا کراوە، سـەر لە زۆربەی خەڵکی شـێوێندراوە لەو بوارەدا، بە تایبەت ئەو لایەنانەی کە پاشـگری ئیسـلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە و ناوی بانگخوازیان لە خۆیان ناوە یان مێزەر بەسـەرن جوبە لەبەرن کە کاتێک بەشـداری دەکەن یان خەڵکی هان دەدەن بۆ ئەو بوارە و چەواشـەیان دەکەن ئەوەشـیان بەڕاسـتی خەڵکەکەی وا لێکردووە کە زۆربەی هەرە زۆری تاوان و گوناحەکەی تووش ببێت و نەتوانێت لێی دەرباز ببێ.

٣-دوو ڕای سەرەکی هەیە لەسەر بەشداری کردنەکە بە تایبەتی بەشداری لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بۆ ئەوانەی کەوا پاشـگری ئیسـلامییان بەخۆیانەوە لکاندوە و خۆیان پێ موسڵمانە، ئەویش ڕای یەکەمەکە بۆمان بە دیارکەوت بە گوێرەی بنەما شەرعیەکان کە لێی بکۆڵیتەوە و پێوەری (أصـول الفیقە)، بە دڵنیاییەوە فتوا و قسـەکەیان وەرگیرا و نابێت و شـەرعی نییە و کەم و کورتییەکی یەکجار زۆری تێدایە، دوو دڵی خاوەن قسـەکانیش

دەردەکەوێت لە قســـە کانیانەوە لە هە ندێک فتوای تر لە دواتر کەوا هێناو یانەتەوە و

هەندێک جاریش قسە و فتواکانیان تێک گیراوە و تێک گیر دەبێت.

٤-ئەوانەی ڕای یەکەمیان گوتووە کە ڕێگا دراوە یان بە وا جب و پێویســـتیان زانیوە

هەندێکیان پە شیمان بونەتەوە وەکو (محمد ناصر الدین البانی) سەلماندمان کە لە گۆڤاری

(الأصالە) بە تەواوەتی پە شیمان بوونەوەکەی پێوە دیارە و ڕەتی کردەوە و ڕایەکەی یەکەمی

خۆی هەڵوە شاندەوە، وە هە شیانە وای دەربڕیوە وەکو (ابو ا سحاق الحوینی) کە بوختانە

پێی کراوە و قسەی ڕێگادانی نەکردووە.

٥-بەڵگەی بەهێز کە لەگەڵ بنچینەکانی شەرع و پێوەری (أصول الفیقە) کە تێک دەکەنەوە

هی ئەوانەیە کەوا ڕای دووەمیان هەبوو، کە ئەو کارە و بەشداریکردنە حەرامە و قەدەغەیە

و نابێ بکرێ کۆتاییەکەی بریتی دەبێ لە کوفر و شیرک کردن.

٦-ئەو کارە کراوەتە پرۆژەیەک بۆ بە دەســتهێنانی هێنانی دونیا و پارە و پوول و کۆمپانیا بە

تایبەت لەلایەن ئەوانەی پاشــگری ئیســلامییان بەخۆیانەوە لکاندووە بازرگانی پێوە دەکەن

و پێوە دەکرێت، جا چاک دەزانن هیچێک لە قســە و بەڵگەکانیان ئەوە ناهێنێ و دروســت

نییە بۆ ئەوەی ئەو بەشـــدارییە بکرێت، بەڵام ئەوان بازاڕی خۆیانی پێ خۆش دەکەن و

خەڵکی پێ چەواشــە دەکەن، هەر لە خۆڕایی قســە دەکەن ئەوەندە زانایە وای گوتووە ئەو ڕەئیە وایە.

ئێمە لە کۆتاییەکەیدا داوا دەکەین بەتایبەت هەر لایەنێک دەیهەوێ وە هەر بانگخوازێک دەیهەوێ کە ناوی لە خۆی نابێ بانگخواز یان هەر مێزەر بەســەر و جوبە لەبەرێک بابێ بە زەوابیتە شەرعیەکان گفتوگۆیەکی شەرعیانە بکەین، بزانین تا چەند قسەکانیان ڕاستە و بەڵگەکانیان بۆ بێنینەوە، بە مەرجە شــەرعیەکانەوە دابنیشــین دوو بە دوو لە پێناوی الله تعالی بۆ ئەوەی ڕاســتیەکان بخرێنە ڕوو، ئەگەر بەڵگەیەکی ئەوتۆیان لە دەســتە ئەگەرنا با وازبێنن لەو چەواشــەکاریانە کەوا بۆ خۆیان گومڕا بوون و خەڵکیش گومڕا بکەن پەنا بە رب العالمین.

## وصلی الله وسلم علی نبینا محمد وعلی آله وصحبه أجمعین